# زایەڵەی زرێبار

## بەرهەمە بڵاو نەکراوەکانی

# قانع

## شیعر، نوکتە، قسەی خۆش و بەشێک لە ژیان و بەسەرهاتی

کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە، لێکدانەوە و ئامادەکردنی:
ئەحمەدی ئەزیری

هەولێر ١٣٨٢-٢٠٠٣

# زایەڵەی زرێبار

«بەشی یەکەم»

لە بەرهەمە بڵاونەکراوەکانی

## قانع

شیعر، نوکتە، قسەی خۆش و بەشێک لە ژیان و بەسەرهاتی


کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە، لێکدانەوە و ئامادەکردنی:

ئەحمەدی نەزیری



هاوینی ٢٧٠٢ ـ ١٣٨٢ ـ ٢٠٠٢

نظیری، احمد، ۱۳۳۱ ـ گرد آورنده،
بەرهەمە بڵاونەکراوەکانی قانع: شیعر، نوکتە، قسەخۆشەکان و بەشێك لە ژیان و بەسەرهاتی/ کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و ئامادەکردنی، ئەحمەد نەزیری ـ سنندج: احمد نظیری، ۱۳۸۲ ـ
۲ج.: عکس.
ISBN 964-06-2625-2 (ج.۱)
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
کردی
کتابنامە.
۱. قانع، محمد، ۱۸۹۸ـ۱۹۶۵م. ـ نقد و تفسیر. ۲. شاعران کرد ـ عراق. ۳. شعر کردی ـ عراق ـ قرن ۲۰م. الف. عنوان.
PHR۳۲۵۶/س۷۱۲ق۲۶ ۸فا۹/۲۱
۱۳۸۲
کتابخانەی ملی ایران ۳۹۴ ـ ۸۲م

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: زایەڵەی زرنبار «بەرهەمە بڵاوکراوەکانی مامۆستا قانع»
کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە، لێکدانەوە و ئامادەکردنی: ئەحمەدی نەزیری
پیاچوونەوە و بژار: مامۆستا عوسمان محەممەد هەورامی
مامۆستا وریا قانع
مامۆستا فارووقی کەیخوسرەوی
کاک ئاری محەممەد ساڵح
پیتچنین و رازاندنەوەی: ڤیان کۆمپیوتەر ، سنە ۲۲۵٤٦٦۳
رازاندنەوەی رووبەرگ: کاک حەمیدرەزا زەری
رووبەرگ: مامۆستا هادی زیائەددینی
هەژمار: «۵۰۰۰» بەرگ
ناشر: ئەحمەدی نەزیری
چاپی یەکەم – هاوینی ۱۳۸۲

## پێشکەش بە بارەگای بەرز و شکۆداری ...

کرێـــــکار و جووتیـــار و رەش و رووتـــە چەوســـاوەکانی لادێ و شـاری کوردســتان، کـە چـراوکی حوجرەکانیـان هـەتا ئێـسـتا بـە روونــاکی هێـــــشتۆتەوە و بـــە نــان و دۆیـــان قانعـــەکانیان پێـــگەیاندن.

بە گیانی پاکی ئاغا سەی حەسەنی چۆری کە وەك باوکێــکی دلۆڤان، قانعی بێباوك و دایکی، گرتە ئامێــز و بە دارەدارە پێــکردنی خستیە سەر نەو رێــگایە کە بێتـــە قانع.

بە گیـانی پیرۆزی خـاتوو نـەمنەی خێـــزانی، ئـەو شـیرە ژنـە کـە باری قورسی قانعی هەلــگرت و هەرگیز نەینالــاند.

بـە رۆڵــــە قانعـەکانی کـە هـەر رۆژ هێــلانەیەکیـان لێ تێــکدەدرا وهـەروەکو گەلـە خۆشـی نـەدیو و بـێ بژێوەکـەیان، نـە تێــریان خوارد و نە تێــر نووستن.

بەو بەرێزانە کە سـروودەکانی قانعیـان لـە سـینگیاندا تۆمار کرد و فەرموودەکانیان کردنە بەرنامە و پرۆگرامی ژیانیان.

بەڕێز مامۆستا ئەحمەدی نەزیری

سڵاوێکی برایانە

کتێبەکەتم خوێندەوە پێشەکی دەستخۆشیت لێدەکەم هیوادارم
خامە بەبڕشتەکەت لەمەشە لە بیناوی ڕۆشنکردنەوەی شاعیران
وەکو پیاوانی ئەتە وەستەمدیوە کەماندا لەکار دابێت. بێگومانە
ئەم ئەرکە ماندووبوونەت لە ڕێگای زیاترناسینی قانع بەنەوەکانی
ئێستا و ئایندەمان نیشانەی دڵسۆزی و نیشتمانپەروەرییە
بۆیە کاتێ بەندەش لە ناوی دەروونمەوە سوپاسی بێ پایانی ئەو ماندوو
بوونەت دەکەم.

مامۆستای بەڕێزیش وای بەباش دەزانم ئەو نوکتانەی
قانع کە لە ناو دیوانەکە یا نوسراوە پیاوانی خۆیەتی سەر ئەم نوکتانەی
ترمیشی کە بەڕێزیان کۆتانکردووەتەوە هەر بەناوی نوکتەو بەسەر
هاتی قانع ئەگەر بۆتکرا چاپیو بڵاو بیان بکەیتەوە. لێرەدا زۆر
سڵاو و بۆتوی بەڕێز و بۆ بەکوکە سانەستوا کە لەمەکردەوە لەگەڵ وێنەمان
کەیانی شێوەی ڕێزیت پێیە هەرزە دەکەی
ئەم بەرهەمە چاپکەی لە لایەن بنەماڵەکەشمانەوە
وەک لە تە چاپکردنت پێشکەش دەکەی

دوورت
برازای بچووکت
وریا قانع

## پێسنووری سپاس و پێزانین

لە قوڵایی دڵمەوە سپاسی پێسنووری خۆم پێشکەش بەو بەڕێزانەی خوارەوە، کە هەر کامەیان بە جۆرێ بۆ ئامادەکردنی ئەم بەرهەمە و بەرهەمەکانیتر یاریدەیان دام و چی توانی پێتیان دریغیان نەکرد. لە خوای میهرەبان داوا دەکەم هەموو سەرکەوتوو بن بۆ خزمەتی چاکتر و باشتر بۆ پەرە پێدان بە ئەدەب و فەرهەنگی خۆیان.

١ـ مامۆستا عوسمان محەممەد هەورامی لە سلێمانی کە بۆ دیوانەکەی مەلاحەسەن زۆری رەنجی کێشا و بابەتی زۆری نارد و چی پێکرا دریغی نەکرد و جێگای خۆیەتی سپاسێکی تایبەتی بکەم. کە ئەم بەرهەمەش تەواو بوو، ناردمە خزمەتیان و پیاچووەوە و رێنووس و زمانی زۆریٚ لە وشەکانی گۆڕی و دایڕشتنەوە. دیسانەوە لە قووڵایی دڵمەوە سپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی ئەو بەڕێزە دەکەم.

٢ـ کاک عەتای حەوارینەسەب کە ئەرکی پیاچوونەوەی چمکێك لەم بەرهەمەی گرتە ئەستۆ، سپاسی ئەکەم.

٣ـ مامۆستا دوکتۆر ئیبراهیمی شەپۆل لە تاران.

٤ـ کاک سەی باقری هاشمی لە کرماشان.

٥ـ مامۆستا رەئووفی تەوەکولی لە تاران.

٦ـ کاک عومەر محەممەد هەورامی، کتێبفرۆش لە سلێمانی کە بۆ کۆکردنەوەی چەند بابەت لە شارەزوور زەحمەتی زۆری بۆ کێشام.

٧ـ برای دڵسۆز و لێهاتوو کە نە تەنیا بۆ من، بەڵکو بۆ هەموان زەحمەتکێشە و خۆماندوو دەکات، بەڕێز کاک دڵشاد نەزیری تەوێڵەیی، زۆر سپاسی دەکەم.

٨ـ كاك سديق و كوڕ و براكانی له سلێمانی به تایبەت كاك ئومێد عیزەدین عەبدوڵڵای برای.

٩ـ كاك هیوا عیزەدین عەبدوڵڵا له زەمانی بەعسی دژی ڕووخاوا، دوو جار به دزیەوە چووە بەغا و خۆی خستە مەترسییەوە و زەحمەتی زۆری كێشا.

١٠ـ كاك ئەنوەری مەردۆخی بەناوبانگ بە ئەنوەری مەعرووف، بەرپرسی دایرەی كاروباری كۆمەڵایەتی فەرمانداری سنە.

١١ـ كاك عەتای حەسەنزادە لە تاران.

١٢ـ كاك سەی مەهدی حسەینی، خاوەنی كارگەی فەرشی غەرب بافت لە سنە.

١٣ـ كاك ئەحمەدی حسەینی بریكاری سەرپەرستی بانكی كشاوەرزی سنە.

١٤ـ ماموستا ئیبراهیمی مەردۆخی، وەرگێڕی قورئانی پیرۆز بۆ سەر زمانی كوردی.

١٥ـ كاك سالار فاتحی، كارناسی فەرمانداریی لە سنە.

١٦ـ كاك عومەری كەریمیپوور، بەرپرسی دایرەی كشتوكاڵی سنە.

١٧ـ كاك عابید دیژبورد، نووسەر لە نووسینگەی دەفتەری ٢٤ی سنە.

١٨ـ كاك سەعدی نەزیریی بازرگان لە مەریوان.

١٩ـ كاك لەتیفی حسەینی دەرەتفێ لە مەریوان.

٢٠ـ دادە شەوگار لە سنە لە نووسینەوەی بابەتەكاندا زۆر یارمەتیدام، دەستی خۆش بێت.

٢١ـ كاك پەروێزی بابایی، كارگێڕی ڕێگەوبانی سنە.

٢٢ـ كاك سەلاحی كەریمیان سنە.

٢٣ـ دادە كەژاڵ لە سنە لە نووسینەوەی چەند بابەتدا یارمەتیدام.

٢٤ـ ماموستا عەبدوڵڵا ئێرانی لە سنە.

# پێرست

# پێشەکی

وتارێکم بۆ کۆنگرەی مامۆستا قانع کە لە شاری مەریوان بەڕێوە بـرا، ئامادە کـردبوو: بەداخـەوە بـار و دۆخ و هـەل و مەرجی نەگونجاو وایکـرد کـە کۆنگرەیەکی شیاوی کەسێتی قانع بەڕێوە نەچێ و منیش پێشکەشم نەکرد. بە باشم زانی دەستێکی تێوەردەم و هێندێ بابەتی تری لێ زیاد بکەم و لێرەدا ئاراستەی خوێنەرانی هێژای بکەم، تا لە لایەکەوە بە گوێرەی توانام ئەرکی خۆم سەبارەت بەو زانا بلیمەت و بەو نیشتمانپەروەر و دڵسۆز و بەندەی ساڵحەی خودا، بەجێبێنم، کە لە ماوەی تەمەنی پڕ لە ئازار و تەنگ و چەڵەمەی خۆیدا، نەیگوت، جگە لەوەی باوەڕی پێ بوو، نەیکرد، جگە لەوەی خێری خەڵکی تێدا بوو. لە لایەکی تریشەوە بە هۆی شارەزابوونێکی راستەوخۆم لە سەر ژیان و ئاکار و بیر و باوەڕی قانع، بە پێویستم زانی لە روانگەی خۆمەوە چەند تیشکی پرشنگدار بهاوێمە سەر هەندێك گۆشە و قوژبنی نادیار لە مێژووی ژیانی پڕ لە شانازیی و خەبات و تێکۆشانی قانع کە دژ بە هەموو خراپە و چەوسانەوەی کۆمەڵایەتی، سیاسی و نەتەوایەتیی ئەو سەردەمە بوو.

لە سەردەمێکدا کە دێوەزمەی نەھاتی و نەزانین لە ھەموو بارێکەوە باڵی بە سەر وڵاتدا کێشابوو، قانع بوێرانە و نەترسانە بە بێ‌ئەوەی گوێ بە ھەڕەشە و گوڕەشە بدات، بانگی کۆمەڵ دەکا بۆ ئەوەی لە دژ ئەو داماوی و کوێلەتیە راپەڕن. پەیامی قانع پەیامی بیدار کردنەوەیە. داخی گرانم کە ھێشتا زۆرن ئەوانەی لە ناوەرۆکی پەیامی قانع ئاگادار نین و ھەر یەك بە پێوەری خۆی شیعری قانع ھەڵدەسەنگێنێ. یەکێ بە کوردێکی تۆخی ناسیۆنالیستی دەزانێ، کە جگە لە کوردایەتی کارێکی تری نەکردبێ. یەکێکی دیکەش بە دژی سەرۆك عەشیرەت و ئاغەواتی ئەو سەردەمەی دادەنێ، ھەندێکیش بە سوسیالیست و شوێنکەوتووی برێ فیکری تری دەزانن. لەم پێشەکیەدا منیش بۆچوونی خۆم لە سەر ژیان و خەباتی قانع دەخەمە بەر دەستی ھۆگرانی ئەم کەسێتییە مەزنە و ھیوادارم توانیبێتم ھەندێ لە ھەڵەکانم راست کردبێتەوە، جا ئەوە ئێوە و ئەمەش وتارەکە:

بووین[1] و کەس رێزی لێنەنان کە ھەین

با نەبین ئەمجار ئەزانن کە بووین

ھەر کۆڕ و کۆنگرە و دانیشتنێك بە مەبەستێکی تایبەت دەگیرێت، یەکێك لە گەورەترین خێر و بەرھەمی لەم جۆرە کۆڕانە ئەوەیە، بە

---

1ـ ئاکە ھۆنراوەیەکی فارسییە، کردوومە بە کوردی (نووسەر).

بودیم و کسی پاس نمی‌داشت کە ھستیم     باشد کە نباشیم و بدانند کە بودیم

دەوری یەکدا کۆ ببینەوە و تۆی ئیلامی، منی مەریوانی، خوشکی سنەیی، برای کرماشانی، نووسەر و شاعیرێك لە تەوریز و تاران، خەمخۆر و دڵسووتاوێکی گەل لە هەر کوێی ئەم جیهانە. دڵەکان نزیکببنەوە، ببن بە یەك، بڵێین بۆ یەك، بدوێین لە دەردی یەك. مەبەستی سەرەکی تەنیا پێشکەشکردنی بابەت و نووسراوێك نەبێت. جا کێ توانی دەرمانێك بدۆزێتەوە؟ چارەی گڵدارێك بکا؟ کێ توانی دەستی مژمۆرێك بگرێت، جێگا ونبووەکەی بۆ بدۆزێتەوە؟

کێ توانی ماجوومێك بنوێنێ و ژارخواردوویەك لە ژانە سك رزگار بکات؟ کێ توانی نوسخەی حەکیمێك بۆ نەخۆشەکان لێکبداتەوە؟ کێ توانی وەها دەنگی هەڵبڕێ گوێ سەنگینەکان بیبیستن؟ با بفەرمێ رەنگبێ باوی ئەوە نەمابێ لە دوور و نزیکەوە زەحمەتی زۆر بکێشرێت، تاکو بزانرێت شیعری کێ لە چ کێش و هەوایەکدایە!

کۆڕی ئەمجارە بۆ رێز لە بیر و بۆچوونی قانعە. هیوادارم بە سینگێکی فراوان و بە دڵێکی ئاوەڵاوە گوێ بگرین، بزانین پەیامی قانع چییە؟ ئایا تەنیا بە دەست نەمنییە و ساواکی «شا»وە ناڵاندوویە؟

ئایا تەنیا باسی ناسیۆنالیستی و کوردایەتی دەکات و بەس؟ یان هاواری لە دەستی هەموو جۆرە چەوسێنەرێکە، لە دەستی

حاجییە سوودخۆرەکان، یا لەو کاسب و بازاڕیانەی کە چاویان لە ئاستی هەژارەکاندا بەستراوە، یا لە دەستی دەیان لەوانەی وا ئاکاریان فریودانی خەڵکە! چاك گوێ بگرە بۆ هاوارەکانی و بزانە چی دەڵێ. بەسەرهاتی ژیانی لێکبدەوە و بزانە چۆن ژیاوە.

گەورە پیاوان، رابەرانی راستی بە هێزی فەرموودە و کردەوەکانیانەوە کە پێیان گوتوون «سوننەتی قەولی و عەمەلی» پەیامەکانیان گەیاندوونەتە کۆمەڵ بەداخەوە زۆر گەورە پیاوی کوردمان هەن کە جگە لە نووسراوەکانیان ــــ ئەویش نیوەوناتەواو زۆربەشیان بە زمانی بێگانەن ـ ئاگامان لە ژیان و خوو و رەوشیان نییە. خۆزگە وەکو شیعرەکانی قانع کە چوونەتە زۆربەی ماڵە کوردەکان، پەیامە عەمەلیەکانیشی بڕۆیشتایە تا بمانزانیبا چۆن ژیاوە، چی کردووە، خواردن و رابواردنی، جل و بەرگ و هەڵس و کەوتی چۆن بووە، ئەوجا تێدەگەیشتین ئەم کەڵە پیاوە لە رەوشتی بەرز و کردەوەی چاکدا نموونەی زۆریش شاعیر و نووسەر هەن کە تەنیا پەیامی قەولییان هەیە. بڕوانە وتەیان و مەڕوانە بۆ کردەوەیان! بەڵام پیاوانێکی وەکو قانع، هەموو ژیان و کردەوەیان پەند و ئامۆژگاری و دەرسە، وتە و کردەوەیان یەکێکە.

قورئانی پیرۆز لە زۆربەی جێگاکاندا باسی ئیمان و باوەڕی کردووە، کردەوەی چاکیشی بە دوایدا هێناوە. ئەگەر بە تەرازووی «الَّذِينَ آمَنوا وَ عَمِلوا الصَّالِحَات»[1] قانع بکێشین، دەبینین زۆر قورسە و بڕوا و ئاکاری یەك دەگرنەوە.

ماڵە تەڕ و تاریك و سارده‌کەی لە «کاڵ»[2] بۆت باسدەکات، یان ژیانی «بەردەبەل»[3] و «قەڵبەزە»[4] بە نیوەڕۆی هاوین لە شارەزوور.

بچینە خزمەت «خاتوو نەنە» و بپرسین لە «دزلاش»[5]ەوە تا «لەنگەدێ»[6] رێکەوت یەك حەوتوو نان و پێخۆری سێ ژەمەت تەواو ببێ؟ هەرگیز توانیت دەستێ جل و بەرگی تازە و سەرپۆش و پێلاوت بە ئارەزووی خۆت ببێ؟ ئایا تۆش وەك «دادە مەعسوومی» «هەژار» هەرگیز بۆت لوا بە دڵنیاییەوە شەوێك دەست لە ملی ئازیزەکەت ـــ کە بە خاتری ئەو لای کەم ٦٩ جێگای ژیانت گوێزایەوە ـــ بنووی؟ کاتێ لە مەریوان

---

١ـ ٣٩ رعد.

٢ـ کاڵ دێیەکە لە ناوچەی مەریوان کە مامۆستا ماڵی لەوێش بووە.

٣ـ بەردەبەل دێیەکە لە بناری شارەزوور، پاڵی داوە بە سوورێنەوە

٤ـ قەڵبەزە دێیەکە لە بناری شارەزوور، پاڵی داوە بە سوورێنەوە

٥ـ دزڵاش دێیەکە لە کاتی خۆیدا لە نێوان «نێ» و «کانی سانان»دا بووە، ٧ ئاشی تێدا بووە و موڵکی بنەماڵەی قانع بووە.

٦ـ دێیەکە قانع لەوێ‌سەری ناوەتەوە.

خۆی بۆ نەگیرا لە پێنجوێن گیرسایەوە، لێی دەپرسن بۆچی ١٠ رۆژە دیار نیت؟ دەڵێ: بە خوا کەوشم نییە و دنیاش تەڕ و قوڕە و ناتوانم بێمە دەرەوە. نە ناشوکرە و نە منەت بە سەر کەسدا دەکا. لە پێنجوێن بە سواریی کەر بە بازاڕدا دەگەڕێ، لێی دەپرسن بۆ دانابەزی؟ دەڵێ: کاکە کەوشم نییە و پێم بلۆقی کردووە! ئەمانە درۆ نین، زیادە وتن نین. لەمەش زۆرتر ناتەواوی و نەداری سەری لێداوە. ئەگەر قانع دەبووە مونشی جەناب سەرهەنگی مەرزەبانی مەریوان، یا کورسی ئیدارەی بە جێ نەدەهێشت، خاتوو ئەمنە کەوای تازە و وریا رانك و چۆغەی زاخۆ و جلو بەرگی گرژاڵی لە بەر نەدەکرد؟ خواردنی چاك و ئەسپی سواری و ماشینی جوانی نەدەبوو؟

زۆر لەوانەی قانع ناناسن، پێیان وایە هەر کورد و ناسیۆنالیستێکی بەرچاوتەنگ و تەنیا بۆ کوردایەتی هاوار دەکا. بەڵام چریکەی قانع بانگەوازێك بوو لە دژی نەبوونی عەدالەتی ئیجتماعی و هاوارێك بوو لە دەستی ئەوانەی کە لە ژێر ئاڵای رەنگ و ریا و تەزویردا لەگەڵ خەڵك و خوادا درۆیان دەکرد. قانع تێگەیشتبوو. دەیزانی تەنیا ناوبردنی کورد و داوای مافی گەل لەگەڵ درۆ و خەڵەتاندن دەردێك دەوا ناکا. قانع ژیانی لەگەڵ هاوارەکەیدا و هاواری لەگەڵ کردەوەیدا یەك بوو.

هەرگیز «لِمَ تَقُولُونَ مَالاَ تَفعَلُونَ»ی لـە بیر نەدەچوو. هـاواری بـۆ چەوساوە بوو، خۆشـی وەکـو ئـەوان دەژیـا. کـە دەیگـوت نۆکـەری بێگانـە مەکـەن، خـۆی نـەیکرد. کـە دەیگـوت ریـا، درۆ و تـەزویر خراپـە، خـۆی توخنیـان نەکـەوت و کـە سـەیری بەگژاچـوون و رق و کینـەی لـە تـاغووت و چەوسـێنەران دەکـەیت، «فَمَـن یَکفـر بِالطّـاغُوتِ و یُؤمِـن بِـاللهِ فَقَـد استَمسَـكَ بِـالعُروةِ الُوثقـی»[1] دێتـە بیرت. وەکو دەڵێ:

شاپـەرەستی بـنێرە زێر پێـڵاو

دەك بە لەحنەت بێ شاه وتەختی گڵاو

یا:

قـەت لـە بیرت نـەچێ هەتا ماوی

قەسری قاجـار و بەرگـی خـوێنـاوی

کـە تەماشـای دەربـەدەری و ٦٩ جـار راگوێـزانی بـۆ شـار و گوندەکـان دەکـەیت، «فَـالذینَ هَـاجَروا و اُخـرِجُوا مِـن دیَـارِهِم»[2] دێتـە بـەر چـاوت و راسـتوێژیی قـانعت پێدەسـەلمێنێ. لـە کـاتێکدا تـەنیا تەنەکەیـەك جۆرەشـی هەیـە، دەیبەخشـێ: تـەنیا لێفەکـەی دزراوە، دەیدۆزێتـەوە و پێشکەشـی دزەکـەی دەکـا. لـە هـەمان

---

١ــ ٢٥٦ بقره.

٢ــ ١٩٥ آل عمران.

كـاتدا بـە گـژ حكوومـەتێكدا دەچـێ كـە بـە زۆرداری و زۆر وێـژی بەناوبانگە، «اشِداءُ عَلیِالكُفَار رُحَمَاءُ بَینَهم»[1] بۆ ئێمە مانا دەكا.

لـــەو كاتـــەدا خۆراگـــری و بەربـــەرەكانێی دژی چەوســـێنەران گەیشـــتووەتە لوتكـــە لـــە بەرانبـــەر خـــاوەن زۆر و زەر و تەزویرەكانەوە، هێـندە خـۆی بـە گـەورە دەزانـێ كـە لـە بـاس نایـە. خـۆی لـە «میراجـی»[2] و «قەلەبـەرد»[3] بـەرزتر دەزانـێ. «وللهِ العـزةُ و لِرَسُـولِه و للمؤمـنین»[4] دەكاتـە دروشـم. چـاوی تـیژی زۆربـەی دژواریـە كۆمەڵایەتیـەكان دەبینێ. لـە هـەمووان داوا دەكـا بـە ئـیش و كار و رەنجی خۆ بژین.

زۆروێژی بنێنە لاوە. ئەگەر پیاوی وەكو شێر بێرە مەیدان!

تەنانەت لە دەروێش ئەورەحمانی راوچی و نۆكـەری بـەر دەرگـا و جووتیـارێ كـە ئـازاری گوێدرێژەكـەی دەدا، تـا دەگاتـە شـتە پـڕ و پووچەكان و پێشێلكردنی مافی مرۆڤ، بە تایبەت مافی كچـان و ژنـانی ستەم لێكراو و بە زۆر بە شوودان و ژنبەژنكردن، پێـت وایـە «آمـرون بالمَعروف و نَاهونَ عَنِ المنكر»[5] بۆ ئەو هاتۆتە خوارێ.

---

١ــ ٢٩ ئاخری سوورەتی فەتح..

٢ــ میراجی كێوێكە لە مەریوان لە پشت دێی كانیسانان و نێ ـ وە.

٣ــ قەلەبەرد كێوێكە لە مەریوان كە دێی چۆڕ و لەلە پاڵیان پێوە داوە.

٤ــ ٨ منافقون.

٥ــ ١١ توبە.

هەر جۆرە جلوبەرگێ کە پۆشتەی کردبێتەوە و هەر جۆرە کەرەسەیەك کە بۆی دەست دابێ، کەڵکی لێوەرگرتوون، وەکو بە پێ ڕۆیشتان و بڕینی ڕێگای دوور بە سواریی گوێدرێژ و لەسەرەوە سوار بوونی پێکاب و هەر جۆرە سەیارەیەکی دیکە، یا پینە کردنی جل و کەوش، دەڵێی «و نهی النفس عن الهوی»[1] فێری خەڵك دەکا.

دەنگی زوڵاڵ و هاواری بەرز و بێترس و بێڕوودەربایی گەیشتە جێگایەك «وَ لا یَخافُونَ لَومَةَ لائم» بە کردەوە مانا دەکا. هێندە لە بیری هاوسێ و هاوماڵدایە، خۆی بە شەریکی ڕەش و ڕووت دەزانێ، دەڵێ «مَن اَصبَحَ وَ لَم یهتم بأُمُورِ المُسلمینَ فَلیسَ بِمسلم»ی کردۆتە بەرنامەی ژیانی:

سەرم ناوێ کە فیزی بەگلەر و سەرداری بنوێنێ

دەمم ناوێ کە تیکەی زل زلی تەنهایی بگلێنێ

دە ڕەببیا کەر ببێ گوێیە نەبیسێ شینی هاو خوێنی

خوا ئەو چاوە هەر کوێر بێ، کە چاو بۆ خەڵکی هەڵبێنێ

لچێ خوێنی فەقیری پێ مژن یا ڕەببی دابڕزێ

زمانێ بەد بڵێ، هێندە بماسێ خێوی خنکێنێ

بە داخەوە بە پێی بەرنامەیەك کە دنیاخۆرەکان دایان ڕشتبوو، ڕەش و ڕووتەکانیش ناچار بوون پەیڕەوی بکەن و

---

[1] ـ ٤٠، ٤١ النازعات.

شـــوێنی بکـــەون. هەرکـــەس دژی چەوســـێنەرێك هـــاواری بکردایـــە ناوی بە بێ دین و مونکیر و کافر و ...هتد، دەبرا.

لـــێی دەپرســـن ئـــەری خـــۆ تـــۆ جلـــی مەلایەتیشـــت لـــە بـــەر دایـــە و نوێـــژ دەکـــەیت، چـــۆن بـــە مونکـــیرت دەزانـــن؟ دەڵـــێ: ئەوانـــە دیـــن بـــە هـــی خۆیـــان دەزانـــن. پێـــان وایـــە بـــۆ بـــەرژەوەندیی ئـــەوان هـــاتووە. لـــە راســـتیدا مـــن خـــەریکی زیندووکردنـــەوەی بانگـــەوازەکانی قورئـــانم. قـــانع بـــە یـــەکێ لـــە ســـەرۆك عەشـــیرەکان دەڵـــێ: ئێمـــە ئەگـــەر لـــە دەســـتی بێگانـــە هـــاوار دەکـــەین، خۆمـــان لەگـــەڵ یـــەك دەبـــێ چـــاك بـــین. دەســـت لـــە ئـــازار و بێـــزاری یـــەکتر هـــەڵگرین. ئـــازار هـــەر ئـــازارە و ســـتەم هـــەر ســـتەمە. چ مـــن، چ هـــەر کەســـی دیکـــە بیکا.

تـــفی تـــۆ چاوی تەڕ کـردم براکەم
شەق و گورزت دڕانـدوویە کەواکەم
پـڕووکاوم لـــە ژێر لۆسی جـەفاتا
لەدەس تـۆ، یا لـەدەس بابـا هەڕاکەم

ئەم شیعرە بڵاو نەکراوەتەوە

دەڵـــێ رۆڵـــەکانم داب و نەریتـــەکانتان لـــە بـــیر نەچـــن: نەکـــەن خۆتـــان بگـــۆڕن: خۆتـــان بفرۆشـــن. قـــانع و قانعـــەکان هاواریـــان بـــۆ خەڵك و رەنجیان بۆ گەیشتن بە لوتکەی خۆشـبەختی هەموانە.

هەزار بەرەحمەت بێ لەگەڵ هاوەڵەکانیدا، ماوەیەك چاوی بە شەکر ناکەوێ. کە شەکرێکیان دەس کەوتووە رەش هەڵگەڕاوە و لە شەکر ناچێ: دەڵێ حەیفە بیناشین با بەش دوور زەم بکا. بۆ ئەوە زۆرتر لە کێو خۆ راگرن، ئەگەر خوالێخۆشبوو هێمن تەنیا مەنێك جۆ لە تۆوی جوتیارێك قەرز دەکا. دەسهاڕی دەست ناکەوێ بیکا بە نارد، دەیکاتە ئاو تا نەرم بێ. ئەگەر مەلا حەسەنی دزلی مەشکە کۆنێك دەجنێتە ناو دۆخەواکەی، ئەگەر موفتی توتونچی ئەو ژیانە و ئەو تۆمەتانە قەبوولدەکا و موفتی زەهاوی لە سلێمانی لە بەر برسیەتی ناتوانێ دەرس بە فەقێ بڵێتەوە و دەڕواتە بەغدا و دەیان کەسێ‌تر، هەر یەکە بە جۆرێ پێمان دەڵێن کورد گەلێکی گەورەیە پێشینەی پڕشنگدارە و گەلێکی گران و «هێقمە[1]». ئەم گەورە پیاوانە سەلماندویانە ئێمە هەین، نەمردووین و نامرین. هەتا پیاوانی وامان هەبن، نەمان روومان تێناکا. با نەخۆش و لاواز و هەژاریش بین.

وەکو ئەبولقاسمی توونسی دەڵێ:

---

١ـ هێلم وشەیەکی هەورامییە بە مانای زۆر قەوی و زۆر مەحکەم.

اذا الشـعب يومـاً ارادَ الحيـاة فلابُـدَّ أن يَسـتَجيبَ القـدَر و لابـدَّ لليل أن يـنجلي و لابـدَّ للقـيد أن ينكسـر. چارەنووسـی هـەر گـەلێك ڕێنوێنی گەورە پیاوان دەیگۆڕێ.

بـە درێژایـی مـێژوو ئیسـتعمارگەرەکان ویسـتوویانە ئـەم گـەورە پیاوانە نەبن، یان بە جۆرێ ڕازییـان کـەن کـە بێدەنگ بـن و بـە هـەر شێوەیەك خۆیان بیانەوێ ئەسپی پیلانیان تاو بدەن.

ئێسـتا سیاسـەتی جیهـان گورزێکـی قـورس و گـرانی بـە دەستەوە گرتووە.

دەیانـەوێ جگـە لـە پـیلانی گۆڕیـنی جلـو بـەرگ، هەڵسو کەوتیش بگۆڕن. وەکو دەڵێ:

**ڕۆنی سەر، سابوونی لوکس و هۆنەرەی سوور و سپی**

**بەستە بۆ تەگبیری هۆزی برسـی و بـێکاری کورد**

خـەریکن جـۆری ژیـان بگـۆڕن و لاوەکانمـان وا لێدەکـەن نـەتوانن هـاوار بکـەن و بڵـێن زلـهێزەکان چیـان لـە چەوسـاوەکان دەوێـت؟! بـە داخ و پەژارەیـەکی زۆرەوە، بـڕێ لـە ڕۆڵـەکانی ئێمـە پـەیامی گـەورە پیاوانیـان لـە بـیر خۆیـان بردوونەتـەوە و ڕوویـان کردووەتـە پیلانـە دژ بـە خەڵکیـەکان و لـە ئاکـامدا خۆیشـیان لـە بیر دەچێتەوە.

مامۆستا بیر و باوەڕی وایە، ئیمان و بڕوا چاکترین هۆکارە بۆ لا نەدان لە ڕێگەی ڕاستی و هەر وەهاش ڕوو دەکاتە منداڵەکانی دەڵێ: مەبەستان تەنیا خۆتان نەبێ. هەر دەڵێی ئەم فەرموودەیان بۆ مانا دەکا «لا يُؤمِنُ أَحَدُكُم حتى يُحِبُّ لاخِيهِ مَا يُحِبَ لنفسهِ»[1] وەکو دەڵێ:

ڕۆڵە من نەمرم لە پێشا هۆشی ئیمانت بێ

بیری هۆز و نیشتمان و ژینی کوردانت بێ

هەوڵی تەنیا خۆت نەبێ هەر هەوڵی یارانت بێ

قانع هەر باسێکی کۆمەڵایەتی دەکا، دەزانێ ئایەتێکی قورئان یا حەدیسێکی پێغەمبەر (درورد و سلاوی خوای لێبێ) مانا دەکا:

نەتبیستووە برا لە پشت برا بێ

مەگەر هەر قەزا لە لای خوا بێ

تەنیا پەنجەیەك هیچی پێ ناکرێ

کە کردت بە پێنج، کێ بەرگەی دەگرێ

«واعتصِموا بِحَبلِ اللهِ جَميعاً وَلاَ تَفَرَّقُوا»[2].

تەعەسوب لابەرن، بەزمی عەشیرەتکاری توونا کەن

بچێنن فیکری وەحدەت، بەسیەتی هەنگاوی کوێرانە

---

۱ــ «متفق‌عليه»

۱ــ ۱۰۳ آل عمران.

لە دژوارییە کۆمەڵایەتییەکان شتێك نامێنێ کە باسی نەکا و هاواری بۆ بەرز نەکاتەوە. کە روو دەکاتە بەرتیلخۆرەکان، کە بە داخەوە لە هەموو زەمانەکاندا هەر بوون، دەڵێ:

بــــرِوانە لە ئەحواڵ مودیرانی ئیداری

بۆ گرتنی بەرتیل وەکو تانجی شکاری

دانیشتووی سەر مێز و هەموو مەست و خومارن.

«لعنة الله علی الراشي و الــمرتشي»[1]. لعـن رسـول‌الله الراشـي أو الـمرتشِ والرائش. روو دەکاتە ئەوانەی وا چاکە دەکەن و داوا دەکا لە پاداشی چاکە و خراپەدا چاکە بکرێت. «هَـل جَـزاء الاحسَـان الا الاحسَان»[2]

جەزای چاکــە، بە چاکە چاکـــە کاکە

بەدیش بێ، چاکە چاکە، کاکی سەروەر

تــەمــاشـــای دنـــیا ویـــتی پـــــارەداری دەوڵـــــــەمەند

دەکـــا و بــێزی لــێدەکاتەوە و دەڵێ:

تور بەسەر ئەو پارەدارەی داری بی ناو توورکە[3]

سێبەریشی نابێ بۆ ئیسراحەتی رێبوارەکان

(بڵاو نەکراوە)

---

١ـ متفق‌علیه، نەفرەتی خوا لە بەرتیلدەر و بەرتیلخۆر ـ پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لێبێ ـ لەعنەتیکردووە لە بەرتیلدەر و بەرتیلخۆر و دەڵاڵەکەیان.

٢ـ ٦٠ الرحمن.

٣ـ بی، دارێکی بێبەرە کە لە ناو توورکا روا لیتر کەس ناتوانێ لە سێبەرەکەیدا دانیشێ.

قانع زۆر جار بۆی لواوە ببێتە بەرپرسێکی گەورە، یا مووچەخۆرێکی میری و ژیانێکی چاك و چاکەت و پانتۆڵێکی جوانی هەبێ، بەڵام لە ترسی ئەوە نەوەك نەتوانێ لەو مەقامەدا خزمەتی خەڵك بکا، خۆی لێ بواردووە و نەچووە بە قەرەیدا و دەڵێ:

چ فەرقێکی نییە لای من، گەدایی، یا خۆ پاشایی

کە هەر دوو هەر ئەمانەت بن، خەیاڵی تەختی شا ناکەم

بە رەحمەت بێ، کە ئوستادم شەوێ بۆ تەربیەم فەرمووی

ئەگەر من قانعم ناو بێ، چ بێ ئەمری خوا ناکەم

مامۆستا قانع کە دەڕوانێتە پیلانی دوژمنان، کە بە داخەوە بە درێژایی مێژوو لە لایەن خۆییەکانەوە یارمەتیان دراوە، هاوار دەکا و دەڵێ:

بە فیت و ماڵی عوسمانلی لە خوێنی ئەردەڵانیدا

سەری ئینۆکی سوور بوو لەشکری میرانی بابانم

ئەسەف دارێك ئەبێتە کلکی تەور و دارێتر ئەبڕێ

بە ئەم دەردە گرفتارە سەراسەر خاکی کوردانم

کاتێ کە دەبینێ برێ لە خەڵك بە ناوی پەیڕەوی لە تەریقەتەوە، خراپەی یەکتر دەڵێن و قینیان لە یەکترە و لە دژی یەکتر دەدوێن و تەعانەت دەگەنە جێگایەك، یەکتر بە کافر و لە دین دەرچوو دەزانێ و دەڵێ:

بــرای کــوردم کـــە خۆت نـــاو نـــا مونـــەوومر
بــزانە بــوغـــزی شـــەرعـــی مـوستەفا بــەس

قـــانع زۆر هـــاوار دەکـــا بـــۆ ئاشـــق و هێمنایـــەتی و پـــێی خۆشـــە هێـــزی جووتیـــار و کرێکـــار بکەونـــە ئـــیش بـــۆ تێرکردنی زکی هەژاران و دەڵێ:

قـەزای هـــــێزی لـەشـی جوتیـاری مانوو
لە دوو سەد تانك و تــــۆپ و بۆمبی شاران
ئەمانــە خزمەتن نەك کـــوشتـــن و چەك
هەزار لـــــەعنــەت لە کوشتـار و لە تاڵان

کـــە دێتـــە باســـی حـــەقبێژی و کـــەتمان نـــەکردن لـــە هـــیچ جێگایـــەك، لـــە بەرانبـــەر هـــیچ کەســـەوە خـــۆی نـــاگرێ و حـــەق دەڵێ:

بە دەرزی کێـوی گۆیـژەم پێ بکێـڵن
ئەوەی هاتۆتە ســەر زارم هەر نەیڵێم

«قولوا الحق ولو علی انفسکم»

## چۆن قانعم ناسی:

بنەماڵـــەی ئێمـــە بـــە هـــۆی خوێنـــشـایەتیەکی دوورەوە لەگـــەڵ بنەماڵـــەی مامۆســـتادا، ئاشـــنایی و هاتووچـــۆیان بـــوو. مامۆســـتا بـــە بـــاوکی خوالێخۆشـــبوومی دەگـــوت «مـــەولانا» و هـــەر بـــە مـــەولانا عـــەلی نـــاوی دەبـــرد. ناشـــوکری نـــەبێ بـــاوکی منـــیش لـــە گوێـــزەڵ گوێـــز و شـــوێنا و شـــوێن کـــردندا دەســـکەمێکی لـــە مامۆســـتا نـــەبوو. هەر ئەو گوێزان گوێزە بـوو بـە هـۆی ئـەوە لـە چـەند شـوێندا مـاڵی ئێمە و مامۆستا یـەك بگرنـەوە. جـا ئـەم ناسـینی بنەماڵـە و هاتووچـۆیە بوو بە هـۆی ئـەوە کـە هـەر لـە منداڵییـەوە مامۆسـتا بناسـم هێشـتا نەچـووبوومە بـەرخوێندن، وەکـو هـەندێ مـنداڵ کـە پـێش ئادرنـە خوێـندن بـرێ شـتای فێـر دەکـەن، منـیش چـەند سـوورەیەك لـە قورئـانی پـیرۆز و بـرێ شـیعری گوڵسـتانم لەبـەر بـوو. خـزم و کەسـی وامـان هـەبوو کـە لـە بیروبۆچـوونی مامۆسـتا رازی نـەبوون، ئامۆژگاریـان دەکـردم کـە هـیچ کـات نەچـمە لای مامۆسـتا قـانع و موفتـی پێـنجوێنی (توورتنچـی). نـازانم هـەر لـەم بـەرەنگاری و رێ لێگرتـەی ئـەوان بـوو یـان بـوو خـوو و خـدەی خۆشـی ئـەوان کـە بـووە هـۆی ئـەوە منـیش تـەنیا لای ئـەوانم پـێ خۆشبـێ و هـەر بـۆ لای ئەوان برۆم. لـە بیرمـە هـەر لـە مـاڵ وەدەر دەکـەوتم، دەچـوومە دوکـانی جگـەرە فرۆشـیەکەی توورتنچـی. ئـەو زەمانـە جگەرەیـەك

هەبوو قامیشیا پێدەوت، کە خۆیان تووتنیان تێدەکرد و دایاندەگرت و دەیانفرۆشت. مامۆستا توونتچی پڕ دوو قۆڵی دەکرد لە جگەرەی قامیش و من تووتنم دەکردە سەری، تا قامیشەکان پڕ دەبوون. مامۆستا بەرزیدەکردنەوە و دەیکوتانە سەر سینیەك. ئینجا سەرەکەیان دادەگیرا و ئامادە دەکران بۆفرۆشتن. بە دەم جگەرە تێکردنەوە قسەی خۆشی بۆ دەکردم و شیعری دەخوێندەوە و منیش زوو زوو سەرم دەکێشایە دەرەوە، تا بزانم ناسراوێك نایەت و ئەم دانیشتنەم لەگەڵ مامۆستادا بگێڕێتەوە بۆ ئەو خزمانە و تووشی دەردیسەرێك ببم. بیرەوەریی زۆرم لەگەڵ مامۆستا توتنچیدا هەیە... با لە باسی مامۆستا قانع دوور نەکەوینەوە:

مامۆستا قانع جێگایەکی وای نەبوو وەکو توتنچی کە هەر کات پێم خۆش بووایە بچمە لای، نەشدەکرا من وەکو منداڵێك بچمە ماڵیان و هەمیشە لە خزمەتیدا بم. بەڵام هەر کاتێك هەلێك بڕەخسایە دەچوومە خزمەتی و هەتا ماوە بوایە دادەنیشتم. بیرەوەری زۆرم هەیە لە پێنجوێن و سەیدسادق و سلێمانی. لە کاتێکدا لەگەڵ باوکمدا یەکیان دەگرت و دەکەوتنە وتووێژ، منیش زۆر بە تاسەوە گوێم بۆ دەگرتن. پارچە شیعرێکی لە ژێر ناونیشانی مەولاناعەلی بۆ باوکم نووسیوە، زۆر

جوانـە و وەڵامـی گلـەیی ئـەو خزمانـە دەداتـەوە کـە نەیاندەهێشـت هاتوچـۆی لای مامۆسـتا بکـەم، وەکـو خەزنەیـەك وایـەو پـڕە لـە ئامۆژگـاری و ڕوونکردنـەوە. بـەڵام چـونکە شـیعرەکە بـۆ بـاوکم نووسـراوە و منـیش ئـەم بابەتـەی مامۆسـتام نووسـیوە لەبـەر ئـەوەی شـوبهەیەك دروسـت نـەبێ و نەبێتـە هـۆی ڕەخنـەی هەندێ کـەس. لێرەدا شـیعرەکەم بڵاو نـەکردەوە. چـونکە لـە شـیعرەکەدا ستایشـی زۆری باوکمی کردووە و خۆشەویستیی خۆی بۆ دەربڕیوە.

ڕۆژێـك خـەریکبووم توورتـنم دەکـردە بـە دەسـتی مامۆسـتا توورتنچـی دا، مامۆسـتا قـانع هاتـە نـاو دوکانەکـە و فـەرمووی ئەمـە تۆی کوڕی مـەولانا عـەلی؟ فـەرمووی بـە موفـق: بـە خـوا ئیشـێکی زۆر خراپ و پیسـت هەیـە، ئـیش و کـاری جگـەرە لـە... خـراپترە. پارمـەتی ئیشـی خـراپ خراپـە. جـارێکی تـر پارمـەتیی موفـق نـەدەی بۆ جگەرە تێکردن. موفق هەزاری وەکو منی خنکاندووە.

جارێکی‌تر جزمێکم پـێ بـوو گوایـە لـە مـاڵ دەرکـەوتبووم بچـم بـۆ لای مەلاعـەزیزی دەنگـزل لـە پێنجوێن کـە قوتابخانـەی هـەبوو. خـۆم دزیـەوەو چـوومە دوکانەکـەی حـاجی سـەعید، کـە بـە حاجی‌سەعیدی ڕیخۆڵە بە ناو بانگ بوو.

دوکـانێکی گـەورە و پـڕ شـتی عـەتاری و جوانـی تـێدا بـوو، وەکـو کەرەسـەی کایـەی منداڵان و شـتی وا. مامۆسـتا قـانع لـەوێ

دانیشتبوو. فەرمووی: ئەحمەد گیان چیت پێ خۆشە لەم دوکانە هەڵیگرە من پارەکەی دەدەم. منیش تۆزێ خۆمم گرت و پاشان ئیشارەم کرد بۆ میدادێك، پێیان دەگوت «قەڵەمم قۆپی»، ئەگەر بە تەڕی پێت بنووسیبایە ڕەنگی دەگۆڕی و دەبووە بەنەوش.

فەرمووی: تۆ تەماشا ئەم داماوە، هەر لە ئێستاوە دیارە نانی نابێ بیخوا بە دزی خۆیەوە. ئەمیش وەکو باوك و باوای قەڵەمی هەڵبژارد کە لە بەر برسیەتی هێندە توویان خوارد تا زکیان ئاوسا. بە خوا رۆڵە تا ماوی نانت نابێ. دەبێ هەر هەناسەی سارد هەڵکێشی. بۆ شتێکت هەڵنەگرت لە ئاخردا ببیتە حاجی سەعید؟

رۆژێ لە پێنجوێن لە دوکانەکەی باوکم دانیشتبووین. مامۆستا هات بۆ هەواڵپرسی. من «جزمی‌عممە» یەکم بە دەستەوە بوو. باوکم هێلکەیەکی لە قەراخ مەنگەڵەکە دانا بوو ببرژێ. باوکم هێلکەکەی دامێ و من تەماشای جزمەکەم دەکرد و دەستم کردە خواردنی هێلکەکە. مامۆستا قانع فەرمووی لە وەختی قورئان خوێندندا نە خواردن دروستە، نە قسەکردن. جزمەکەت هەڵگرە تا هێلکەکە دەخۆیت. منیش جزمەکەم دانایە سەر عەرزەکە. خێرا فەرمووی نا مەیخە سەر عەرز، ئەوە

ئێشێکی خراپە، با فێر نەبی، بیخە شوێنێکی بەرز و بەرێزەوە هەڵیگرە.

جارێکیان مامۆستا قانع لە پێنجوێن لە دوکانی سەلیم حەڵواچی دانیشتبوو. منیش چوومە دوکانەکە و پاش چاك و چۆنی دانیشتم و خێرا خێرا پشتم دەخوراند. مامۆستا تێگەیشت پشتم شتێکیەتی. فەرمووی: ئەوە چیە بۆ ئەوەندە پشتت دەخورێنی؟ وتم: هەڵتۆقیوە. لە پشت ملمەوە کراسەکەی لادا و تەماشای کرد و وتی: ئەمە چیە؟ پیشانی خاڵۆ سەلیمی دا و وتی: بڕوانە چی لێهاتووە. ڕۆڵە ئەمە چییە؟ وتم: ئەوە دوێنێ مامۆستا مەلاعەزیز کە دەرسمان پێ دەڵێ بە شووڵی تەڕ لێداوم، ئێستا جێگە توولەکان هەموو بلۆقیان کردووە. فەرمووی: تەربیەت و دەرس بە ئەشکەنجە و ئازارەوە دەس پێبکا ئاخری بە هیچ نابێ. خێرا قەڵەمی هەڵگرت و نامەیەکی نووسی بۆ باوکم. ئەوەم لە بیرە نووسیبوی تەربیەت و تەعلیم ئەگەر بە شکەنجەوە دەست پێبکات قوتابی لە ئاخردا دەبێتە شکەنجەگەر و میرزای نووسینی ڕسووماتی ئاغا، یا دەبێتە... مەینێرە ئەو جۆرە جێگایانە با فێری لێدان و ئەشکەنجە و ئازار نەبێ. زۆر شتی نووسیبوو کە بیرم نیە و بە داخەوە کاغەزەکەش نەماوە. منیش هاتمەوە نامەکەم دا بە باوکم و ئیتر بە دەست مەلاعەزیزەوە ئەجاتم بوو. لە بیرمە جێگەی توولەکان زیاتر لە مانگێ هەر دیار بوو و هێشتا ئێشەکەشی لە بیرم نەچووەتەوە.

## کورتەیەک لە چۆنییەتی کۆکردنەوەی ئەم بەرھەمە

هەر وەك لە پێشدا وتم لـە منداڵیـیەوە پێم خۆشـبوو شـتی زۆر لـە مامۆستا قانع بزانم، جا هەر شتێکم دەبیست لە قسەخۆش و بەتامـەکانی و هەرچی لـە جۆری ژیانی بۆمیان دەگێڕایەوە، دەمنووسی یـا وەھـا لـە سینەمدا هەڵم دەگرت کە لە بیرم نەچێتەوە. نووسیـنی هەورامانناسـی وەها خەریکی کردبووم کە ئەم یادداشتانەم دانابوو بۆ دوایی، هەر چەند لە زووەوە نەخۆشی «گورچیلە» ئازاری دەدام و ژیانی لێکردبووم بـە ژاری مـار، لـەو لاشـەوە یادداشـتەکانی هەورامانناسـی، دیوانـی مـەلا ساڵحی ئەسپەرێزی، بەرهەمەکانی شـەیدا ــ مێژوونووسـی کـورد ــ بەرهەمە بڵاونەکراوەکانی مەلاخزری رواری و دۆزینـەوە و کـارکردن لە سەر چەند شاعیر و نووسەری بێناو و نیشانی تریش لەشێکی ساغ و توانایـیەکی زۆری دەویست.

بە ئەما بووم ئەم بەرهەمانە لە چوارچێوەیەکدا کە بریتیە لە ٨ بەرگی ٧٠٠ لاپەڕەیی بڵاو بکەمەوە، لـە پاشـان یادداشـتەکانی بەرهەمەکـەی مامۆستا قانع دەست تێوەردەم، هەستم کرد دوو هـێزی سـەرەکی هـانم دەدا بۆ ئەوەی کە ئەم بەرهەمە خێرا و بە زوویـی ئامـادە بکـەم بـەڵکو چاپ بکرێت، یەکـەم نەخۆشـی «دڵ»م تـووش بـوو، زۆر بـە سـەختی کەوتمە نەخۆشخانە و ــ ناچار بووم بە رازی بوون بە کاردۆژە (عەمەل) ــ ئەمیش هاتە سـەر نەخۆشـیـەکان، پـاش چـەند مـانگ کـە بـە دزی

دوکتۆر و دڵسۆزانەوە دەستم کردەوە بە ئیش و کار، چونکە مەترسیم بوو کە ئیتر ماوە نەبێ بۆ ژیان و هەتا ئێستەش ژیانم زۆر بە سەختی لەگەڵ چەند نەخۆشی‌دا درێژەی هەیە، دووەم دیم ئەوانە وا قانعیان دیوە و راستەوخۆ شتیان لێ بیستووە، یەکە یەکە خەریکن دەمرن و لەگەڵ خۆیان ئەو هەموو گەوهەرە دەبەنە ژێر خاکەوە، ناچار هەموو شتم نایە لاوە و دەستم پێکرد. ئەو دێ و شارانەی کە خۆم دەستم گەیشت رۆیشتم و هەر کەس ئەگونجا کە شتێك لە قانع بزانێ، رووم تێکرد و لە هەر کەسم دەپرسی تۆ کێ دەناسی لە قانع بزانێ، ئەگەر کەسێکی دەناسی لە هەر کوێ بوایا خۆم پێ دەگەیاند، لە مەهاباد، بانە، سەردەشت، پیرانشار، مەریوان و دێیە دوور و نزیکەکانی. لە لای مەلایەکی دانیشتووی شاری سنە و پیرێکی کوردی دانیشتووی هەمەدان و رەفیق و هاوەڵی قانع لە کرماشان و کەسێك لە پاوە و ئەویتر لە نەغەدە و جا ئیتر شار بە شار و دێ بە دێ لە زۆر جێگەدا ماڵ بە ماڵ بچۆ و بپرسە و کێ دەزانێ و دەیان کەس دەڵێن نازانین و ئەگەر کەسێك پەیدا بوو شتێکی لێ بزانێ، «دەنگ‌زدەرە[1]»کە (زەبتی

---

[1]- لە بناری شارەزوور و لە بەرێکە لە مەناڵەکانی هەورامانیدا منداڵان کە دەچوونە کێو و کێوێکیتر لە رووبەڕوویانەوە بوو هەر دەنگ و قیرەیەک دەنگی دەدایەوە جا بانگیان دەکرد: "شاخەکە، مەن بمرم یان تۆ؟ شاخەکەیش دەنگی دەدایەوە و دووپاتی دەرکردەوە و منداڵەکەش دەیوت: "شاخەکە تۆ بمری یان من؟" ئەمەش دووپات دەبووەوە، جا بەمەیان دەوت دەنگ‌زدەرە. پێیم خۆشبوو ئەم دەنگ‌زدەرەیش بۆ زەبتی سەوت بەکار بێنم. جا ئەگەر پەسەند کرا، لە جێگای دانرێ وەگەر نە هیچ.

سەوت) دەربێنە و لە بەر دەمی راگرە و ئەویش ئەگەر پێی خۆشبوو وەلام بداتەوە، چی بزانێ بۆت دەڵێ، یا دووبارەیە یا تازەیە. پاشان بژاری دەکەی، جا ئیتر بۆ کەرکووك و مووسڵ و بۆ ناوچەی قەرەداخ و بە شارباژێڕدا دێ بە دێ و لە سلێمانی وەکو ماڵ دزراوێك لەم ماڵ و ئەو ماڵ لای ئەم مەلا و ئەو مەلا و پرسین لە فلان مووچەخۆری پێشینی میری، بنێرە بۆ بەغدا و هەر کەس دەنێری بپرسە خوایا هیچی لی نەیەت، کریێ ماشین و خواردن و خەوتن و کریێ ماتڵ بوون و بۆ پارەی زەبق سەوت و باتری و ـ تەریق بوونەوە لە زەحمەتی خەڵك ـــ جا لە هەموو ناخۆشتر لە کەسێ دەپرسی دەڵێ: کاکە خەریکی چیت نەمەت بۆ چییە؟ ئەم دەنگۆدەرە چیە؟ لەم دنیەدا چی دەکەی؟ بۆ هاتووی بۆ شارەزوور؟ یا جاری وا هەیە لە کەسێ دەپرسی ئاخر قانع چەند ساڵە مردووە بۆ وازی لێ ناهێنی؟ یا زۆر کەس پێیان وایە ئەمە ئیشێکی چاکە و بە دەرامەتە، کتێبەکە دەفرۆشرێت و بڕوا ناکەن لە بەر ناسیێ بیروبۆچوونی قانعە ئەم هەمووە رەنجە قەبووڵ دەکرێت. من خۆم دەزانم هێندەم خەرج کردووە کە دەرامەتی کتێب نایهێنێتەوە. لە بیرمە شەوێك لە نەخۆشخانەی سنە لەبەر نارەحەتی پاش کاردۆژە خەوتبووم، نیوەڕۆ ئیزنیان دام بچمەوە ماڵ بۆ حەسانەوە، چووم بۆ «ولەژێر» سەر بە ناوچەی مەریوان بۆ لای کەسێك کە بیستبووم لە قانع دەزانێ. چوومە ماڵیان وتیان لە مەریوان نەهاتۆتەوە و منیش گەڕامەوە بۆ

مەریوان و بەو ناونیشانە کە دابوویان رۆیشتم، وتیان رۆیشتۆتەوە بۆ ولەژێر، شەو بوو گەڕامەوە بۆ ولەژێر، سەعاتی ١/٥ دوای نیوەشەو بوو، دووبارە لە دەرکی ماڵەکەمان دا و پرسیمان، ماڵەکە زۆر ترسان کە ئێمە بۆ هێندە هاتوچۆ دەکەین، وتیان: نەهاتۆتەوە. بەڵام چونکە خۆم ناساندبوو، بڕوایان کرد. زۆری لە سەر نەڕۆم وا رێککەوت چەند جار ولەژێر۔ مەریوانمان کرد، جا دۆزیمانەوە. ئەو شەوە چەند جار لەناو ماشینەکەدا گەیشتوومەتە حاڵێ... .

چەند جار بیستوومە لە فلان شار کەسێك لە مامۆستا دەزانێ، رۆیشتووم، کەچی کابرا شتێکی تازەی پێنەبووە یا چەند شیعرێك لە دیوانەکەی لەبەر بووە. لە لای خورماڵ و هەڵەبجە خەریك بوو لە بەین بچم. لە زۆر شوێندا لە دەنگۆدەرەکە کەوتوونەتە شك و ماتڵیان کردووم و بە زەحمەت نەجاتم بووە، جا ئەمانە جگە خەرجێکی یەکجار زۆر، زەحمەتێکی بەربلاوی بووە. زۆر شت هەیە ناتوانم بیگێڕمەوە، لەوانەیە دڵسوزەکانیش بە ئیشێکی ژیرانەی نەزانن، جا چاك وایە هەر خۆم بزانم و خوای خۆم، ئارشیوێکی نەواری دەنگۆدەرەم هەیە کە لەگەڵ ٧٨٠ کەس قسە کراوە، لە سەراسەری کوردستانی ئێران، هەر وەها تاران، لە ئەودیوی ولاتیشەوە لە بەغدا، هەولێر، دهۆك، سلێمانی و لەگەڵ ئەوانەشدا کە لە هەندەران دەژین لە هەر کوێ بووبن... هەر کوردێك لە هەر کوێ بووبێ و لە قانعی زانیبێ و پێم زانیبێ، پێوەندیم

لەگەڵ گرتووە، رەنگیی کەسانێك بە لێوە و نەزانم تێ بگەن، ئاخر ئەم هەموو زەحمەتە بۆ؟ بەم هەموو نەخۆشییەوە بۆچی لێی ناگەڕێت تا کەسێکی‌تر ئەم ئیشە بکات؟ ئازیزان من ژیانم بۆ ئەوە ئەوێ کە ئیشێکی چاکی تیا بکەم، ئەگینا ژیان چییە؟ جگە لە دەرد و ئێش. ئازیزەکان دەزانن بۆچی ئاوا سوورم لە سەر ئەم ئیشە؟ لە ٨١/٣/٣ وە هەتا ٨١/١١/٣، ٤٤ کەس لەو کەسانە کە من شتێکم لێ وەرگرتوون و لە قانعیان زانیوە، هێندە پیر بوون، مردوون. شیعری شەڕی هەورامان و مەریوان و زۆر شیعر و بەسەرهاتی ترم لە کاك عەلی نادری تۆمار کرد کە ئێستە لە بەهەشت دایە و هەر وەها شێخ مەحموود و مامۆستای سارجی و کاك حسێنی دەشتی و... ئەگەر من بیرەوەرییەکانی ئەوانم تۆمار نەکردبا دەفەوتان.

ئێستە بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە دەردەچێ، بەرگی دووەمی کە پتر لە هەزار لاپەڕە دەبێ، ئەگەر نەخۆشی وازم لێبێنێ و بتوانم رێکوپێکی کەم و بەڵگە و ساغکردنەوەیان بۆ بکەم، ئەویش دەردەچێ. جا ئەمەم بۆ ئەوە نەوت کە ئێوەی بەڕێز ماڵدوونەبوونیم پێ بڵێن یا دەستخۆشیم لێبکەن، هیچ ئافەرینم ناوێ و خراپیشم پێ بڵێن گەردنتان ئازا بێ، مەبەست ئەوە بوو کە بڵێم لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و تەحقیق، ئەرکی سەر شانی لاوەکانمانە کە وزە و توانای زۆریان هەیە و را چاکە ئەم ئەرکە گەورەیە بەئەستۆ بگرن، بۆچی دەبێ تەحقیق پیر و بە ساڵاچوور

بیکات؟ جا داخەکەم ئەو لاوانە وا ئەم ئیشەیان لێ دەوەشێتەوە و نەوێنداری خزمەتن، نە پارەیان هەیە و نە کەرەسەی پێویست و نە کەسێکیش پارمەتیان دەدات و جێگایەکیش نییە دەستیان بگرێ و پارمەتییان بدا تا ئەم ئەرکە پیرۆزە لە ئەستۆ بگرن. ئاخر زۆر جێگای داخە قازی عەبدوڵلای شەیدا ٨٠ کتێبی چاکی بووە کە من ناوی چەند کتێبێکی دەزانم، لەوانە مێژووی شارەزووره کە دووهەزار لاپەڕە بووە و مێژووی هەورامان ١٥٠٠ لاپەڕە کە زۆربەی نووسراوەکان لە شەڕێکدا سووتاون و هەرچی ماوەتەوە لە مزگەوتەکەی «تووتمەر»دا لەم ئاخرەدا مەلا ساڵح ناوێك لە چەند گونیەدا بردوویە، خستوویەتە زاخێکەوە، با گوناح نەبێت. ئەگەر دڵسۆزێك پێش ئەم کارەساتە ئەم ئیشەی بکردبا، دەزانی ئێستە ئێمە چیمان دەبوو و دەیان نموونەی تر کە لێرەدا ناگونجێ بنووسرێت. جا ئازیزان هەقم بدەنێ کە بۆ قانع و مەلاحەسەن و مەلاساڵح و قازی عەبدوڵلا و مەلاخزر و مەلا رەسووڵ و... ئاوەها خۆ ماندوو دەکەم، گوێ بە نەخۆشی نادەم، بڕوات بێ یا خەوی نیوەبێهۆشیم لێکەوتووە بە دەم دەردەوە یا خەریکی ئیش و کارم، جا لاوە ئازیزەکان ئێوە تەمەنتان هەروا بە فیڕۆ مەدەن، ئیشی بەکەڵك بکەن، بەتاڵی خەسارە. با وەکو ئێمە لە پیری دا خەفەتی رابردوو نەخۆن و نەیێتە داخ بە سەر دڵتانەوە کە بۆچی تا دەمتوانی و نەمکرد. ئازیزان تەنیا خۆشەویستیم هەیە و لە

کەسیٚ داوای یارمەتی ماڵیم نەکردووە و هیچی کەســم نەریســتووە و زۆر پێشنیارم پێکراوە کە یارمەتی وەرگرم، شوکر بۆ خوا تاقە قەرانێکم لە کەس وەرنەگرتووە و وەریش ناگرم، واتە نەکریٚ لە پەنای نیش و کاری رۆژانەدا بۆ ژیان ئیشێکی کۆمەڵایەتیش بکرێت. جا بۆیە ئەمانـەم وت کە دەتوانی تۆش بـە لێبوردوویی خـۆت ئیشـێکی وا بکـەی کـە پاشەرۆژ ئاخ و ئۆفت نەبیٚ، ئەمانەی کە وتم نە منەت لە سـەر کەســە و نە خۆشم بە خەڵەتاو دەزانم. پێم وایە لە ماڵی دە قات و ماشینی چاك و مووچـە و مـەزرا و پـوولٚ و پـارە چـاکترە. ئەمـە سـەرمایەیە، ئەمـە دەوڵەمەندیە، ئاخر قانع هیچی نەبوو، بۆیە هێندە دەوڵەمەند بوو.

لە خوای گەورە داوا دەکەم هەموومان شاگردی قـانع بـین، لـەگـەڵ قانعدا زیندوومان کەنەوە، لەگەڵ قانعدا بچینە لای خودای گەورە.

# قانع و مامۆستا شێرکۆ بێکەس

لـــە رۆژی ٢٠٠٣/٣/٣ لـــە دیدارێکـــدا لەگەڵ مامۆستا شێرکۆ بێکەس لە سلێمانی، ئـەم بەرهەمەم دایە خزمەتی و داوام لێکـرد بـیرورای خـۆی سـەبارەت بـە مامۆسـتا قـانع دەربـبڕی، بـەڕێزیان گـەورەیی زۆریـان نوانـد و کاغـەزێکی لەسـەر مێزەکـەی هەڵگرت و ئەم شیعرەی خوارەوەی بە خەتی خۆی نووسی و فەرمووی من ئەمەم بـۆ قـانع هەیـە. منـیش پـێم خۆشـبوو دەسـخەتەکەی بکەمـە رووبەرگی دووەمی بەرهەمەکە. ئەمەش دەقی شیعرەکە.

## قانع

ئەو مێوژەی<br>
کە گوندێکی شیعر ئەما<br>
لێی نەخوات و<br>
کەچی خۆشیی<br>
بە دەمی تاڵ<br>
ماڵئاوایی لە مێوژ و<br>
لە ئێمە کرد.

شێرکۆ بێکەس

سلێمانی ٢٠٠٣/٣/٣

# مامۆستا قانع لە روانگەی
# ‹ پرۆفسۆر دوکتۆر عیززەدین مستەفا رەسوڵەوە ›

یەکەم جار کە قانعم بینی ساڵی ١٩٤٦ی زایینی، یا ١٣٢٥ی کۆچی بوو. سەیرانێکی فەقێیانی سلێمانی بوو. من فەقێ نەبووم بەڵام تەڵەبەی قوتابخانە بووم، بەھائەدین نووری خۆمان فەقێ بوو. ئەو وەختە کۆمۆنیستیش بوو. سەید تاھیری حەمینیش بوو. لەو سەیرانەدا قانعیشیان لەگەڵ بوو، ئیتر شیعر خوێندنەوە بوو. دوایی لێمان پرسی: باشە ئەم شیعرانە بۆ کەم بڵاو نەکەیەوە؟ ـ لە گەلاوێژدا بڵاوی نەکردنەوە ــ گوتی: گەلاوێژ بۆ منی بڵاو ناکەنەوە، ئەمجارە کاغەزێکم بۆ نووسیون دەڵێم سێچوار دوکانم کڕیوە و حەمامێکم بە ئیجارە گرتووە و ... گوایە دەوڵەمەند بووە، تا شیعری بڵاو کەنەوە.

جا من لە وتارێکدا نووسیومە دەڵێم سەرمایەداری لە چاو قانعدا لەو سنوورەدایە.

ساڵی ٦٧ میان ناردە کونفرانسێکی حیزبی شیووعی لە شارەزوور. مەلا مارفی گامێش تەپە کە شیووعی بوو کەوتە سکاڵا لە وەزعی خۆی و هێرش بۆ سەر حیزب و ئەحمەدکەریم، گوتی لەگەڵ من زۆر خراپ بوون و تەهیدیان کردووم بۆ عەمارە، پارەتی خۆم و منداڵمیان نەداوە قانع نەبوایە لە برسا ئەمردم. وتم: مردووت مری یەکێك قانع لە برسیەتی نەجاتی بدا ئەبێ چی بێ؟

هیممەت و دڵ و دەروونی قانع

بە سەر ئەو هەموو نەداری و دەستکورتییەدا قانع هەرگیز ملکەچی خاوەن پارە و دەسەڵات نەبووە و ئەوەی بە حەقی زانیبێ گوتوویە و قسەی لە کەس نەخواردۆتەوە، بۆ دابینکردنی ژیانی خۆی جگە لە کار و زەحمەتی خۆی چاوەڕوانی یارمەتی هیچکەس نەبوو.

لە مەلایەتییەوە بگرە تا موعەلیمی و ئاشەوانی و... کردووە. هیچ کارێکی بۆ نەچووەتە سەر، چونکە بۆ پاراستنی کار و قازانجی خۆی حەقی نەکردووە بە ناحەق. لەگەڵ بیر و باوەڕی پووچ و خورافات دژایەتی کردووە و لە سەر ئەم بیر و باوەڕە پێشکەوتنخوازانەی چەرمەسەرەی زۆری دیوە.

مــن نەمبیســتووە قــانع کۆمۆنیســت بــێ. قــانع قــەت شــیوعی نــەبووە. بــەڵام ئــەم دیوانــەی دوایــی، پاشمەرگــە، زۆری تێدایــە لــە ســەر سۆســیالیزم و چــینی کرێکــار ــــ و ئەوانــە هــەژاری رەحمــەتی ئــەیوت ــــ ئەوانــە درۆیــە هــەمووی بۆیــان دروســتکردووە. ئــەیوت هی قانع نیـە. دووریـش نییـە چـونکە لـە پێـنج دیوانەکـەی یەکـەمیدا ئـەو بۆنـەی تـێدا نییـە. بـەڵام چـیـە؟ قـانع دەنگـی جووتیـارە، هـی هەژارانـە، هـی بێنانیـە، هـی فەقیریـە، ئەوانـە کـە ژیـانی خۆیـەتی، ژیـانی نـەبوونی خۆیـەتی. ئـەو وەختـە ئـەو قسـانە کۆمۆنیسـت ئـەیانکردن. بیرەکـان بـیری کۆمۆنیسـتانەیە، بـەڵام قـەت نەمبیسـتووە پەیوەندیی بووبێ. هـەژار زۆر شـتی قـانعی لـە بـیر بـوو، باسـی قـانعی دەکرد کە شـیعری لـە نـاو خـەڵکدا بـڵاوە. قـانع و جگـەرخوێن لـە هـەموو شـاعیری کـورد زیـاتر شـیعریان بـڵاوە لـە نـاو فـەلاح و خـەڵکی کـورد دا. لـە کوردسـتانی تورکیـا و سـووریا و ئەوانـە شیعری جگەرخوێنیان هەموو لە بەرە.

شـتێك بڵـێم نووسیویشـمە، لـە شـوێنێکدا جگـەرخوێن و قـانع و هـەژار کـە شـیعری کوردایـەتی دەڵـێن، سـۆزێکی شـیعرە کلاسیکیەکەی تێدایە.

ئــەی وەتەن پاییز بە خێر بێ چونکە ئێستا باوەمە

گەرم و ساردیی فەسڵـەکەت هەر وەك دڵەی شێواوەمە

بەڵام کە دێتە سەر شیعری رۆژانە:

بــرا وا بــاوکــمان رۆیی بــە رەحــمەت

بـا نــەجاتی بـیّ لـــە دەرد و زەحـمەت

ئەبیّ بە شیعری ساکاری خەڵق، هەژاریش وایە:

کوردێکـــــم ئەویّ چـــابــك و پتـــەو

ســــەفــــەرێك هــەیە بۆم بکا بە شەو

ئــەم شــیعرانە ئــەڵیّ. کەچـی دێتــە ســر ئــەوی‌تـری ئــەبیّ

شیعری رۆژانەیە:

جـاش هـــەر ئـەو جـاش، کـوڕی کـەری

بـــە کـــلك و گـــویّ بـــارە بـــەری

ئـــەوە شـــیعر نیـــە. بـــەڵام ئەوانـــەی کوردایەتیـــەکانی

هەژار، بەشێکی زۆر لە بەرەو موکریانی شیعرە.

جگەرخوێن لە پڕ تەماشا ئەکەی لە کەناری چەمی ئامێر:

روونــە ســـەرگـــەردان ئـــەی دڵ

چـــــاوی خۆڵەکە بنێرە وەلاتی کوردان

لە کەناری ئامێر چەڵانە چەند سیّ پیّ (سێدارە)

بـــــوڵتان کردیـــە جونـــدی زازان

دەبـــــگری و نـــــاڵە بێژە ئەی دڵ

کەچی لە پڕ دەڵیّ:

بەگ خوێندیە ئەفەندیە حقۆق و لیسانـس بردییە

نەخوێندییە نە چەندییە مەحسووڵی گوندان زڕییە

ئەمە شیعر نییە هەر کەسێکیان شیعری کوردایەتی و هێنەکەیان سۆزێکی تیایە. کە دێتە سەر شێ ڕۆژانە، کە بۆ خەڵکە و بۆ فەلاحە لە بەر ئەوە قانع لە ناوچەی ئێمە و جگەرخوێن لەولا لە هەموو کەس مەشهوورترن. لە مەریوان و کەناری شارەزوور فەلاح و جووتیار لە بەریانە، هەی ئەوەیە دەردی دڵی ئەوان دەڵێ و ساکاریشە. بە زمانێکیشە کە ئەوان تێی بگەن تەنانەت ڕەنگە کێشێکیش بێ کە ئەوان تێی بگەن. بەڵام ئەمەی کوردایەتییە کە:

ڕۆڵە وەسیەتبێ کە مردم سەیری ئەم ئەشعارە کەن

حەفتەی جارێ تەماشای شۆڕی ئەم گوفتارە کەن

بابی خۆت ڕەفتاری چۆن بوو تۆش هەر ئەم ڕەفتارەکە

ڕوو لە قازانجی عموومی و پشت لە خاوەن پارەکە

قەفقەفەی حەڵقەی کەلەبچە هەڵبڕە وەك پاڵەوان

ڕووکەرە قەندیل و ئاگۆ هەر بڵێ یا نیشتمان

ئەمە لە شیعری بابەتی حەمدی و ئەوانە دەچێ. کەچی ئەوانی دیکەی شیعری سادە و ساکارن. بەڵام خۆی هەستی بە هەموو شتێکی خەڵکەکە کردووە، ئەو ژیانەش سەیرە: کابرایەك

موعەلیمبــــێ لــە مەکــتەب پــاش ئــەوە بــێ بــە پۆلــیس، بــێ بــە ئاشەوان، ئەمە لە ژیانی کێدا هەیە؟

شتێك بگێڕمەوە:

هــەزار وتــی لــە کــەرکووك بووبــن: شــوکر مــــستەفا، زەبــیحی، حەســەنی قــزلجی، عــەبدوڵا شــەریفێکی مــەهابادی، وتــی لــە پــڕ قــانع پــەیدا بــوو. وتــبووی ئیشــێك، کــارێك؟ وتبوویـــان قـــانع لـــەوە عەرەبانەیەکمان هەیە تــەنیا بۆلــبرینگی بــۆ پــەیدا کــە، لــێی دەخــوڕی شتت بۆ دادەنێین بچۆ بیفرۆشە. ژیانی قانع ئاوەها بووە.

# مامۆستا قانع لە روانگەی مامۆستا وریای کوڕیەوە

ـــ باوکی من هەرگیز رۆژێک لە رۆژان تەنیا سەعاتێکیش شیوعی نەبووە. بەڵام لە بەر ئەوەی کە ئەفکارێکی تەقەددومی (پێشکەوتنخوازانە)ی بووە، باوەڕی بە شتی خورافی نەبووە دژی زوڵم و زۆرداری و ئاغاوات و دەرەبەگایەتی بووە بیر و باوەڕی خۆیشی بە ناو خەڵکدا بڵاو کردۆتەوە و خەڵکی وشیار کردۆتەوە، دوژمنانی میللەتەکە، ئاغاوات و ئەوانەی کە مەساڵحیان لەو درۆ و دەلەسەدانەدا بووە. ئەوانە بە شیوعی شیوعی کەوتوونەتە شوێنی قانع بۆ ئەوەی خەڵکی لێ بتەکێنەوە. ئەگینا ئەگەر قانع شیوعی بوایە لە وەسیەتێکدا کە بۆ ئێمەی دەکا لە پێش هەموو شتێکدا دەڵێ:

**رۆڵە من ئەمرم لە پێشا هۆشی ئیمانت ببێ**

**بیری هۆز و نیشتمان و ژینی کوردانت ببێ**

ئەگەر شیوعی بوایە بە لای ئیماندا نەدەچوو، لە پێش هەموو شتێکدا کە وەسیەتەکەی دەکا دەڵێ ئاگات

لــە دینەکــەت بــێ. لەمانــە هــەموو بەڵگــەن بــۆ ئــەوە قــانع ئــەو هەموو شیعرە ئاینیانەی هەیە.

یــا نــاوی خــوا لــە شــیعرەکانیدا، بــە هــەر بیانوویــەك نــاوی خوای بردووە.

بــەڵێ، ئــەو هــەموو شــتانە کــە مەســایلی ئــایین زۆر لــە شیعردا بەکار هێناوە. بۆ وێنە دەڵێ:

لە بیرم دێ ئەیا واعیز ئەعەم بووی رۆژی ئیستیفهام

منم قــالو بەلاوبرد و کــەچی تۆ پێم ئەڵێی باتڵ

لێرەدا روو دەکاتە مەلایەك لەوانە کە بە قانعی وتبوو کافر. دەڵێ لـە بیرم دێ کە ئەو رۆژە لە شارستانی ئەزەلدا کە خوا هاتە ناو رۆحەکان و فەرمووی: «اَلَسْتُ بِرَبِّکُم؟» هەرچی وتی نەعەم کافرە، هەرچی وتی بەلا ئیسلامە. جا دەڵێ لەو رۆژەدا من بووم کە وتم بەلا، تۆ نەعەم بووی کەچی تۆ بە من دەڵێی کافر، لە ناو شیعرەکانیدا ئەو شتانەی زۆرن.

من و تۆ پێکەوە وەستا بووین لە شارستانی ئەزەلدا

وەکو دوێ بێ لە پێش چاوم وەهایە مەسئەلەی قابیل

لــە یادمــە رۆژێــك لەگــەڵ بــاوکمدا چــووینە مــاڵی مەلایــەکی خــزمی خۆمــان لــە شــارەزوور، خــەڵکی ئــاوایی کــە زانیــان قــانع هاتووە و لــە مــاڵی مامۆســتایە، هــاتن و لێــان کــۆ بوونــەوە. یــەکێك

لەو خەڵکە لە مامۆستای پرسی: ئەریٚ مامۆستا تۆ خوا راستمان پیٚ بڵیٚ مەکتەب باشە، یا خراپە؟ منیش لەو کاتەدا منداڵ بووم، مەلا بەو خەڵکەی وت: وەڵاھی کاکە قانع دانیشتووە لەگینا راستیم دەوت. باوکیشم زۆر عەجایب ما. بە سەرسوورمانێکەوە وتی: وەڵا مامۆستا چی دەزانی لە بارەی مەکتەبەوە بەم خەڵکەی بڵیٚ. پێیان بڵیٚ، بۆ ناڵێی؟ وتی: عاجز نابی؟ وتی: نا، بۆ عاجز دەبم؟[1] وتی: دەبا پێتان بڵێم ئەگەر زەلامێك هەر دوو چاوی بەستیٚ و هەر دوو گوێی باخنیٚ، ئەگەر مەکتەبێك دوو دەرگای تێدا بێت لەم دەرگایانەوە بچێتە ژوور و بەو دەرگاکەیاندا دەرچێت کافری موتڵەقە و ژن وماڵەکەی حەڵاڵە.»

ئەمە عەقڵیەتی خەڵك بوو، دیارە باوکم نا لەمەی ئەدا دەیوت بابە ئەمە درۆیە. ئەمە وا نییە. مەکتەب مایەی پێشکەوتنە، مەکتەب مایەی سەربەرزییە.

هەشت نۆ ساڵێك دوای ئەوە عومەر عەلی هاتە سلێمانی مەلاکانی کرد بە موحازر لە مەکتەبەکاندا، عەینەن ئەو مەلایە کە ئەوەی وت بە قانع لە مەکتەبەکەدا بوو بە موحازر. قانع لە لەم جۆرە شتانەی وتووە ئەم جۆرە شتانەی بە خەڵك راگەیاندووە. گوتوویە مەچنە لای ئەوان، ئەوانە درۆزنن، ئەوانە دەستبڕن،

---

1- لە بەر ئەوە باوکم وەختیٚ خۆی موعەلیم بووە.

ئەوانە راست ناکەن، مەسەلەحەتی نێوەیان ناوێ، تاکەی ئێوە لەو وەزعیەتەدا بن. ئەوانەش لە مەساڵحیان لە مانەوەی بێعەقڵیی خەڵکدا بوو، شیوعی شیوعی، ئەکەوتنە شوێن قانع.

ماڵمان لە «بناوەسووتە» بوو، «کامەران موکری»ی شاعیر رایکردبوو و لە پێنجوێن بوو، حەفتەی جارێك دوو جار دەهات شەو لە ماڵی ئێمە دەمایەوە. شەوێکیان هەروا دانیشتبووین هەتاوەکو درەنگانێك لەگەڵ باوکم هەروا باسی کورد و مەسەلەی کورد و سیاسەت و ئەمانەیان دەکرد. لە دواییدا خەریکبووین دەخەوتین، وتی: وەڵڵا باشبوو، مامۆستا بۆم دەرکەوت کە جەنابیشت سەر بە حیزبەکەی ئێمەی. باوکیشم پێکەنی و وتی: وەڵاهی دیارە لە ئێوارەوە ئەو قسانەی بۆت دەکەم لێی نەگەیشتووی، من وام نەوتووە. وتم حیزبەکەی ئێوە سەر بە منە.

## مامۆستا قانع لە روانگەی

## مامۆستا موهەندیس فاروقی کە یخوسرەوییەوە:

چ دەتوانم بڵێم کە شیاوی کەسێتی قانع بێ. لە بەرانبەر رێز و گەورەیی قانعدا جگە لە خۆ بە بچووک زانین چیم لە دەست دێ.

ئەو شانازیەم دەستەکەوتووە کە لە نزیکەوە بە خزمەتی بگەم و بیرەوەریەکی لێ بگێڕمەوە، ئەوەندە نەبێ کە لە سەرەتای ژیانی منداڵیمەوە تەنیا شیعری قانع بوو لەم و لەوم دەبیست و لە نێو کۆمەڵی کوردەواریدا نەك هەر لە حوجرەی فەقێکان کە ئەنجومەنی ئەدەبی ئەو سەردەمە و کانی زانست و هونەر و باس و دەمەتەقێی ئەدەبی بوو، بەڵکو لە نێو فەلا و جووتیار خەڵکی ئاسایی گوندەکانی کوردستاندا دەماودەم دەگەڕا و ئەم بۆ ئەوی دەخوێندەوە و هەموو کەس بە خوێندنەوە و بە بیستنی کەیفخۆش و دڵشاد دەبوون و دەرسیان لێ وەر دەگرت. نەك هەر زانا و خوێندەوار، بەڵکو نەخوێندەواریش بەرەو پیری دەچوون.

بیری پێشکەوتنخوازانەی قانع لە ڕۆژگاری خۆی زۆر لە پێشتر بوو، ئەوەی ئەو لە سەردەمی ژیانی خۆیدا باسیدەکرد و بە کۆمەڵی ڕادەگەیاند. بەرەکانی دواتریشی بەرەو خەبات و تێکۆشان هانداوە و ئێستاش لە دوای دەیان ساڵ ڕووناکیبەخشی ڕێگای کۆمەڵە.

ئەو نەزمە نالەبارەی کە جیاوازیی چینایەتی و حکوومەتی پاشایەتی دایانمەزراندبوو و کۆنەپەرستیش بۆ سەقامگرتنی زیاتری هەوڵیدەدا، بە لای زۆربەی خەڵکەوە شتێك نەبوو بەرەو فەوتان بڕوا. هەژار گوتەنی دەگوترا:

هەر کەس بیرگا لە زمانی دەمرێ بە بێ ئیمانی

پلەی فەرهەنگ و تێگەیشتنی خەڵك لە ڕادەیەکدا نەبوو کە بتوانێ بەرەنگاری ئەم نەزمە بێ و تەنانەت بیریشی لێ بکاتەوە. بەڵام شیعری قانع ئەم بەحرە مەند و نارامەی دەشڵەقاند و شەپۆلی ڕق و بێزاری کۆمەڵانی خەڵکی دەخستە ڕێ. هەر چەند فیکری قانع لە زەمانی خۆی و تەنانەت ئێستاش زۆر لە پێشتر بوو، بەڵام ئەوەندە لە حاڵ و ژیانی خەڵك نزیك بوو کەس بۆنی نامۆیی لێ نەدەکرد. کاتێ لە زمانی کۆترێکەوە ڕوو دەکاتە ڕاوچی و بە بێپەروا پێی دەڵێ ئەوەی دەبێ بیڵێ،

دەرسی بەربەرەکانیّ و راوەستان فێری خەڵك دەکا و بە زۆرداریش رادەگەیەنیّ کە:

| | |
|---|---|
| ئەگەر خاوەن حەیا بی | لە دنیا تاکو ما بی |
| ناچی بە گژ هەژارا | تفەنگ ناخەی بە دلرا |

بەربەرەکانێ قانع لەگەڵ زاڵم و زۆردارا لە چوارچێوەی فیکر و شیعر و شیعاردا زیندانی نەکراوە، بە کردەوە و لە هەموو بوارێکی ژیانیدا درێژەی بووە. هیچ کاتێك بۆ پاراستنی قازانج و ئاسایشی خۆی و منداڵی پاشگەز نەبووەتەوە، ئەوەیە لە سەر هیچ کارێك سەقامی نەگرتووە و ژیانێکی پڕ لە ئازار و ئەشکەنجە و چەرمەسەرەی رابواردووە، بە بێئەوەی ترس بە سەریدا زاڵبیّ.

گەرچی دوژمن وا دەزانیّ من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانیّ کونجی زیندانم قوتابخانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە
قوڕ بە سەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە

قانع نەك هەر بەرەو رووی زوڵم و زۆری کۆمەڵایەتی و نەزمی دەرەبەگایەتی و پاشایەتی بووەتەوە، بەڵکو دەستە و یەخەی شەڕێکی قورس لەگەڵ خورافەپەرستی و بیروشکەکان و ئەو بە رواڵەت دیندارانەش بووە کە بە جێگای ئاینی بزووتنەوە

و گۆڕانکاری، رواڵەتێکی تەسلیمخوازانە و بێجم و جووڵیان لە ئیسلام نیشاندەدا.

بە کوفری تێمەگەن ئەشعاری وردم

هەمووی پەند و دوڕ و مەرجانە بۆتان

لایەنێکی ئاشکراتری بیر و باوەڕی قانع نیشتمانپەروەری و کوردایەتییەکی کەم وێنە بوو، کە سەرانسەری وجوودی داگرتبوو. راستبێژی و حەقخوازی بووبووە هۆی ئاوارەیی و هەڵوەدا بوونی لەم دێ بۆ ئەو دێ، لەم شار بۆ ئەو شار و لەم دیوی سنوورەوە بۆ ئەو دیوی سنوور. لەم گەشت و گەڕانە ئیجبارییەدا هەستی بە ستەمی نەتەوایەتیی میللەتەکەی کردبوو. بەو باوەڕەش گەیشتبوو کە جگە لە خواست و ئیرادەی نەتەوەکەی هیچ هێز و دەسەڵاتێکی بێگانە ناتوانێ لە تەنگانە دەربێنێ و ببێتە هۆی رزگار بوونی.

ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یُغَیِّروا ما بانفسهم

بە پێچەوانەی بەشی زۆری رووناکبیرانی سەردەمی خۆی کە کۆمۆنیزم و بەرەی وڵاتانی سۆسیالیستیان بە رووگەی ئومێد و ئاواتی خۆیان دەزانی، بە پێچەوانەی ئەوانەی دوای رووخانی رژێمی پاشایەتی بەغدا و هاتنە سەرکاری عەبدولکەریم قاسم، ئەویان بە تاقە رزگاریدەری گەلی کورد ناو دەبرد.

هەرگیز دڵی بە ئەو دەسەڵاتانە نەبەست و خەباتێکی فەرهەنگی درێژخایەنی دەست پێکرد، بۆ ئەوەی کۆمەڵانی خەڵك بەرەو وشیاری و ئاگادارییەکی زیاتر هان بدا تا بۆ خۆیان بتوانن چارەسەری دەرد و ئازاری کۆمەڵی خۆیان بکەن.

هۆزی کورد تاکەی بە غەفڵەت تا بە کەی مەستن لە خەو
تا بەکەی خۆ خواردن و دوژمن بە یەك وەك هۆزی کەو
ڕۆژی ڕووناکت لە بەرچی تاریکە وەك نیوەشەو
تاوێ جاوەڕوانی ئەم بی و گاهێ خزمەتکاری ئەو

لە سەردەمێکدا کە بیری خەباتی چەکدارانە لە نێو خەڵکدا پەرەی دەگرت، قانع خەباتی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی دەست پێ‌کرد کە لە دوای دەیان ساڵ شەڕی چەکداری و لە دەستچوونی زۆر هەلی لەبار و هەزاران هاونیشتمانی بە ئەمەك تازەی کۆمەڵ دەکەوێتە سەر دروستبوونی ئەو ڕێگایە کە قانعی نیشتمانپەروەر گرتبوویە بەر.

چەکی شۆڕشگێڕی من، نووسینی بیر و باوەڕە
ڕاپەڕینە، هەڵمەتە، پڕ ئەعرەتەی کوردانەیە

قانع بەم تایبەتمەندییەوە وەك ئینسانێکی خۆنەویست و لە خۆبوردوو و وەك مەلایەکی ڕووناکبیری تێگەیشتوو کە لە شەوەزەنگی زوڵم و ئیستبداد و خورافەپەرستیدا دەردی کۆمەڵی باش ناسیوە و چارەسەرییەکەشی بە دروستی دۆزیوەتەوە، وەك خەباتگێڕێکی بێوچان کە لە هەموو هەل و دەرفەتێك بۆ ڕاگەیاندنی پەیامی خۆی کەڵك

وەردەگرێ. لە نێو کۆمەڵی ئەو سەردەمەدا ئینسانێکی ئاسایی نەبوو، ئاکار و کردەوەی قانع پەیام و ڕاگەیاندراوی قانع، هەڵسوکەوتی قانع لە هیچ بارێکەوە، تەنانەت وەك ڕووناکبیرێکی ئاسایی ئەو سەردەمەش نەبوو. ئەو تیۆری شۆڕشی کۆمەڵایەتی داڕشتبوو، بۆ خۆشی بەتەمای بۆ ئەنجامگەیاندنی ئەو تیۆرییە باسکی هەڵماڵیبوو، شتی واش لە کەس نەبینرابوو. ئەم بەزمەی قانع لە چوارچێوەی نەزمی دامەزراوی سەردەمی خۆیدا نەدەگونجا. لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا و تا ئەم دوایانەش ئاڵای شۆڕشی کۆمەڵایەتی و چینایەتی بە دەست حیزبە تازە دامەزراوەکانەوە بوو. تەنانەت بەشێ لە مەلا و کوڕەمەلا و فەقێی مزگەوتەکانیش، وێڕای باوەڕ بە دین و ئایینی پیرۆزی ئیسلام، چووبوونە نێو ڕیزەکانی ئەو حیزبانەوە، یان بە کردەوە پاڵیان پێوە دابوون. ئەوە بوو کە نەیارانی قانع ئەویان بە بێدین و شیوعی تاوانبار دەکرد و بەم چەشنە دەیانویست لە بەر چاوی خەڵکی بخەن و لە نێو کۆمەڵی خەڵکی موسڵمانی کوردستاندا بەدناوی بکەن.

زۆری ماوە کە بتوانین قانع بە تەواوی بناسێین. لە هەر قوناغێکی پێشکەوتنی کۆمەڵدا بەشێك لە کەسێتی بەرزی ئەو دەردەکەوێ. بەڵام قانع مامۆستای هەموو سەردەمێکی مێژووی وڵاتەکەمانە. ڕێگا و ڕێبازی قانع ڕێگای قورئان و ئایینی پیرۆزی ئیسلامە کە داهاتووشی وەك ڕابوردووی پڕ لە شەرەف و کەرامەت و شانازییە.

# ماموٚستا قانع لە روانگەی ماموٚستا شوكر موستەفاوە

وابوو رێككەوت لەگەڵ مام هەژاری رەحمەتی لە كەركووك یەك بگرینەوە. نوتێلی شێخ رەشیــدی پێنجوێنی،بە سینگی قــەڵای كەركـــووكەوە بـوو، كـە رووی لـە پـردێكی كۆنی «خاســە» هـەبوو ـ ئێـــتە نـەماوە ـ دوو بـە دوو لــەو نوتێلــەدا بووین. رۆژێكیـان ماموٚسـتا قـانع پـەیدا بـوو، مـن بـۆ خـۆم تـا ئـەو كاتــە قــانعم نــەدیبوو، بــەڵام بیـــستبووم شــاعیری چەوســاوەكانە و دژی چەوســـێنەر دەدوێ، هــاتبوو ماموٚســتا هــەژار ببــینێ و نەگــەر بكرێ ئیشێكی بـۆ بدۆزینـەوە، گوزەرانـی نارەحـەت بـوو لـە سـەید سادقدا دەژیا.

ماموٚســـتا هـــەژار فـــەرمووی: زۆر چـــاكە تـــۆ خـــۆت لـــە ناشـــەوانی و شـــق وا رزگـــار كـــەیت. پاشـــان بریـــار درا لـــە كـــەركووك دانیشـــێ و فـــەرمووی دەچـــمەوە مانگایـــەك و چـــەند بـــزنم هەیـــە دەیانفرۆشـــم و دەگەڕێمـــەوە. رۆیشـــت و پـــاش ماوەیـــەك پـــەیدا بـــوو، خـــۆی و ژن و منداڵـــەكانی. لـــە

پێشدا کەوتنە بیری ئەوە ئەو کوڕانە چ بکەن، یەکێکمان لە نوتێلەکە دامەزراند، زۆوریکمان لە قەلای کەرکوك بۆ گرتن، پێیم وایە چەند بۆخچەیەکیان هەبوو، چوونە ژوورەکە و مامۆستا کەوتە فیکری ئەوە چی بکا. بیرمان هاتە سەر ئەوە کە عەرەبانەیەك بۆ یەکێك لە کوڕەکانی پەیدا کەین و بۆ چاککردنی عەرەبانە نیاز بە چوار دانە بۆلبرینگ هەیە. مامۆستاش بە کەوا و سەلتەیەکی شارەزوورییانەوە، مشکی دوو رەنگ بە سەرەوە و لەقیانە لە قۆڵ لەچوونە بەر هەر دوکانێ دەپرسی بۆلبرینگ هەیە و هەر جۆر بوو پەیدامانکرد و چووین بۆ لای دارتاشێك، دروستمانکرد و بۆ لای «کاك مەجید» کە پیاوێکی چاك و خزمەتگوزارو لە بنەماڵەیەکی دڵسۆز بوو، چووین و باسەکەمان بۆ گێڕایەوە، ئەویش کە بازرگانی کەلوپەلی وردەواڵە بوو بە جوملە دەیفرۆشت، زۆری پێخۆش بوو. هەر چیمان پێویستبوو بۆی پێچاینەوە، لە سەر عەرەبانەمان خست و قەرار بوو یەکێ لە کوڕەکانی بێتە بازرگانی گەڕۆك.

رۆژێك هات و وتی: وەختی خۆی عەلائەدینی سەجادی کتێبێکی بۆ چاپکردووم، چونە ئێستە من خۆم

کتێبە بچکۆلەیەکم هەیە چاپیکەم؟ وتمان: زۆر چاکە. منیش، کە خوێندن دەستی پێکردبووەوە، دەبوا بچوومایەتەوە بەغدا. مام هەژار وتی: لەگەڵ خۆت بیبە، هەر جۆر بووە ئەو نیشە جێبەجێکەن. لای چەند کەس چووین داوای پارەمان کرد، (٥٠ــ٦٠) دینارێك پێویستبوو بۆ چاپی ئەم کتێبە. کەڵکی نەبوو. «کاك برایم»ێك بوو، خەڵکی دەوری کرماشان بوو، بووبووە رەسام، دوکانی عەکاسی هەبوو ــ کاك هەژار و کاك قزڵجیش لە لای ئەو کاریان کردبوو ــ بەم کاك برایمیان دەوت «ئەبووخەلیل»، زۆری حەز دەکرد یارمەتی بدا، روومان لە ئەو نا، ئەویش پیاوانە وتی: چەندەتان دەوی؟ وتمان: (٦٥) دینارێك پێویستە. (٦٥) دیناری دانا و وتی: ئەگەر بۆتان کرا بمدەنەوە و ئەگەر نەبوو هیچ. چووینە چاپخانەی مەعاریف، لە شارعی موتەنەبی، کە کتێبی کوردیی چاپدەکرد. رێکەوتین کە (١٥٠٠) بەرگمان بەو پارەیە بۆ چاپکا، قانع وتی: باشە، چۆنی بفرۆشم؟ ئێمەش وتمان: کتێبی کوردی زۆر نیە و خەڵك دەیکڕن بە تایبەت کتێبی تۆ کە دەنگی چووساوە و هەژارانە، نووسراوی قانع دانامێنێ. بڕیارماندا

خــۆی بیــا بیفرۆشــێ، وتمــان: ئەگــەر بــیدەی بــە مەکتەبــە پارەکــەت دەخــۆن. وتــی: زۆر چــاکە. هــەزار بــەرگمان دا بــە ســەریدا و وتمــان: بــۆ ئــەوە بگاتــە دەســتی خــەڵك خــۆت زوورتــر و چــاکتر دەیگەیــەنی. کتێــــی بــرد و دوای مــانگێك هاتــەوە فرۆشــتبووی و پارەکــەمان دایــەوە بــە نوســا بــرایم. ئــەوەی کــە مـابوو، وتمــان: بــڕێکی‌تــری لــێ بفرۆشــە. وتــی: ماندوو بووم.

دووســـەد نوسخەیەکیشــمان دا بــە «بەشــیر موشــیر» ئــەویش وردە وردە دەیفرۆشـــت و هــەتا تــەواو بــوو. جــارێکی‌تــر یــەکێ لــە کتێبــەکانی کــە ئامــادەی چــاپ بــوو، دووبــارە لــە وەســتا بــرایم پارەمــان وەرگــرت. لــە بیرمــە لــە کــاتێکدا چــاپخانە وەریگــرت، وتــی ئەمــە دوو لاپــەڕەی دەبــێ سپیــێ. منــیش وتم: حەیفــە. وتــی: بــا بچــین بــۆ ئــەو چــاپخانەیە ئێســـتا شــیعرت بــۆ دەڵێــم. چــووینە چــاپخانەکە، دوو قەســیدەی زۆر چــاکی نووســی، بردمانــە چــاپخانە و ئــیتر تــەواو بــوو. زۆر لەگــەڵ قــانع بــۆ چــاپ و بــڵاوکردنــەوەی شــیعرەکانی یارمــەتیمدا و زۆریشــم حــەز دەکــرد لــەو نیشــانە. جــا ئەگــەر هــەموو باســەکان بکــەم دوور و درێــژ دەبێــت. قــانع زۆر پــیاو بــوو، زۆر قــەخۆش بــوو، بــە

تایبەت لە کاتێکدا کە لەگەڵ ھەزار کۆ دەبوونەوە.
جارێك پێکەوە چووین بۆ سلێمانی، منیش فەقیر و ئەویش نەدار، ناچار چووینە مزگەوت لای فەقێکان و خەڵووزیان گەشاندەوە، ئێمە تووشی سەرەگێژە و نەخۆشی بووین، ژیانی پڕ لە رەنج و کوێرەوەریی قانع سەیر و سەمەرە بوو. قانع جگە لەوەی کە بە راستی دەزانی نەیدەکرد و نەیدەگوت، مەلایەکی راست و بێدرۆ بوو، کێ دەتوانێ وەکو قانع بێت؟ مێژووی کورد شانازیدەکات بە کەسانێکی وەك قانع.

# مامۆستا قانع لە روانگەی
# مامۆستا عوسمان محەممەد هەورامییەوە:

ئـــەم نووســـراوەم ئامادە کردبوو لە کۆنگـــرەی قـــانعدا بیخوێنمـــەوە، بەداخـــەوە نـــەگونجا، کـــە «مامۆســـتا ئەحمـەد» فـەرموویان ئیشـێکی وەهـا گـەورە و گـرانی بـە دەســتەوەیە، پـێم باشــبوو کـەمێك کورتییکەمـەوەو پێشکەشـیبکەم، رێز و خۆشەویسـتیی خـۆم بـە بارەگـای بـەرز و بڵـندی ئـەو گـەورە پیـاوە و هۆگـران و قوتابیـەکانی دەر بـڕم. لــە خــوای گــەورە دەخــوازم بــرای بــەڕێز، «مامۆســتا نــەزیری» تەندروسـتیــیّ و بەرهەمی شیاو و جوانی تریشمان پێشکەشبکات.

لـــەڕیز و قـــەتارەی وابەســـتانی جیهـــانی وێـــژە و نووســـیندا، هۆزانڤانـــــان فـــــراوانترین پانتـــــایی و قـــــەوارەیان بـــــۆ خۆیـــــان دابینکـــــــردووە، ئاشـــــنایان و هـــــــەوڕازانیان زۆر زەبـــــەندەن، گەوهـــــەرەکانی دڵ و دەروون و زمانــــە رەوان و پاراوەکانیـــــان، دڵــەودڵ دەڤۆزنــەوە، ئــەم چەســپامەیە بــە شــێوەیەکی گشــتی لــە نــاو

کوردەواریـدا رەچـاو کـراوە، لـەم سەردەمەشـدا رێـز و سـەنگی شکۆدار و تایبەتی خۆی هەیە.

بـەڵێ (قـانع) زمانحـاڵی زۆربـەی خـەڵکی کوردسـتان بـوو. زۆر چـاك شـارەزای بۆچـوون و دڵ و دەروون و سروشـت چـینە جۆراوجۆرەکـانی میللەتەکـەی بـوو. بـۆ هـەر کۆڕ و دانیشـتنێك زۆر زیرەکانـە و بـە ئاسـتی پێویسـت دەدوا. لـە هـەمان کاتیشـدا وەك پـاییزەبرا دەردەکـەوت، هەمیشـە بـە تاسـەی هـەناوەوە چـاوەڕێدەکرا، هـەموو کاتـێ تامـەزرۆ و لـە بـەر دڵان بـوو. زۆرتـر رەش و رووت و چەوسـێنراوەکان هۆگـری بـوون، ئـەویش تێدەکۆشـا خـەندەی گەشـبینی پێشـکەش بـە لـێو و دەروونیـان بکات، بـە نوکتـە و قسـەی خـۆش چارەسـەری ئازاری دەکـرد. لـە توانای هیچ خامەیەکی کارامـەدا نیـە بـە تـەواوەتی مـاف هـیچ گۆشـە نیگایـەکی شـاعیرێکی مـەزنی وەك قـانعی بەهرەمـەند بـە سـەر بکاتـەوە، کـە نزیکـەی شەسـت سـاڵی رەبـەقی لـە تەمـەنی دژوار و سـەخت بـۆراژەی وشـەی پـیرۆز تـەرخانکرد، بۆیـە منـیش پێشـەکی تکـای لێـبوردن لـە رەوانـی ئـەو مەزنـە دەکـەم، کـە بـە نەوازشـەوە دەمەوێ شتێك لە بارەی (گەشبینی و پێشبینی)یەوە بڵێم ...

ئەم مرۆڤـە مەزنـە رووی لـە هـەر لایـەك بکردایـە، شـادی بـاڵی بە سـەر هـەمووناندا دەکێشـا و بـە گـەرمی پێشـوازی لێدەکـرا، هـەر

یەکە بە ناواتەوە بوو میوانی ئەو بێ، تاکو خۆشترین کات لە تەکیا بە سەر بەرێ. ئەویش بەرانبەر ئەو هەستە ناسك و بەرزە ئەوەندەیتر دەگەشایەوە و لە سەرچاوەی خۆشڕوویی و خۆشدوویی بە تام و بۆیەوە هەزار و یەك دالەی مرواری دالەقەی هەڵدەرشتن، بەم چەشنە تا ماوەیەك پلار و دەرد و بەڵای ناهەمواری دەوران فەرامۆشدەکران. هەرچی کۆڕی پادشا و ساماندارانە، لەچاو کۆڕی وەها دا کەس بە پوولێکی قەڵب نەیدەکڕین، بە تایبەتی ئەو هەموو مرۆڤە دڵپاك و سادە و ساکارانە دەورەی قانعی خۆیانناسایان دەدا. ئەویش بە شانازیی پڕ لە خەندەوە دەیگوت و دەیگوتەوە:

فەلەك بەردی بە سەرما دا، پەزیسکەی

لە تاریکی شەوی بەختم چرایە

هەتا دوری نەفیسی نیکتە خۆشبێ

مەڵێن (قانع) لە دنیادا گەدایە!

سەرپا بوونی ئەم شاعیرەمان تۆماری دێرۆك و ئەزموونی باو و باپیران و رۆژگارە، پێشبینی داهاتووە، بە هەموو رووداو و کارەسات و سەرەنجامەکانەوە، بە گشت خۆشی و ناخۆشییەوە لە مێژە ئەیاران و ناحەزانی کورد لە دەمۆڵە شەڕەی خۆیان داوە، گوایا لە هەندەران ژیان مسۆگەرە و مرۆڤ حەساوەیە ...

داخی داخانە لەم سەردەمەدا پەیتا پەیتا زۆر کەس لە زێدی خۆیان ئاوارە و بەتیارە دەبن و روو دەکەنە ئاییندەیەکی نادیار و تەمومژاوی، هەندەرانی پڕ لە تەڵەکە و داوی هەناوبڕ... وتراویشە بەرد لە جێی خۆی سەنگینە ... بۆ پێزانین و ئەمەکداریش ئەم پەندە چەسپی ناخە: هەر کەسە و بە مەرگێ وامداری نیشتمانە ...

ئەوەتا قانعی شاعیر و مامەخەمەی هەموران، بە رەوانی پڕ لە رەسەنایەتی، زۆر سەرفرازانە و سەرکەشانە، لە بێنۆگەی گەشبینیەوە روو لە هەموران دەکات و بە چریکەی زۆر ساز و لەبار و پڕ شادی، داوا دەکات بە گەشبینی بڕوانە کوردستان و نەیگۆڕنەوە بە هەموو ئەورووپای رووکەش:

منی بولبول بناڵێنم لە کوردستانەدا بۆ گوڵ
شەهادەی مەکتەبی عیشقم بە ئیمزای ئەوروپا نادەم

ئەم شاعیرە مەزنەمان هەمیشە و هەردەم و لە هەموو شوێنێك رۆڵەی ئەمەکداری یەکەمین لانکی نەخشین و زێدی پیرۆزی بووە... بەردەوام وەکو نوقڵی ترش و شیرین ناوی مەریوان لە سەر زار و لە ناخیدا بووە. بەویەڕی راستگۆیی و دیدی گەشیەوە بانگی زوڵاڵی بە سەراپا گەردووندا چڕاندووە و دوور لە ناوچەگەریەتی، مالّ رەوای بەسەر کردۆتەوە، هەر

بە وێنەی جگەرگۆشەیەك کە هۆگری ئامێزی دایکیەتی و بێ ئەو هەڵناکات و هەر (دایە، دایە)یەتی، ئەمیش بە هەمان دەستوور ئەو پەیڕەوی و نەریتەی بەر لەداوە، لە هەر کوێیەك بووبێ هاواری (مەریوان، مەریوان) لە بوون و هەستیدا بووە. دیارە گەرمترین سۆز و پێزانین و گەورەترین خۆشەویستی مرۆڤی لەمەکدار هەر بۆ نیشتمانی ئازیزیەتی. واتە لەم بوارە پیرۆزەدا شاعیرمان ماڵی تەواوی خۆیەتی بەوپەڕی بەختەوەری و شادیەوە ستایشی پڕ لە گەشبینی مەریوانی هەمیشە رازاوە بکات و لە چەند باخچەیەکی رازاوەی دیوانەکەیدا سۆزی خۆی بۆ مەریوان دەردەبڕێ.

مەریوان فیکر و هۆشم هەر بە تۆیە
دەروون رێش و سەراسیمەم لە کۆیە
ئەگەرچی پەرتەوازەی ئەم دیارەم
خەریداری (دۆڵاشی) مەرو خانم

شاعیرمان رۆڵە و موڵکی کوردە، بەو پەڕی قەریوە و گەشبینیەوە، لە ریزی پێشی پێشەوەی دڵسۆزان و ئاهەنگگێڕانی بەختەوەری و بۆنە پیرۆزەکاندا بە دڵ و بە گیان بەشدار بووە ... پێش هەموو ئەورۆزێك بە شادیەوە خۆی ئامادە کردووە و لەم بۆنە مەزنەدا خولی کاریگەر و دیاری

هەبووە، بەر لـە هـەمووان ئەنگوچـکەکەی بـەر داوەتـەوە و بـە تاسـە و شـەوقی رەوانـەوە سـەر چـرپییەکەی گـرتووە و هـانی کوردانـی داوە بەندار بن و پڕ شـانازی بـە کوردسـتانی جوان و پـڕ لـە خێـر و بێـرەوە بکـەن، دڵنیـای کـردوون ئـەو هـەموو ئـەورووپا سـەرمایەدارە پێویسـتی بـە مـیوەی هەمـە رەنـگ و بـەر و بوومـی دانسقەی دەبێ ...

وا بـەهارە، سەر کەوە، بۆ سەر ملە و ئێلاخ و گرد
ئـاوڕێکی دەوری خۆت دە و، تێ بفکرە دەستوبرد
بێنە بـەر چاوت نموونەی میوە هاتی زبر و ورد
گەر بە چاوی نیشتمانی سەیری خاکی خۆتت کرد
ئەورووپا مـوحتاجی میوەی وشکی ئاڵووالتە

ئەندێشـە و سـرووش تاقـەبژێوی شـاعیران، لـە ئـەنجامی یەکلابوونـەوەی لـە بەعەشـق ئەشـقی پـەریی خولیـایدا، بـە تـەواوی چـاوی دڵـی دەکرێتـەوە و لـە روانگـەی تایـەتی و روونییـەوە پـەی بـەو دیـوی بـوون و گـەردوون دەبـات و بۆچـوونە گـەش و رۆشـنەکانی لـە چوارچـێوەی کەسـتەکی بتـەوی دارێـژراو و نەخشـیندا بەرجەسـتە دەکـات... بۆیـە شـاعیرمان دڵنیـا بـووە، کـە ئەسپی خەیاڵی کەوتـە بـاڵ رۆژ بـە رۆژ، مـانگ بـە مـانگ، سـاڵ بـە سـاڵ هۆنراوەکـانی هـەر دەم لـە بـرەو دان، بـەو پـێو دانگـە

شەهیدایانیش بە تاسە و پەرۆشەوە پڕ وابەستەیان دەبن، ئەمیش هەمیشە ئاسوودەو شادڕەوانە...

قانعم ، ئەسپی خەیاڵم، چەندێتر سەرگەرم ئەبێ
موشتەری ئەشعارەکانم فەرنی تر بێشەرم ئەبێ

قانع وەکو مامۆستایەکی زۆر کارامە و دڵسۆز و پەروەرێن، لە گۆشەنیگای گەشەوە، بە بەڵگەی ژیانی پڕ لە ئەزموونیەوە، پێشەکی ڕێنمایی جگەرگۆشەکانی خۆی کردووە، کە دەست بدەنە کار و بە ڕەنجی شانیان بژیویان پەیدا بکەن و بە سەر بڵندی بژین ... دیارە ئیشکردن گەورەترین بەڵگەنامەی ڕێز و پایەی مرۆڤە، بۆیە لە ڕێی کورەکانیشیەوە، بە خەندەی پڕ بە تاسۆ، هەموران هاندەدات کار بکەن ... تەمەڵی و تەوەزەلی مێردەزمەی شوورەیە و نرخی مرۆڤ ناهێڵێ، بە نەمانی تەمەڵی و بێکارەیی هەموو ژین دەبێتە خەندە ...

چەن خۆشە کورم ، ئارەق بڕژێنی
لە دەشت و دەرا غیرەت بنوێنی
نانی سەپانی خۆت بە دەس بێنی
ریشەی تەمبەڵی لە بن دەر بێنی

شاعیرمان بۆ خۆی پێشڕیش، بە رووی گەشەوە، دەستپێشخەری کردووە و هەموو پەند و ئامۆژگارییەکانی بە کردەوە سەلماندوون و بەرجەستەی کردوون. خودی خۆی پێشەنگی کارکردنی پیرۆز بووە، بە رەنجی شان و دەست و بازووی زبری نانی پەیدا کردووە و چاو لە بەری کەس نەبووە، هاوڕاز و هاودەنگ و هۆگری ئاشی خۆی بووە و نەیگۆڕیوەتەوە بە تەختی شاهی. بە دڵ و دیدەی گەشەوە روانیویەتە تۆزی ئارد و ئاشەکەی، بە مەردی ژیاوە.

لە سەر لوتکەی شادی و شانازییەوە، بە سۆزی دەروونی بە کوڵی، بە بەند و هۆرە و سیاچەمانەوە چریکاندوویەتی:

لە تۆزی ئاشەدا غەرقم، لە تەوقی سەر هەتا ئەژنۆم
نەترسی ئەمری ما فەوق و نە مەحکوومی بەراتی تۆم
بەڵام جەن خۆشە ئەو تۆزە، کە هەر خۆم ئامیرم بۆ خۆم!

قانع بەداکەوتن و قانعیەکەی خۆی، سەلماندوویەتی کە هیچ ئازێکی لەم جیهانە بەرینەدا نەبووە، بە هیچ جۆرێ چارەی مرۆڤی خوازەڵۆک و دەروون نزمی نەویستووە ... ئەوەندە دەستە و دامانی دنیای بادی و بێ ئەمەك و کاتی نەبووە، ژیانی

بە گران و دژوار نەداوەتە بەر و باکی پێی نەبووە، بە راستی ئەمیە فەلسەفەی گەشبینی!

شاعیرمان بە خۆشڕووییەکەی خۆی، بە دڵی فراوان و دووربینی و لێکدانەوەی گەشەوە، یەکە و راست روانیویەتە ئەو کۆتایی و سەرەنجامەی لە توانای هیچ بوونەوەرێکدا نییە سەرەنگاری بکات و بیگۆڕێ، بۆیە بە دەربڕینێکی فەلسەفەئامێزی سۆفیانە، بۆچوونی خۆی تۆمار کردووە و بێخەم پاڵی لێداوەتەوە...

چ فەرقێکی نییە لای من، گەدایی، یا خۆ پاشایی

کە هەردووکیان ئەمانەتین، خەیاڵی تەختی شا ناکەم

شاعیرمان لەگۆڕەپانی رێنمایی و مۆچیاریدا گەلێك سوار چاکە، ئاگاداری هەموو لایەنە باش و زیانەرۆکەکانی دیرۆکە، بۆیە باش قاڵبوونی لە گشت بوارەکانی ژیاندا، بە دڵنیایی بانگەوازی دڵسۆزان ئەدابە گوێی هەمواندا، بۆ ئەوەی چەك وەلا خەن. سەرەنجامی جەنگ و وێرانکاری هەر ئاخ و داخ و سەنگکوتانە... سەردەمی ئاوەز و راوێژ و گفتوگۆی ژیرانەیە، باوی تێکۆشانی ژیاری و مەدەنییە و بە زانست و تەکنۆلۆژیای نوێ گۆی زەوی پێشدەکەوێت و هەمووان دەست لەملانێ

شادی و گەشبینی دەبن ... بۆیە قانع پێشەنگ بووە و بەر لە هەمووان بەرەوپیری زانین چووە.

قانع هەر لەگەڵ یەکەمین چاو تروورکاندنیدا، تا دوا هەناسەی ژیانی بە هیچ جۆرێ وەی بۆ کەس نەبووە. بۆ خۆی لە خۆیدا کۆتری سپی و هێمای ئاشتی بووە... ئەوەندەی لەگەڵ گەلەکەیدا، بە دەست گێژاوی جەنگ و کوشتارەوە، ئازار و برسێتی و نەخۆشی و دەربەدەریان چەشتووە، هەزاران ئەوەندە بۆ بەدیهێنانی ئاشتی تێکۆشاوە. هەر لەگەڵ بەرز کردنەوەی یەکەمین دەنگی نارەزایی و پرۆتستۆی دژ بە جەنگ و ئاژی گڵاوی رژێمی سەرمایەداریی جیهانی، ئەمیش بە هەموو توانایەوە هاوڕازی کۆترە نەشمیلەی ئاشتی سەراپا سەرزەمین بووە، دڵنیا بووە تەنیا لە سایەی ئاشتیدا مرۆڤی ئەم گەردوونە دەحەسێنەوە. بە خۆشی و ئارامی و گەشبینی ژین بە سەر دەبەن.

لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ بوار و مەیدانی بەرفراوانی ڕێژەدا بەر شاڵاوی زۆر ناهەموار کەوتووە. لە پێناو دەربڕینی ئازاد و وشەی شیرین و رەوان و کاریگەردا تووشی گەلێ پەلپەلی، دەربەدەری، گرتن و نانبڕین کراوە... لە هەمان کاتدا بە دەماخی زۆر بەرزەوە روانیویەتە ئاسۆی گەشی ئازادی و، وچانێکی پڕ لە سەرفرازی و ئاسوودەگی و هیوای نەلەخشاوی

گــرتووە. کــاتێکیش خــۆی لــە هەســت و دڵ و دەروونــی هــاوڕازانیدا بینــیوە، بــە جــۆش و خرۆشــی پــڕ لــە گەشــبینی پیرۆزەوە، بە خەندەو شــادیی ناخەوە بە بــاڵای ئــاڵو واڵای پــاکژو کاریگــەردا هــەڵیداوە. بــۆ شــکۆمەندی و ڕێــزی بــاڵای ئــەدەب و ئەدیبی پاکژ چریکاندوویەتی.

لــە دوا وێــستگەی باســەکەمدا دەڵــێم: ڕۆژانــە چــەندان ملــهوڕ و ســــەرمایەداری چارچــنۆك و پوولپەرســـت و خوازەڵــۆك لار دەبنــەوە و کەســیش ناویــان ناهێنــێ، بــەڵام ئــەوەتا شــاعیران و نووســەران و زانایــالی بــواری وشــەی ڕەســەن و پیرۆز هەمیشــە لــە وارگــەی دڵــە گەشــەکاندا و پانتــایی گــەردووندا دەدرەوشــێنەوە، پــەیام و ڕێــز و یــادی پــڕ لــە شــکۆمەندیان هــەر نــەمر و لەگــەڵ کاروانــە سەرکەشــەکەی ژیــاندان، ئــیتر هــەزار ســڵاو بــۆ گیــانی پــاك و هەمیشــە زیــندووی مامۆســتای دیــن و ئــایین و مرۆڤایــەتی و ســڵاو بۆ لە دایکبوون و مردن و زیندوو بوونەوەت.

## چەمكێك لە ژیانی مامۆستا قانع بە پێنووسی مامۆستا وریا قانع:

ئەم چەمكە لە سروەی بەرەبەیانیشدا بڵاوكراوەتەوە،

لە سەر فەرمودەی مامۆستا وریا لێرەشدا بڵاوی دەكەینەوە.

سەربردەی ژیانی قانع كە بە نازناوی «دەنگی چەوساوەكانی كوردستان» ناسراوە لە ئاوارەییەتییەوە دەست پێدەكات، لە دوای بەسەر بردنی ژیانێكی تاڵ و چوونە ناو بەندیخانەكانی عێراق و دەركردنی لە فەرمانبەرایەتی، بە دڵهێشاوی لە ساڵی ١٩٦٥ی زایینیدا لە تەمەنی ٦٧ ساڵیداماڵئاوایی لە رەش و رووتانی كوردستان و هەموو چەوساوەكانی جیهان دەكردو لە گۆڕستانی «شێخ ئەورەحمان» لە «لەنگەدێ» ئارامگەی هەمیشەیی خۆی ئاوەدانكردەوەو سەری پڕ لە سەودای نیشتمانپەروەری و ئازادیی چینە هەژارەكانی تێدا نایەوە.

ئەگەر بمانەوێت ژیانی پڕ لە نەشكەنجەی ٦٧ ساڵەی قانع بە تەواوی تۆمار بكەین، ئەمە ئەركێكی گرانە و لە سنووری وزەی ئێمەدا نییە، تەمەنێكی ٦٧ ساڵی پڕ لە ئاسۆر و دەربەدەری و خەباتی سەختی رۆشنبیركردنی هەژاران و هاندانی لاوان بۆ گەیشتنە هەوارگەی ئازادی و سەربەخۆیی و هوشیار كردنەوەیان و بەگژا چوونەوەی ناكۆكییەكانی ناو كۆمەڵی كوردەواری و هاوار كردنی ماڵ ئاوەتان لە لایەن قانعەوە بە ئاسانی لە دەروونەوە هەڵناڕژێتە سەر لاپەڕەی كاغەز و پێشكەش بە

خوێندەواران بکرێت، ٦٧ ساڵی ژیانی مرۆڤێکی خۆشی نەدیو کە هەر ساڵێکیان هەڵدەگرێت چەندین وتاری دوور و درێژی لە سەر بنووسرێت ئاسان نییە.

من لەم پێشەکییەدا هەوڵدەدەم کە تەنیا بە سەرهاتێکی کورتی ژیانی قانع و نامەیەکی کە بۆ بەڕێز شێخ محەممەدی خاڵی نووسیوە، بخەمە پێش چاوی خوێندەواران تاکو لە گۆشەیەکی تاریکی ژیانی قانع و ورەی بەرز و نەبەزیی ئەم شاعیرە ئاگادار بن، قانع لە ساڵەکانی سەرەتای چلەکاندا ماڵی لە بەرزنجە بووە، تازە لە مامۆستایی دەر کرابوو. لەو کاتەدا ئەرکی ژیانی پێنج سەر خێزانی لە ئەستۆ بوو. لە بەرە بەیانێکدا لە لایەن پۆلیسەکانی سەر بە رژێمی پاشایەتی عێراق گەمارۆی ماڵەکەی داوە و لە پاش پشکنینی ماڵەکەی گیراوە و بە کەلەپچە کراوی رەوانەی بەندیخانەی سلێمانی کراوە. لە دوای چەند رۆژێک شاعیران و نووسەرانی شاری سلێمانی هەواڵی گرتنیان بیستووە و کەوتوونەتە هەوڵدان بۆ رزگاربوونی. هەر بۆ ئەم مەبەستەش، «مامۆستا پیرەمێردی نەمر» بووەتە کەفیلی ١٠٠ دینار و (قانع)ی لە بەندیخانە هێناوەتە دەرەوە و لە شاری سلێمانی دەست بە سەر

بووە. لە پۆلیسخانەی سلێمانی دەفتەرێکی بۆ کراوەتەوە کە دەبوا هەموو ڕۆژێك لە کاتژمێری ۱۲ی نیوەڕۆدا ئەو دەفتەرە واژۆ بکات، لە لایەن شاعیران و نووسەرانی شاری سلێمانییەوە چەند ڕۆژێك دەعوەت کراوە، پاشان ژیانی کەوتۆتە ئەستۆی خۆی و ئەویش هیچ داراییەکی سکە لێدراوی شك نەبردووە. بێ ئەوەی کارێك یا مووچەیەکی بۆ تەرخان بکرێت لە شاری سلێمانی ماوەتەوە. ڕۆژگاری ڕەشی ژیانی ئەوەندەی تر ڕەش و ناهەموارتر بووە، لە لایەکەوە خەمی ژیانی ماڵ و منداڵ و لە لایەکی دیکەشەوە خەرجی ڕۆژانەی خۆی لە ناو شاردا زۆری بۆ هێناوە، ناچار چووەتە لای مامۆستا پیرەمێرد و داوای لێکردووە کە لە کەفالەتەکەی دەرچێت. کەوای گوتووە، مامۆستا پیرەمێرد لێی پرسیوە: بۆچی لە کەفالەتەکەت دەرچم؟ قانعیش لەوەرامدا وتوویەتی: «من نە مووچە و نە کارێکم هەیە خەرجی ڕۆژانەی خۆم بۆ دابین ناکرێت و سەرەڕای ئەمەش ماڵ و منداڵەکانم بەجێهێشتووە، کەسێکیان نییە نانێکیان بۆ پەیدا بکات، بۆ من چوونەوە ناو بەندیخانەکەم گەلێك لەم ئازادییەم باشترە.» مامۆستا پیرەمێرد دڵی

پێدەســووتاوەو وتوویــەتی: باشــە قــانع تــۆ ئەگــەر رابکــەیت دەتوانــی خــۆت و مــاڵ و منداڵــەکانت بــە خــێو بکــەیت؟ چــونکە تــۆ لــە ئێــران و لــە عێــراقدا قاچــاخی، لــە کــوێ دادەنیشــت؟» قــانعیش وتوویــەتی: «ئەگــەر را بکــەم دەچــمە ملکــاتی محەمــەد رەشــید خــانی بانــە.» ئــەو کاتــە محەمــەد رەشــیدخان شــاری بانــەی گــرتبوو. مامۆســتا پیرەمێــرد وتوویــەتی: «کــە وایــە تــۆ رابکــە مــن لــە نــاو خزمــەکانمدا ١٠٠ دینارەکــە کــۆ دەکەمــەوە و دەیــدەم بــە حکوومــەت. لــۆ ترســی منــت نــەبێت، مــن نــاگیرێم» قــانع ئــەم کــارەی بــە لاوە پەســەند نــەبووە و وتوویــەتی: «مــن هــەرگیز کــارێکی وەهــا ناکــەم خــۆم دەربــاز بکــەم و کەســێکی دیکــە دوچــاری دەردیســەری بکــەم. بــەڵام مامۆســتا پیرەمێــرد لــە ســەر داواکارییەکــەی ســوور بــووە، پێداگــرتووە تــا (قــانع)ی ناچــار کــردووە کــە پێشــنیارەکەی پەســەند بکــات. لــە نیوەڕۆدوایــەکی رۆژی پێــنج شــەممەدا لــە دوای واژۆ کــردنی دەفتەرەکــەی پۆلیســخانە. بــە پــا بــە چــیای گۆیــژەدا هەڵگــەراوە و ماڵئــاوایی لــە شــاری ســلێمانی کــردووە. بــەرەو ناوچــەی «شــلێر» کەوتۆتــە رێ. جوابیشــی بــۆ مــاڵ و منداڵــەکانی نــاردووەو وتوویــەتی کــەوا مــن چــووم بــۆ لای

بەڕێز محەممەد ڕەشیدخان. ئێوەش بار کەن بۆ شلێر، خێزانەکەشی باری کردووە و ڕۆیشتووەتە ناوچەی شلێر. لە ئاوایی «شێوە گوێزان» نیشتەجێبوون. بەڕێز «محەممەد ئەمین خان»ی برای «محەممەد ڕەشیدخان»، ئاشێکی لە ئاوایی «تەیمەز» دەبێت. ئاشەکەی داوە بە قانع. ئەویش سەرپەرشتی ئاشەکەی کردووە و ژیانی ڕۆژانەی پێ دابینکردووە. لەو کاتەدا نامەیەکی بۆ بەڕێز «شێخ محەممەدی خاڵ» کە قازی شاری «چەمچەماڵ» بووە نووسیوە.

قانع لەم نامەیەدا باسی ژیانی خۆی کردووە، ئێمەش وای بە باش دەزانین کە نامەکە پێشکەش بە خوێندەوارانی ئەم دیوانەی قانع بکەین. ئەمەش دەقی نامەکەیەتی:

بۆ مامۆستای دین و دنیای کوردان حەزرەتی شێخ محەممەدی ئالی خاڵ

گەرچی من مەحبووبی خان و شێخ و ئاغ و بەگلەرم

بندە شاهی شمایم و سنا خوان شما

ڕۆح لە تەنگی سینە مەیلی لێونەکات بۆ خاکی پێت

باز گردد یا درآید چیست فرمان شما

کاشکی عومری دووبارەی پێ بدامایە خوا

تا ببوسم هم چو گردون خاك ایوان شما

من بە ئاهی سارد و سەختم کێو و کەژ وێران ئەکەم

بو کە بویی بشنوم از خاک ایوان شما

هەر چەندە دڵم پڕ لە غەم و دەرد و بەڵایە

ئەم عالەمی ئیمکان لە لام داری بەقایە

عەیش و تەرەب و کەیفم هەمووی دەرد و جەفایە

زیاتر لە هەموو قوڕبەسەری ناوم مەلایە

چی بکەم چی بڵێم چارەم چییە کاری خوایە

لەو ڕۆژەوە وا هاتمە ناو کۆمەڵی ئینسان

بەدبەخت و بە بێشەوق و سەراسیمە و عوریان

گەه تاڵبی نۆباش و گەهێ داخڵی عیرفان

گەه قەهقەهەیی بێسوود و گەهێ شیوەن و گریان

سەیریکە چ سەیرێکە من و گەردشی دەوران

وا ئێستە لە بەر پیری تەواو مات و پەشێوم

ڕەنگ زەرد و برینەدار و کز و بار بە لێوم

وەك غوولی بیابان و ئەڵێی زادەیی دێوم

گەه واڵە و سەحرایی و گەه ساکنی کێوم

بێ عەشرەت و غەمخۆر بە بێ یاوەر و خێوم

بەم پیرییە گشت ڕۆژێ ئەبێ مەیلی سەفەر کەم

بێ نەفع و بەبێ سوود ئەبێ ڕوو لە زەرەر کەم

لەم شاخ و کەژ و کێوەش کاکە حەزەر کەم

لە نامەکەدا دەڵێت ئەگەر هەواڵم دەپرسیت بۆ خۆم ئاشەوانم و کوتەك و خەنجەریش شوانی گوێرەکەن، لەگەڵ ئەم هەموو خۆشی و بەختەوەرییەدا، کوردستانم لە یادنەکردووە هەموو رۆژێك یەك چامە دەنووسم، بەڵام داخەکەم کاغەزم نییە تاکو بڵاویانبکەمەوە، هەر وەها لە سەر بەرگ و پشتی کتێبەکانم دەیاننووسمەوە.

«ئاشکرایە لەو سەردەمەدا لە ئاوەدانییەکی وەکو شیوگوێزان و تەیمەزدا کاغەز دەستنەکەوتووە بۆیە داوای لە جەنابی شێخ محەممەدی خاڵ کردووە کە کاغەزی بۆ رەوانە بکات، تاکو شیعرەکانی لە مردن و لە ناو چوون رزگاربکات و بیانگەیەنێتە دەستی خوێندەواران.

بەڵێ قانع تاکو ژیا بۆ کورد و چەوساوەکانی کوردستان ژیا. لەم نامەیەدا دەردەکەوێت کە هەژاری و برسیەتی و دەربەدەری کاریان لە ورەی بەرزی قانع نەکردووە و نەیانتوانیوە لە سەر رێبازی نیشتمانی لایبدەن و گەل و نیشتمانە ئازیزەکەی لە بیربەرنەوە. لە نامەکەدا دەردەکەوێت کە ترسی کوشتنی هەبووە، تەنانەت حەزەری لە دار و بەردی کەژەکانیش کردووە. بەڵام ئەم هەموو کوێرەوەری و سەرگەردانی و نەبوونی و

هەڕەشـــەی مەرگـــە، نـــەیانتوانیوە تـــەنها گـــەردێك لـــە قـــەڵای ورەی بـــەرزی ئـــەم مرۆڤـــە بکـــاکێنن، کـــە ســـنووری ژیـــانی لـــە نـــێوان دوو ســـێ دێ زیـــاتر تێنەدەپـــەڕی، ئێـــران و عێـــراق بـــە دوایـــــدا دەگـــــەڕان. قـــانع لـــــەو ســــەردەمە تــــارێك و شـــــەوەزەنگەدا کـــــە ڕژێمـــــی دەرەبەگایـــــەتی لـــــەو پـــــەڕی دەســـــتەڵاتدا لـــــە وڵاتـــــدا فـــــەرمانڕەوابوو. بـــــیری وای کردوەتـــەوە و شـــیعری وای وتـــووە کـــە حیزبـــە سیاســـییەکانی ئـــەم ســـەردەمی ئەنتـــەرنێت و کۆمپیوتـــەر و چـــوونە نـــاو مـــانگ و ئەســـتێرەکان شـــیعرەکانی دەکەنـــە مانشـــێتی ڕۆژنامـــەکانیان. مـــن وای بـــۆ دەچـــم کـــە هێشـــتا قـــانع بـــە تـــەواوی نەناســـراوە. ئەگـــــەر بـــــە وردی چـــــاوێك بـــــە بەرهەمـــــەکانیا بخشـــــێنین و بگەڕێنـــەوە بـــۆ ســـەردەمەکەی و لـــە ڕەفتـــاری دەســـتەڵاتداران و فـــەرمانڕەوایانی ئـــەو کاتـــە ورد ببینـــەوە، ئەوســـاکە زیـــاتر ڕاســـتگۆیی و دڵســـۆزیی ئـــەم شـــاعیرەمـــان بـــۆ دەردەکـــەوێت. ئاشـــکرایە کـــە نـــەبوونی و دەســـتکورتی و بـــەخێوکردنی مـــاڵ و مـــنداڵ گـــەلێك جـــار مرۆڤـــە هوشـــیارەکانیش دوچـــاری هەڵـــەی لابـــەلایی کـــردووە و لـــە ئاســـتی نـــەیارانی نەتەوەکـــەیاندا ســـەریان دانـــەواندووە، بـــەڵام ئەوەتـــە قـــانع لـــە تاریکترین و سامناکترین بەندیخانەی پەهلەویدا دەڵێت:

گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەردانەواندن کاری نامەردانەیە
قانعم ئەمرۆ لە زیندانا بە ئازادی ئـــەژیم
سەد هەزار لەعنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە

ئـــەو دەربەدەرییـــە کـــە بـــە ســـەر قـــانعدا هـــاتبوو هـــەمان دەربـــەدەری و ســـەرگەردانی بـــە ســـەر دیوانەکەشـــیدا هـــاتبوو. بـــاوکم لـــە ترســـی گـــرتن و ماڵپشـــکنین نـــەیدەوێرا دیوانەکـــەی لـــە مـــاڵی خۆمـــان، یـــان لـــە یـــەك شـــوێندا دابنێـــت. ئـــەوەندەی کـــە مـــن لـــە بـــیرم بێـــت ماوەیـــەك دیوانەکـــەی لـــە مـــەهاباد لای مامۆســـتا هـــەژار بـــوو. تەنانـــەت لـــە ســـەرەتای دروســـتبوونی کۆمـــاری کوردســـتان لـــە مـــەهاباد مامۆســـتا هـــەژار بـــەندێك لـــە دیوانەکـــەی بـــاوکمی لـــە ژێـــر نـــاوی دیوانـــی قـــانعدا چـــاپکردبوو. ماوەیـــەکیش دیوانەکـــەی لای «ئاغـــا ســـاڵحی رەنگـــەرێـــژان» بـــوو لـــە ئێـــران. لـــە دوای ئـــەوەش ماوەیـــەك لـــە لای «شـــێخ ئەحمـــەدی رەشـــەدێ» بـــوو لـــە مـــەریوان. ســـاڵی ١٩٦٣، کـــە لـــە بەندیخانـــەی قەســـری قەجـــەر رزگارمـــان بـــوو، چـــەند رۆژێـــك لـــە تـــاران لـــە میوانخانـــەی «هـــتل گـــیلان نـــو» مایـــەوە لـــەو رۆژانـــەدا هـــەندێك قوتـــابی کـــورد کـــە لـــە زانکـــۆی تـــاران دەیـــانخوێند هـــاتن بـــۆ لامـــان، چـــەند جـــارێکیش دەســـتەی نووســـەرانی ئـــەو رۆژنامـــە کوردییـــە کـــە لـــە تـــاران بـــە

ناوی کوردستان دەر دەچوو هاتن بۆ لامان. ئەو ڕۆژنامەیە خوێندنەوەی بۆ دانیشتووانی ئێرانی بە گشتی و بەشە کوردستانەکەی ئێران بە تایبەتی قەدەغە بوو. دوو جاریش سەرگوردێکی تێهرانی هاتە لامان بە باوکمی وت: دەزانیت لەسەر چی گیراوی؟ باوکم لە وەرامدا وتی: نەخێر. سەرگوردەکە کورد بوو وتی: لە سەر شیعری «ئێران پوور»ەکەت گیراوی. باوکم وتی: هیچ شیعرێکم بەم ناوە نیە. ئەویش وتی: من خۆم لە دیوانەکەتدا خوێندوومەتەوە. باوکم وتی: دیوانەکەی منت لە کوێ دیوە؟ سەرگوردەکە وتی: لە ماڵی شێخ ئەحمەدی ڕەشەدیێ. ئەو کاتە من قوتابی بووم و باوکم دۆستی شێخ ئەحمەد بوو، هاوینان دەچووین بۆ ماڵیان لەوێ زۆربەی دیوانە دەستخەتەکەی ئەوم خوێندۆتەوە. جێگەی سەرسوڕمانە ئەم پارچە هەڵبەستەی باوکم تا ئێستاش بڵاونەکراوەتەوە. «ئێرانپوور» نوێنەری دەوڵەتی ئێران بوو لە نەتەوە یەکگرتووەکان. بە پێی شیعرەکانی باوکم ئەم کابرایە گێل و نەزان بووە. ناسی زانیاری و ڕۆشنبیری و سیاسەتی گەلێك نزم بووە. بە داخەوە ئەم هەڵبەستە زیاد لە چەند دێڕێکی نەبێت لامان نەماوە.

## قانع و مامۆستا کەریم زەند

مامۆستا کەریم زەند

لـــــە رۆژی ٢٠٠٣/٣/٤ لە سلێمانی چوومە خزمـــــەتی پیری ژیر و خزمەتگوزار «مامۆستا کەریم زەند» کە لەگەڵ مامۆستا قانعدا نێوانێکی زۆر خۆشی بووە و زۆری لە مامۆستــا دەزانی و بــە رووخۆشـــیەوە لـــە مـــاڵی خۆیـــاندا لـــە خزمـــەتیدا دانیشـــتین و داوامانکرد کە باسی قانعمان بۆ بکات. ئەویش فـەرمووی لـــە کتێبـــی بەسەرهاتی خۆمدا ئەو بەســەرهاتەی کــە پــەیوەندی بــە قانعــەوە بــووە، نووسیومە. لەگەڵ پێشەکییەکدا بۆتان دەخوێنمەوە، بەڵام بە هۆی کــاتی دیاریکراوەوە لەگــەڵ کەســێتییەکی گــەورەدا نــەمتوانی دانیشــم، کــاك هیوای ئامۆزام ناردە خزمەتیان و ئەمە دەقی فەرموودەکەیەتی:

پێشەکی زۆر سپاســی مامۆســتای بــەڕێز مامۆســتا ئەحمــەدی نــەزیری دەکەم کە لە ڕێگەیەکی دوورەوە هاتووە بۆ بەچوون بە دوای بەرهــەمی بڵاونەکراوەکانی قانع و ئەو زانیاریە کە لە بارەی قانعەوە هەیە. منــیش یەکێکم لە دۆستە نزیکەکانی مامۆستا قانع، هەرچــی زانیاریــەك هــەبێ دەیگێڕمەوە:

لە ١٣٠٨ کۆچی مانگیدا ١٨٩٨ ی عیسایی تا ١٩٦٥ کە کۆتای ژیانیــەتی، لـــە یادوارەیــەکدا کــە بــۆی ســازکرا مــن یــەکێ بــووم لـــە

بەشداران. لە زۆر جێگای کوردستانەوە تەنانەت مامۆستا هێمنیش بەشدار بوو، من لەو یادوارەدا دوام، کە بەم شیعرە دەستم پێکرد.

زەمانێکی فراوانە دەنۆشم شەربەتی تاڵی
دەروونم پڕ لە ئەشعارە و لە ترسا دەفتەرم خاڵی

لە پاشان بە پارچە شیعرێك و بەم بەیتە دریژەم پێدا:

نەبوونی خۆم و ئەولادم قەبووڵە عیززەتی تیا بێ
بە ڕۆحکێشانی خۆ ڕازیم ڕەفاهی میللەتی تیا بێ

لە مەهاباد لە دێیەکدا بە ناوی «کەلبی ڕەزاخان» مامۆستا بووم، لە چایخانەیەکدا دیم و هەڵبەستێکی چرپاند بەگوێمدا و وتی دەڕۆم. وتم: مەڕۆ. وتی: هەڵبەت نامناسی. پاشان هاتەوە بۆ کوردستانی باشوور، بە ئیشی کرێکاری و ئاشەوانی و... خۆی خەریك کرد. لە چەند دێی شارەزوور مایەوە، ئەو زەمانە کە من نەفەری پەیوەندی بووم لە دەربەندیخان قانعی برسی و عەوداڵ بە شوێن ژیاندا هاتە ئەوێ، ئەو سەردەمە کۆمپانیای فەڕەنسی «سەیرابتوبرسیو» و کۆمپانیایەکی ئەمریکی «کنتراکتۆر بیکسی» بە کاری تونێل و بەنداوی دەربەندیخانەوە خەریك بوو، چونکە پێنج هەزار کرێکار خەریکی ئیش بوون نەیدەتوانی بمبینێ، لە سەر پارچە کاغەزێك نووسیبووی «یا کەریمی کارساز مەدەدێ» و نووسیبووی «قانع». منیش لە ژوورەکەی خۆمدا میوانداریم

کـرد و زۆر ڕێـزم بـۆ دانـا و بـەیانی بردمـە لای ئـەندازیاری ڕاگـر «کلۆنـێل گـریپس» و «کلۆنـێل بـانس» کـە ئەمانـە سەرپەرشـتی ئـەم ئیشـە بـوون و بـاوەری سـەرکۆماری ئـەمریکا «ئایزنهـاوێر» بـوون و چـەند گـەورە فەرمانبـەریتر. مـن کـە مامۆسـتایان بـووم و زمـانی کوردیـم فێـر دەکـردن و تەفسـەری پـەیوەندی بـووم، قـانعم پێـان ناسـاند، وتم: ئـەم پیـاوە شکسـپێری کـوردە. ئـەوانیش زۆر بـە سەرسـامییەوە سـەیری قانعیـان دەکـرد و جلـی شـاقەڵ شـۆڕی چـڵکن، چـاوی ئـاوکردوو، وتیـان: ئەمـە شکسـپێری کـوردە؟ پاشـان وتیـان: چـی ئـەوێ؟ وتم: کـاری ئـەوێ. کردمـان بـە سەرپاسەوان و بـە کرێکارەکانمـان وت ئـەم مـەیلی خۆیـەتی کـە هـەر جۆر کار بکات و خزمـەتی بکـەن، ئـەو زسـتانە لـەوێ مایـەوە، هـەتا دەروبـان گـەرم بـوو و نـزیکی گـەرما بـووەوە، هاتـە لام وتـی: فێنیشم کە. واتە دەرم کـە. منـیش دەمـزانی کـە وتـی ئـەڕۆم ئـەڕوا و دەشمـزانی نـاتوانێ لـە جێگایـەکدا بـێ بـە مووچـە و مەعاشـی چاکەوە. دەبێ ئەدار بێ و هـەزار وەکـو هـەژاران بـژی. ئـاخر قـانع ئەگەر ڕابواردایە لـە دیوەخـاندا و بـە سـواری ئەسـپەوە بژیایـە، قـانع نەدەبوو. قانع قانعی ئـەو تـەوان و تەحەمولـە بـوو. ئـیتر نەمدیـەوە تـا ١٩٥٨ عیسـایی، دوای کودتـای ١٤ی تـەمووز لـە خوێندگـای پیرەمـەگرون مامۆسـتا و کـارگێڕ بـووم، هاتـە لام، داوای ئـەلفبێ

کــوردی کــرد و دامــێ و دوو ڕۆژی پێچــوو، هــات و کتێبــێکی پێبوو «مێژووەکـەی ڕەشـید یـاسمی». وتـی: بـا بیکەینـە کـوردی و ئـەم یادگارەمـان هـەبێ. ئـەو دەیخوێنـدەوە و مـن دەمنووسـی. چـاوی چـاك نـەبیدەدی بـە زەرەبـین دەیخوێنـدەوە و زانـیم وا نـابێ. سـێ مامۆسـتای خۆشنووسـم کـردە نووسـەر و پـاش مـانگێك تـەواومان کـرد و هـەر ڕۆژ نـان و ماسـتمان دەخـوارد. دوای تـەواوبوونی، ئـەو نووسـخەکەی خـۆی خسـتە گیرفـانی و نەسـیحەتی کـردم و ڕۆیشـت و تـا منـیش دەستبەسـەرکرام و نـەفیکرام بـۆ باشـووری «میزۆپۆتامیـا» و زۆنگاوەکـانی هـۆڕی خـەمبارە و پـاش چـەند سـاڵ هاتمەوە.

ئـەم باسـە زۆر زۆر بـوو، شـتی زۆری تـێدا بـوو بـە داخـەوە لـە گەڕانـەوەدا لـە یـەکێك لـە پرسـگەکاندا کـە پێمـاندا گـەڕان دەسـتیان نـابوو بـە دەنگۆدەرەکـەدا و پـاك بـووەوە تـا ئێـرە کـە دەڵـێ مامۆسـتا باسـی جوغرافیـای کوردسـتان و باسـی خێڵـەکان دەکـا و دەڵـێ ئەمـەم لـە لـەتیف چـەنگیانی وەرگرتووە.

کـوڕگـەل کـوردستان هەرئەو بانەیە

هەر دوو کەژ و کـێو هەر ئەو شانەیە

لە گوڵ و بـوڵبوڵ لە پـڵنگ لە شێر

پێدەگەنـی ئـازا و دەنگ دڵـێر

یەکێ وەك بـــابان یەك وەك ئەردەڵان

وەکیلی میللەت یـــانێ کـەریم خان

میری لورستان بەگـــــزادەی کەڵوڕ

فازلی کوردی هەر وەك دانــەی دوڕ

سمکۆ ساداتی نەهری و شەمــــزین

لـــە غیرت ئەوان هەزار ئافەریـــــن

هـــــەر کـــــێو کــاڵە زەرزە

مـــوکری و دیبوکری و تا کوردی زازا

هۆزی گەورك و بەگـزادەی بـــانە

خــــانـــانی سەقز لـە ئەردەڵانـــە

لە کـــۆن و تــازە بەگی مەریوان

ئـــاغەی کۆماسی سانی هەورامـــان

جوانرۆ و لهۆن هەتـــا ئیناخـــی

مـــــەنمی و باجەلان هۆزی گوڵباخی

ئاغەی دزەیی و میری شەقـــلاوا

جـــاف و هەمـاوەند خانی ئـــاوا

شێخ بزێنی و شوان، شێـخی تاڵەبان

شێـــخـــانی ئیرشاد یانێ کـەسنەزان

پیری تــــــەوێڵە و شێخی بیـــارە

با منیش نەڵێـــم لە گشت دیـــارە

شێخی بەرزەنجــە ساداتی کـــــرام

گشتی کوڕی کێ نـــەوەی نیکنــــام

مێری مێراودەڵ بـــەگزادەی پشدەر

ئاغایانی کۆ شێری پــڕ هونـــــەر

عەشرەتی بڵباس هۆزانـــی ئەڵوەند

پارچە ئەورۆڵی وڵاتـــی پـــەسەنــد

سوور سوور و گەشکی سنجەری نـــەڕان

لە ڕۆژی جەنگا وەك شێر ئەهێنەڕان

زەنگنە و شیلانە و کـــایە و گۆران

داسنـــــــی و فەیلی یا هۆزی سۆران

قەرۆز و شێخـــان شێخی جەباری

تـــاوەگوێز مەلکـــەر شێری دیاری

گەورك و مەنگور خـــانی تیلەکــۆ

هـــەوشار و سەرپیر تا والـــی پشتکۆ

مێری کـــرماشان یانێ ئەمـــیر کۆڵ

زەند و داودە عەشــــیرەتی گـــۆڵ

ئاغـــەی          هۆزی کــــــافرۆشی

یا میران بەگی و شێخ کۆنـــەپۆشی

لــە          هـــورموزیــــــــار

یا ئاغاسووری شێخـــی جەوهـــەردار

ناوداری یاڵان غـــەوارە و بــاشكــی

بالكه بۆ چاخوسی شی و شینـــەكی

یا جافه رەشكــە و كەڵوێژ یا كـۆیی

بنـــچینەی كـــوردان هۆزی مــامۆیی

جەلالی و زەرزا و بیسەی و چـوچان

دیـــز و جەبـــاری و دەوەری بەرزان

بەرازی و سەرســوو هۆزی قەڵخـــانی

مـــــیری میری جـــاف بەگی شیروانی

شیرە و رەگەزی كـورد و كوردستــــان

نـــەومندە زۆرە نایــــــەتە مـەیدان

من چیم نووسیوە هەزارتایەك بـــێ

تـــــولی نـادەمێ ئیتــر كـــــۆتا بێ

شـــیعرەكە دوایــــــی هـــــات و فـــــەرمووی بــــاسی چـــی قـــانع بــــــكەم كـــــەسێ نـــــاتوانێ باســـی گەورەیــــــی و لێـــبوردوویی و لێهـــاتوویی قـــانع بـــــكا كــە دەیتــە قــــانع. قانــــــعنـــاسی زۆر گــــرانە، بـــە رەحـمـەت بــێ.

# نوکتە و قسە خۆشەکانی
# مامۆستا قانع

## قانع و نۆکەرێك

مامۆستا جارێکیان لە نۆکەری زاوت کە خوی نۆکەری ئاغا بووە توورە بووە و شیعرێکی زۆر جوانی بۆ ئاغە و رەعیەتی خولقاندووە و باسی ئەو کەسانەی کردووە کە کارێك دەکەونە ئەستۆیان و خۆیان وندەکەن و دەکەونە گیانی خەڵك. لەم بوارەدا چەند دێڕێك لەم شیعرە درێژە بڵاو دەکەمەوە.

خوالێخۆشبوو مەلا عەلی گۆشخانی گێڕایەوە و فەرمووی لەو شیعرە من هەر ئەمەم لە بیرماوە:

قێخا عەبدوڵڵا بێچارەی هەژار
پابووی بارەبەر هێسری زێر بار
بەندەی نۆکەری نۆکەرانی خان
بێجیرەو بەرات بێکا و بێدان
مەحرووم لە رەنجی شەوان و رۆژان
کەری بێگاری ئاغە و نۆکەران

پشتـــــەڕێش لە بەر بێگاری زاوت
هەرگیز تێر نەبوویت لە پووە و قاوت
بـــــە سکی برسیش هەر نەسەڕێنی
نـۆکـــــەر نۆکەری وا نـــــەنەڕێنی
پار هەر کەرێ بوویت ئێستەنۆکەری
تۆیچ وێنەی ئاغەت عاقیبەت شەڕی

## قانع و نوێژەبارانی

خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودی کانیسانانی گێڕایەوە فەرمووی:

شێخ مەحموودی کانیسانانی

لـــــە پێـــنجوێن ماوەیـــەکی زۆر بـــوو بـــاران نـــەدەباری، بڕیاریـــاندا بـــڕۆن بـــۆ نوێـــژی بـــاران. ســـۆفی و دەروێـــش دوژمنایـــەتییان لـــە بـــەینیدا بـــوو، پێکـــەوە نەدەچـــوونە دەرەوە. هاتـــە ســـەر ئـــەوە هـــەر کـــام دەســـتەی خـــۆی ئامـــادە بکـــا و بچـــنە نوێـــژ و بـــە جیـــا نوێـــژ بخوێـــنن. لـــە خزمـــەت مامۆســـتادا بـــووم لەگـــەڵ دەروێشـــەکاندا چـــووە دەرەوە، مـــەلاکان هـــەر چـــەند هاواریـــان کـــرد، ئەمـــە زۆر شـــتێکی خراپـــە، بـــۆ لەگـــەڵ ســـۆفییەکاندا ناچـــیتە دەرەوە مامۆســـتا وەری نەگرت.

دەروێشـــەکان زۆر زۆر بـــوون و تـــەنیا لـــە ناویـــاندا چـــاك لەبـــەر و مێـــزەرە بەســـەر هـــەر قـــانع بـــوو. ســـۆفیەکان کـــەم بـــوون بـــەڵام (١٢) مـــەلایان لەگـــەڵدا بـــوون. فـــەرمووی مامـــە بۆیـــە لەگـــەڵ ئەمانـــەدا هـــاتووم مـــن لـــە هـــیچ دەســـتە و دایرەیـــەکدا نـــیم، نامـــەوێ ئـــەم هەژارانـــە بـــارم بـــۆ بـــەرن، نامـــەوێ خـــــۆم بـــە ســـەر کەســـدا بســـەپێنم. زۆر شـــتیتـــری وت بەڵام...

پاشـــان هـــەمور چـــوونە دەرەوە و دەروێـــش بـــە تـــەپڵ و دەف و ســـۆڵ بـــە بـــێدەنگ، چـــوونە دەشـــت و بـــە جیـــا نوێژیـــان کـــرد. بـــە فـــەرموودەی شـــێخ مـــەحوود، بـــاران دایکـــردوومو هـــەمور بـــە تـــەڕی گەڕاونەتـــەوە زۆر بـــاریوە. دەروێـــش وتوویـــەتی لـــە بـــەر ئێمـــە بـــوو، ســـۆفی وتوویـــەتی لـــە بـــەر ئێمـــە بـــوو. قـــانعیش وتوویـــەتی ئـــاخر بـــرا لەگـــەر تـــەپڵ و دەفەکەی ئێمە ئاسمانی نەهێنایەتە لەرزە چۆن دەباری؟

## قانع و بەستنەوەی بە دارێکەوە

**کاکە حەمەی پێنجوێنی لە مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:**

جـــارێك لـــە کـــانیمـــانان روو بـــە پێـــنجوین رۆیشـــتووە. لـــە رێگـــەدا تووشـــی کابرایـــەك بـــووە و بورەتـــە هـــاورێی، وتوویـــەتی: مـــەلایت، یـــان فـــەقێ؟ وتوویـــەتی: بۆچـــی؟

وتوویەتی: شێخ محەممەدی دۆڵاشی دەناسی؟ وتوویەتی: بۆ چیتە؟ وتوویەتی: دەمەوێ... مامۆستا زۆر بۆی داچووە. وتوویەتی... من گەرلووە بەکرێ لە هەر کوێدا بیدۆزمەوە ئەوەندەی لێدەم بیخەمە مردن. وتوویەتی: بۆچی؟ وتوویەتی: ئاخر ئەو لە دین دەرچووە و هەڵگەڕاوەتەوە. وتوویەتی: لە دین دەرچووە یا لە ژێر باری زاڵم. جا باشە کێ دەڵێ راستەدەکا؟ جا ئەگەر بیبینی و پێش لێدان و کوشتنی شایەتیمان بێنێ و دەستوێژ بگرێ و نوێژ بکا، جا تۆ چی لێدەکەی. وتوویەتی: وەڵڵا هیچ، من زەرەرێکی زۆرم لێدەکەوێ. وتوویەتی: بۆ؟ وتوویەتی: ئاخر ئەگەر ئەوەی پێم وتراوە بە جێ بێنم، زەوینێك و دوو سەر بزنم دەست دەکەون. مامۆستا وتوویەتی: ئالێرەدا راوەستە. وتوویەتی بۆ؟ وتوویەتی: من ئەوم. شایەتیمانیش دێنم و نوێژیش دەکەم. کەوا بوو لێدانم گوناحە. بەڵام لەبەر ئەوە تۆ زەرەرت لێنەکەوێ. بە پشتوێنەکەم بمبەستە بەم دارەوە، خۆت بچۆ بڵێ زۆرم لێداوە و بەستوومەتەوە. خوا کەریمە. یەکێ دێ و بەرمدەدا. کابرا زۆر تەریقدەبێتەوە.

بە زۆری مامۆستا بەستویەتەوە. کابرا رۆیشتووەو پاش ماوەیەك کەسێ، ڕێبوارێك بە ویدا تێپەڕیوە و کردوویەتەوە. مامۆستا وتوویەتی: ناتوانم بڕۆم بەڕێدا سەر بوورم. لە زوومەوە بەسوارەمەتەوە. کابرا چووەو گوێدرێژێکی هێناوەو سواریکردووە و بردوویەتەوە بۆ ناودێ.

## قانع و دز

**خاتوو ئەمنەی خێزانی مامۆستا قانع گێڕایەوە و فەرمووی:**

ماڵمان لە پێنجوێن بوو، هاوسێیەکمان هەبوو خەڵکی دەوری... بوو. لە بەر نەداری، بڕێ شتومەکی لە ماڵێ دزیبوو، پێیان زانیبوو. هاتن دەوری ماڵەکەیان دان. مامۆستاش زانی، وتی بە کابرا ئەگەر شتێ لە ماڵتان هەیە بیخە ماڵی ئێمە. کابرا شتەکانی خستە ماڵی ئێمە و هاتن گەڕان و لە ماڵی کابرا هیچیان نەدۆزیەوە و ڕۆیشتن. بەیانی مامۆستا کابرای ماڵبراوی بانگکردو شتەکانی دایەوە پێی و وتی: کاکە من ماڵەکەی تۆم بڕیوە. کابرا زانی مەسەلە چییە، وتی: مامۆستا بۆ ئەم کارەت کرد؟ مامۆستا وتی: ئەم کابرا نەدارە و نەبوونی ئەم کەتنەی پێکردووە. منیش ناتوانم یارمەتی بدەم. ئەمە نیشەی مامۆستا وەها کاری لە کابرا کرد کە یارمەتی

کابرای دزی دا و ئیشێکی چاکی بۆ پەیدا کرد، ژیانی بە تەواوی گۆڕا. ئنجا وتی: سەیەنەجەی کەلجیق، کە مامۆستای خۆشدەویست، جارجارە لیشی بۆ دەکردین. وتی: دەبێ ئەم دزە لە هاوسێیەتیمانەوە دەرکەین. پاشان مامۆستا وای لە سەی نەجە کرد ئەگەر کابرای دز لە ماڵ نەبوایە بانی بۆ دەماڵی.

## قانع و بارزانی

ئەو ساڵە کە خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا هات بۆ پێنجوین، شارەکانی کوردستانی ئێران، کرماشان، پاوە، مەریوان و سەقز و... هەر کام نوێنەری خۆی بە دزیی ساواکەوە دەنارد بۆ پێنجوێن بۆ دیداری بارزانی. نازانم نوێنەرانی شارەکانی‌تر چۆن ناردرابوون. من کە تەمەنێکی کەمم بوو و بۆ ئەم کارە نەدەشیام، چوومە پێنجوین. بارزانی گەیشتە پێنجوین. چونکە تا ئەو جارە زۆر نەگەڕا بووم، یەکەم جار بوو پارچەی نووسراوی بە سەرشەقام و جادەکاندا هەڵواسراوم دەبینی و یەکەم جار بوو دەمبیست کە (۹) ماشین وەکو یەك لەگەڵ بارزانیدان. کەس نازانێ بارزانی لە ناو کامیاندایە. شەو لەگەڵ مامۆستا قانع و مەلا سەی رەشید پێکەوە بووین کە

مامۆستا و مەلا سەی رەشید زۆر تێدەگیران. سەی رەشید جۆری خەباتی مامۆستای قەبووڵ نەبوو. ئەمە بگەڕێین کە لە بەینی ئەو و مامۆستا چی دەگوزەرا. یەکتریان زۆر خۆشدەویست. لەوە بگەڕێین کە من چۆن لە بەر منداڵی و کەم تەمەنی نەمدەزانی چی بکەم. بە هەر حاڵ من رۆیشتمە دیداری بارزانی. لە سەرادا بوو، گەیشتمە بەر دەرکی سەرا. پاسەوانەکە وتی: بۆ کوێ؟ وتم بۆ لای بارزانی. وتی: تۆ بۆ لای بارزانی؟ بڕۆ لاچۆ. هەرچی هاوارمکرد لە مەریوانەوە هاتووم، بڕێك پێم پێکەنی و دەریکردم. پاش سەعاتێك دووبارە رۆیشتمەوە و بڕێ شتم لە دڵی خۆمدا حازر کردبوو کە بیڵێم. کە دەستمکرد بە وتن پاسەوانەکە تووڕە بوو، وتی: کەم بڵێ دەتخەمە بەندیخانەوە. گەڕامەوە. شەو لای مامۆستا باسەکەم گێڕایەوە. مامۆستا فەرمووی برا، تۆ هەر لە ئەوەڵەوە غەڵەت هاتووی، تۆ هێشتا تەمەنێکی وات نییە جێی متمانە بیت. تۆ ناترسی سبەی دەچیتەوە ئێران و ساواك لە سەر ئەم ئیشەت بتگرێ؟ ئاخر تۆ ئیشت بە بارزانی چییە؟ بۆ ئەو هەموو رێگایەت بڕیوە بە بێ ئەوەی کە بزانی بۆ هاتووی، ئەمە بە خەبات دەزانی؟ راستت

دەوێ بەرا ئەم جۆرە خەباتەی ئێوە دژی شا، نە ناوی خەباتە و نە جێگایەك دەگرێتەوە. سەی رەشید کە زوو زوو لەگەڵ مامۆستادا قسەیان تێدەگیرا، وتی: مامۆستا وا نیە. مامۆستا فەرمووی: باشە، بۆچی قەرار نەبوو بارزانی هاتە ئێرە من ببینم و کاتم بۆ دیاری نەکراوە؟ بۆچی رێم پێ نادەن؟ سەی رەشید وتی: ناخر ئەوانەی لە دەوری بارزانیدان جەنابت ناناسن.

مامۆستا فەرمووی: ئەوانە کێن؟! ناوی چەند پێنجوێنیەکی برد، ئەوانە بوونەتە کارگێڕی بارزانی، بڕێکیان لەوانەن کە راپۆرتیان لە من دا. سەی رەشید وتی: مامۆستا خۆت دەزانی لەم جۆرە کاتانەدا ئەم شەڕزییە روو دەدا. بەڵام مامۆستا ویستی بڕوا و نارەحەت بوو لەوەی کە زۆر چاوەڕوانی کێشاوە و لە باتی ئەوە یەکەم کەس بێ بۆ دیتنی بارزانی، کەچی ماوەی پێنەدراوە. نامەیەکی زۆر سەیری نووسی بۆ بارزانی. مەلا سەی رەشید نەیدەهێشت بڕوا و پێی خۆش نەبوو بە نارەحەتیەوە بچێ و لەوە زیاتر بڕەنجێ. دەیزانی ئەگەر بارزانی بزانێ قانع لەوێیە خۆی دێتە دیتنی. مەلا سەی رەشید نامەکەی برد و چۆن گەیاندبوویە دەستی بارزانی

نازانم. بەڵام پاش ماوەیەك هاتن بە دوای مامۆستادا و بردیان. چەند سەعاتێکی پێ چوو، هاتن بە دوای منیشدا. من کە واقم وڕ مابوو، کەوتبوومە ناو ئێشێکی گەورەوە، توانای ئەو بارەم نەبوو کە خستبوومە سەر شانم. گەیشتینە لای بارزانی، مامۆستا دانیشتبوو زۆر عاجز بوو. بارزانی دڵی دەدایەوە و دەیویست ئەم نارەحەتییە لە دڵی دەربێنێ. من دانیشتم لە ترسی عاقیبەتی ئەم کارەم و لەوەی یەکەم جار بوو پیاوێکی گەورە و سیاسی و ئەم جەنجاڵەم دەدی دڵم پڕ بوو. نەمدەتوانی قسە بکەم. بارزانی دڵی دامەوە و دڵنەوایی کردم. ئەحەق پیاوێکی گەورە بوو و دڵێکی ئاوەڵای هەبوو. فەرمووی ئەگەر دە کەس لە مەریوانەوە بهاتنایە، بە ئەندازەی تۆ کە لاوێکی، پێم خۆش نەدەبوو. ئەمەس مامۆستا کە گەیشتبووە لای بارزانی پێش هەموو شتێك باسی منی کردبوو. زۆر شت لە بەینی بارزانی و مامۆستادا وترا. مامۆستا پرسیاریدەکرد و بارزانی بە نەرمی وەڵامیدەدایەوە. فەرموودەکانی مامۆستای پەسەنددەکردن. نانی نیوەڕۆیان لەگەڵ مامۆستادا پێداین. بارزانی چەند دیناری دایە دەستی مامۆستا کە بیدا بە من لە پاکەتێکیشدا

پارەیەکی تری دا بە مامۆستا. ئاگام لێبوو هەر چی بارزانی تکایکرد، مامۆستا نەیویست و دایەوە.

خۆزگە فەرموودەکانی بەینی بارزانی و مامۆستا بنووسرایەن. مامۆستا لە بڕێ شت رەخنەی دەگرت و بارزانی وەڵامیدەدایەوە. جار جار بارزانی دەستی دەخستە سەر شانی مامۆستا و دەیفەرموو خوا بتهێڵێ بۆ رێنمایی ئێمە. هەر چەندە من لە دڵی خۆمدا پێم ناخۆشبوو مامۆستا خەڵاتەکەی وەرنەگرت و دەترسام بارزانی ناڕەحەت بێ، بەڵام بارزانی هەر دڵی دەدایەوە و شتی زۆریان باسکرد.

لە بارزانی خواحافیزیان کرد و هاتینەوە بۆ ماڵ. مامۆستا فەرمووی جا ئێستە گوێ بگرە با بۆت روونکەمەوە. تۆ نەدەبوو بهاتبای، کەس نەیویراوە بێت، تۆیان ناردووە. ئەم جۆرە خەبات و دژایەتییەی رژێمی شا ناگاتە ئامانج. چونکە ئەوانەی کە لە ساویلکە و لاوی وەك ئێوە کەڵك وەر دەگرن لەگەڵ ساواکدا سەر و کاریان هەیە. هەڵبەت لە ناو سەدان کەسدا یەکێ، یا دووان خەڵەتاون و خەیانەتدەکەن و خەباتگێڕان بە ساکاری دەکەونە شوێنیان و ئەو یەك و دووانە زۆربەی

سیاسەتی خەباتەکە دەگرنە ژێر چاودێری خۆیان و ناهێڵن کەس بزانێ و پاش ماوەیەك ئێوە دەگیرێن. مەلا سەی رەشید تووڕە بوو، وتی: دە لە ترسی دوو کەس بە قسەی جەلالیت دەست لە خەبات و تێکۆشان هەڵگرین؟ مامۆستاش فەرمووی خەباتێك ساواك رێبەری بێ، ئاخری دەچێتەوە دەرباری شاهەنشاهی. رووی کردە من و فەرمووی: رۆڵە تۆ هۆشت بە خۆتەوە بێ. دەبینی من چەند ساڵە لەم رێگەدا چیم لێ قەوما؟ بۆ چاوپێکەوتنێکی بارزانی چۆن بڕێك نەیاندەهێشت بچمە لای بارزانی. پاشان فەرمووی لە هەر خەباتێکدا بۆ وەدەستهێنانی ماف، ژیرانە رۆیشتن پێویستە. ئەگەر هەزار ساڵ بە هەڵەدا بچی، دانیشتن چاکترە و بێدەنگی تا غەڵەت رۆیین. چەند دینارەکەی بارزانی پێدام و فەرمووی ئەمە بگرە بیبەرەوە بۆ... بارزانی بۆی ناردووی. منیش وتم مامۆستا، بارزانی بە تۆی داوە نەك بە من. فەرمووی: نا، بۆ تۆیە. بارزانی وتوویە ئەم لاوە زۆر رەنجیکێشاوە کە من ببینێت و زۆریش نارەحەتە. منیش بڕێ لە پارەکەم بەجێهێشت بۆ سەی رەشید.

پاشان لە سەر ئەم سەفەرە چیم لێهات، با خۆم بزانم. هەزار رەحمەت لە مامۆستا قانع.

مامۆستا بە مەلا سەی رەشیدی وت: دەزانی بۆ پاش لەو تورەییە چووم بۆ لای بارزانی؟ لە بەر خاتری ئەم کورە کە بە نائومێدی نەچێتەوە. لێرەدا ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ لەگەڵ ئەو هەموو دەستکورتی و نەدارییەدا پارەی نەویست و بانگەواز و هاواری بۆ راستڕەوی بوو. سەی رەشید وتی: بە خوا مامۆستا پارەی سەفەرەکەی پێ نیە و ئەوەتە پارەکەی بارزانیشی نەویست.

## قانع و سەکۆی نەحلی[1]

مامۆستا جارێکیان لە سەر کێوی سوورێن تەماشای بناری شارەزووری کردووە، بە هۆنراوەیەك و بە کورتی باسی لە بەرێ مێژووی ئەم بنارەی کردووە. منیش ماوەیەکی زۆر خەریکبووم تا پەراوێزی بۆ بنووسم بۆ ئەوەی زۆرتر لەم چەمکە مێژووییە بگەین. ئەمەش دەقی

---

١ـ پیاوێکە خەڵکی دەوری وەیسەی سەر بە ناوچەی مەریوان، لە شارەزوور کرێکاری و دروێنەی بۆ خەڵک کردووە. بە شەو لە بەر گەرما و مێشوولە چووەتە کێوی سوورێن. لە نزیکی لوتکەی ئەم کێوەدا جێگایەکی تەختکردووە و نووستووە و بەیانی زوو رۆیشتووەتەوە بۆ دەشتی شارەزوور بۆ دروێنە. ئەم سەکۆیە بە «سەکۆی نەحلی» ناو بانگی دەرکردووە.

هۆنراوەکەی قانع لە ناونیشانی «سەکۆی ئەحلیێ» کە لەبەر دەستووسی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محەممەد ئەمین کانیکەوەیی نووسیومەتەوە.

پرسیار لە ئەحلیێ:

ئەحلیێ هەر چەندە نووستوی دەزانم

تۆ چیت لە بیرە؟ قەزات لە گیانم

بانی بنۆک[1] و قەڵاکەی ئەوێ[2]

بڕۆ بە بۆس خاکی لێرە تا ئەوێ

سوورێن[3] و هەیبان[4]، هەرمێلە[5] و رادە[6]

ئاسەوار میترا[7] و زەردەشت[1] و مادە[2]

---

١ ـ دێیەکە لە بناری شارەزوور، کەوتووەتە لای سەرووی دێی ئەحمەدئاوا.

٢ـ دێیەکە لە بناری شارەزوور، قەڵا و ئاسەواری کۆنی زۆری تێدایە، لە پشت ئەم دێیەوە قەڵایەکی زێڕەوینی هەبووە کە پێیان وتووە «زیندانی زوحاکە»، باسی قەڵاکانی ئەوێ و قەڵاکانی ئەحمەدئاوا و زەڵم و میری سوور و قەڵاکانی ئەو بنارەم لە کتێبی هەورامانناسیدا بە تەسەلی کردووە.

٣ ـ شاخێکە لە بەینی شارەزوور و مەریواندا، ڕێگای ئەسکەندەر لەوێوە تێپەڕیوە.

٤ـ کێوێکی بەرزە لە پەناو «دەڵەمپێر» دا. پیاهەڵگەرانی زۆر سەخت و دژوارە. لە سەر لوتکەی «هەیبان»ەوە شارەزوور و مەریوان دیارە.

٥ـ دەشت و ناوانێکە کە لە پەناو کێوی «هەیبان» و لە داوێنی «هەشەمەری» دایە، لە سەرووی دێی چناری بناری شارەزوورەوە، دارستانە و جێگایەکی زۆر خۆش و کوێستانە.

٦ـ زۆر گەڕام ئەمزانی لە کوێدایە.

٧ـ میترا ـ میهر. میتر لە ئاوێستا و فارسی کۆندا میترا و لە سانسکریت میترە. لە پەهلەویدا میتر. میهر بە مانای خۆشەویستی. لەلای میهر واستەیە لە بەینی بەدیهێنەری بوونەوەر و بوونەوەردا. لە گاتەکاندا بە مانای عەهد و پەیمان هاتووە. میهر لە ئاوێستادا بەدیهاتووی

هەی بـاوان شێواو، ئـــەحلــێ رەنجەڕۆ
ببــووره زامــت دەهێنــمــــــەوە ســــۆ
فەڕووخ[3] کامە بوو؟ خێلان[4] کــێ بووە؟
مـــێژووی چەن ساڵەی ئێمەی پـێ بووە

---

ئاهورایە. بە کورتی بووەتە ئایینی میهر و بە هۆی سەربازە رۆمییەکانەوە چووەتە پێشەوە. ئایینی میهر پەرەی سەندووە و بە وڵاتدا بڵاو بووەتەوە. لە زۆر جێگاشدا کراوە بە خوایەکی گەورە. بەم جۆرە ئایینی میهرپەرستی بەدیهاتووە. لە هەورامانناسیدا باسی میهرپەرستی و ئایینە کۆنەکان لە کوردستاندا باس کراوە.

١ـ لاپەڕەی پێشوو ا زەردەشتی: ئایینێکی زۆر کۆنە. دەڵێن چەند زەردەشتێک هەبوون. هەر کات ئایینی پاک تووشی هەڵە بووە و لە ڕێگە لایداوە زەردەشتێک هاتووە بۆ ئەوەی بیخاتەوە سەر ڕێگا. دوایین زەردەشت کوڕی پوورشپ ٦٠٠ ساڵ پێش لە دایکبوونی حەزرەتی مەسیح بووە. زەردەشتەکانی تر هاتن و چوونیان زۆر دیار نییە. کتێبی زەردەشت ئاوێستای ناوە. لە سەری نوسراوە لەسەری لێکراوە بەناوی زەند. لە سەر ئەویش نووسراوە بە ناوی پازەند. لە هەورامانناسیدا باسی ئایینی کۆنی کورد و زەردەشتم کردووە. بیر و باوەڕی وڵاتی کوردەواری پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە پێی بەڵگە و نووسراوی کۆنی وڵاتی خۆمان هەرچی بووە باسمکردووە.

٢ـ لاپەڕەی پێشوو ماد: هەر کوردێک تا ڕادەی پێویست ڕەسەن و باوەگەورەی خۆی دەناسێ.

٣ـ دەڵێن یەکێکە لە سەردارە کوردەکان لە کاتی هاتنی سوپای ئیسلامدا بۆ کوردستان، لە ناوێدا فەرمانڕەوا بووە. بە پێی فەرموودەی مامۆستا قانع، هەڵبەست بەڵگە و ئیشاڵەی لەسەرێش هەن. بەڵام «دوغلدی» پێی وایە فەڕوخ فەرمانڕەوایەکی بە دەسەڵات بووە لە کێوەکانی قەندیل، یان بەرزاندا بووە. زۆر گەرام بۆ ژیان و بەسەرهاتی فەڕووخ، زۆر شتم لێ دۆزیەوە. لێرەدا ناگونجێ باسی بکرێت. لە هەورامانناسیدا باسمکردووە.

٤ـ خێلان: کچێکی کورد بووە، لە زەڵم و خورماڵدا ژیاوە. ویستوویانە بە زۆر بیدەن بە شوو، دوای گیران و لەسێدارەدانی باوکی، خێلان چووەتە کەژ و هەر کەسێ لە هەر جێگایەک کچێکی بە ناڕەزا بدایە بە شوو، مەلا و باوک و شایەتەکانی دەبردە کەژ و فەلاقەی دەکردن و لە ئەشکەوتێکدا چەند ڕۆژێ دەیشاردنەوە هەتا تۆبەیاندەکرد و لەمێدەبوون و کچەکە ڕزگار

## ئەسکەندەر[1] کێبوو؟ کامەڕێگەکەی؟

## خـــــاتوو زنـــڕینە[2] و قەڵا و جێـگەکەی

---

دەبوو. ئەم خێڵانە ڕەنگە کچی ئەمیر خەسرەو بلباسی بووبێ. ئەم ئەمیرخەسرەوە ماوەیەک حاکمی شارەزوور بووە بە پێی ئەو بەڵگە نووسراوەی بنەماڵەی سەیدمحەممەد مستەفای خورماڵی (خورماڵی) ئەگەر ڕاست بێ لە ساڵی ١٠٦٨ی کۆچی مانگیدا عوسمانییە لە خوانەترسەپیسە داگیرکەرەکان و بە یارمەتی و هاوکاریی سەربازە ئێرانییەکان لە هێرشێکی دوو لایەنەدا کە بردیانە سەر شارەزوور و کوشت و کوشتارێکی یەکجار زۆر و بەربڵاو ڕوویدا، بوو بە هۆی سووتانی خورماڵ، گوڵ عەنبەر، خۆرماد و ماڵی دێکانی شارەزوور و سەپاندنی فەرمانی عوسمانییەکان و کوژرانی ئەمیرخەسرەو و دەربەدەر بوونی کوردەکان. بەڵام خێڵان کە ویستیان بە زۆر مارەیکەن بۆ کەسێ، چوونە کەمز و پێنج کچی تری لەگەڵ خۆی بردوون. دەڵێن لە کێوەکانی بناری شارەزوورا بە ئاپیمەت هەیان سێ ساڵ مانەوە. لێرەدا دەرفەت نییە نموونەگەلێک لە ئێهالوویی ئەم کیژە کوردە باسکەین. بە یارمەتیی خوا لە هەوراماننامەیدا بە تەسەلی باسیدەکەین و شیدەکەینەوە لەگەڵ بەڵگەی پتەوتر. لە بەینی دێی چنارە و مێری سووریشدا لە بناری شارەزوور ڕێگایەک هەیە بە ناوی «حرلخێڵانە»

١ـ ئەسکەندەری مەقدوونییە.

٢ـ خاتوو زنڕینە فەرمانڕەوایەکی کوردە کە لە ئێهالوویی و زیرەکیدا بەناوبانگبووە. جێی فەرمانڕەوایی خورماڵ و بناری شاخی سوورێن خوار دێی چنارە بارگەیەکی یەکجار بەربڵاو و باخێکی زۆر و خانووی ڕازاوەی دروستکردووە و لە دوورەوە ئاوێکی زۆری بە کەرەسەی ئەو کاتە هێناوەتە ناو باخ و ماڵەکەی و بەهەشتێکی لێ دروستکردووە و ناویان ناوە «زنڕینە»، لە پاش ماوەیەکی زۆر گۆڕا بە زنڕوێن و پاش ماوەیەک لە هێرشێکدا کە کرایە سەریان لە شەڕدا لە سەرئاوێرە بەردێکە کەوتە خوارەوە و مرد. ماوەیەکی زۆری بە سەرداهات کە نەزانین چی لەوماوە تا ئەم دواییە، هەر بەو ناوەدانییە مایەوە و لەم دواییەدا خوالێخۆشبوو خاوەن موڵکی زەوی و زاری زنڕوێن کە ویستی مەزراکان ئاوەدان بکاتەوە، دانیشتووانی گوێزرانەوە بۆ جێگایەکی تازە بە ناوی کانی‌پانسکان و دێیەکی تازە دروستکرا. لێرەدا و لەمە پتر بوار نییە باسی خاتووزنڕینە بکرێ. خەڵکی ناوچەکە بە جۆرێکی‌تریش باسی لێدەکەن. من لەم باسە دڵنیا نیم و خەریکم بە پاشی ڕوونیکەمەوە و ڕاستییەکەی بە یارمەتی خوا لە هەوراماننامەیدا دەنووسم.

بـــە تایبـــەت نەوێ ئەم شارە کـۆنە

قەسری کامـــە بوو؟ قەڵاکەی چۆنە؟

وەڵامی ئەحلیّ:

گلـــەییت لێبیّ دامئــــەچـــڵەکێنی

لە خـــەوی خۆشـــم رائـــــەپـــەڕێنی

من لە بەر گەرما و مێشوولە و سەبوون

لە مانوو بوونم چشـــمکرد، بـە توون

رۆژ لــــە شـــارەزوور درەوم ئــــەکرد

بە شەو بـــۆ سـووڕێن پەنام ئـــەهاورد

بیستــــوومـــە قـــەدیم لە باوەگەورە

ئەم قەڵا و بـــەردە هـی دەوری گەورە

بـــاوك و بـــاوامـــان ئێژن گـاور بوون

پاسەوان مەشخەڵ دەوری ئـــاور بوون

لە بـانـــیبنـــۆك قـــەڵایــــە بـــووە

جێـــگەی هـــــەواری شـای نەوێ بـــووە

فەڕووخ شایەکـــــــی بە دەستـەڵاتبوو

خۆشەویستی خـــــەڵك گەل و وڵاتبوو

وڵات ئاوەدان خـــــــــەڵکی دڵشـاد بوو

لــە دەرد و رەنج و مـــیحنـــەت ئازاد بوو

سپـــایە سامدار لە پـــــــڕ پـــەیا بوو

سەرولزی فـــەڕووخ تـــەفر و توونا بـوو

قەلاکەی یەکجار گەمارۆ دریا

سەر چاوەی ئاوی لێ قەتع کریا

هەرووخ شەڕیکرد هەتاکوو کوژیا

خوێنی بە سەر بەرد قەلادا پژیا

سوورێن ڕێگەی بەین دوو ئاتەشگا بوو

هەمیان حەشار و جێی پەناگا بوو

لە بانی بنۆك قەلای تاشەکە

ڕووبەڕووی کانی و بەرد و ئاشەکە

نووسراوە لە بەرد لە سەنگ و لە غار

بیستوومە بووە بێ حەد و ژمار

هەرمێلە جێگەی بەردە پەناکەس

لە ژێری ماڵ و بەر هەیوانەکەس

خێلان ، ژنێکی سەر خێلی کوردان

حاڵی لە ئێش و ئازار و دەردان

بۆ تۆڵە سەندن هاتە ئەم هەردە

هاتە ئەم شاخە و ئەم کێو و بەردە

چەن ساڵ شەڕیکرد مەرد و مەردانە

هەتا سەلاندی شێرە ژنانە

نەیهێشت فاسڵەی بەینی ژن و پیاو

ڕۆڵەی کورد، کوردە چ ژن، چ پیاو

جـادە و ڕێگەیەك بۆ عـــــەرەبـــانە
ئاسـاری مـابـــوو تـــا ئەم زەمـانە

گوایا ئەسکەندەر، جـــــادەی کێـشاوە
وەهـــا مەشهوورە، بەم جـۆرە بـــاوە

پانزدە ڕۆژ، دەوری سوپاکـــەی دریـــا
کە باســی سوپای کوردی بۆ کــریـا

مۆڵـەتی خواست و لەم جێگاوە چوو
توانــای شەڕ و وێستانـــی نەبـــوو

خاتوو زێڕینە وقـــەڵا گـەورەکـەی
هــەزارە سوون[١] و دەور و بـــەرەکـەی

فەرمـانـــڕەوایەك کـورد و بە هــەڵمەت
حاکـــمی عادڵ بە ســـام و هــەیبەت

قەڵای زستـانی زێڕینە مــــەشـــهوور
بوو بە زێڕین و کـــاول و خـــاپـوور

---

١ـ هەزارەسوون ئەشکەوتێکە لای سەرەوەی دێی «دەمرەگوڵان»ە و لە لای ڕێی سوور دایە لە جێگایەکدا کە پێی دەڵێن «ڕاخێڵان»ە، ئەشکەوتێکی زۆر گەورەیە و دەرگاکەی بە کوڵەیەکی سروشتی کراوە بە دووبەشەوە، لەم ئەشکەوتە هێندە گەورە و جێگەدارە کە خەڵکی وەیسە، سیاللو، ئەسکۆڵ و پیران لە زەمانی پێشوودا کە بەفری زۆر دەباری و لافاو و حەیوانەکانی دەکەوتنە قات و قڕی، خەڵکەکە لە بەر ناچاری و بێ ئاقڵی دەیانبردنە بناری شارەزوور بۆ لەوەڕ، شەوانە ئاژەڵەکانیان دەکردنە ناو ئەشکەوتەکە و خۆشیان لەوێدا ستارپاندەگرت. ئەم ئەشکەوتە هێندە گەورەیە ئەم نیازەی بەراوردە دەکرد. زۆرتر لەم بارەیەوە پێویستە باسبکرێت. هەزارەسوون و قەڵاکانی دەور و بەری و سوڵتان ئیساق و ... لە هەورامانناسیدا باسکراوە.

زنجیرەی گۆڕیا و زنجیرون لە پاشان
ناوی مەشهوور بوو بە کانی ئاسکان[1]
ئەم شێرە ژنە، ئەم قارەمانە
مایەی شانازیی کورد و کوردانە
داخەکەم ئەمەم بۆ باسکراوە
ساڵ و رۆژەکەم لە بیر نەماوە
خواحافیز ئەحلێ بێخەم بخەوە
خاستکرد جێتهێشت ئەم چەقڵودەوە
جا هاتمە سەر کەل روو بە مەریوان
چاوم خستە سەر ئەسکۆڵ و پیران
کاش لە هەر جێیەک ئەحلێیە بوایە
جوابی سوئالی منی بدایە
قانع و ئەحلێ هەر دوو هەژارن
هەر یەک چەوساوەی یەک رۆژگارن

## قانع و کتێبگرتنەوە

ئوسا محەممەدی خەیات ماڵی لە «کاڵ» بوو. ئینسانێکی چاک و پیاوانە بوو، پێیان دەوت (حەمەشەمە) گێڕایەوە و وتی:

رۆژێکیان لە خزمەت مامۆستادا بووم، ژن و پیاوێک هاتن وتیان مامۆستا دەمی کتێبمان بۆ بکەرەوە، دەمانەوێ

---

[1] ـ یەکێکە لە دێیەکانی بناری شارەزوورە لە بەینی ئەحوق و دەرەگوڵاندایە.

لە یەکتر جیا بینەوە، چونکە رزقمان نیە، کەڵەشێرێکمان بۆ هێناوی. ئەو دەڵێ سیر، من دەڵێم پیاز. مامۆستا لە رواڵەت و جل و بەرگدا زانی دەبێ زۆر نەدار بن و زۆر لە ناتەواویدا بژین. فەرمووی حەمە هەڵسە. بە ژن و پیاوەکەی وت: ماڵتان لە کوێیە با بچین. ژنەکە وتی: ئەمڕۆ مامۆستا کەی ئێمە لایەقی ئەوەین کە تۆ بێیتە ماڵمان؟ ئێمە حەدمان چیە؟ مامۆستا فەرمووی قەیناکا. چووین بۆ ماڵی کابرا لە دەرگایەکی بچووک چووینە ماڵەوە. تەنیا کوناوەجەیەکی تێدا بوو. جەواڵە شڕێك راخرا بوو. بڕێ کەری و کەوچکی دار و رۆحە شکاو و زۆر وەزعێکی نالەبار. مامۆستا زانی ئەم شەڕ و ناکۆکیە هی نەداریە و هەتا لەم دێیەدا بن لەمە خراپتر دەبێ. مامۆستا بە کابرای وت: نابێ لەم دێیەدا بن. کابرا وتی: قوربان بچم بۆ کوێ. وتی: من لە ریشێن لە شارەزوور ئاشنام هیە، نامەی بۆ دەنووسم. بچن بۆ ئەوو چنین. هەتا کاریش دەدۆزنەوە خەڵکی ریشێن یارمەتیتان دەدەن. هەردووکیان قەبووڵیان کرد و مامۆستا کەڵەشێرەکەی دا بە ژنەکە و وتی ئەم کەڵەشێرە

بکوڵێنە و بیکە بە توشە بۆ رێگە، منیش دەڵێم نانتان بۆ بکەن. وتم: مامۆستا ئەم ئیشە چی بوو. وتی: کاکی من لەم دێیەدا ئیش و کار نییە، خەڵکیش نەدارن. لێرەدا برایەن تەڵاق دەکەوتە بەینیان. بەڵام لە ریشێن بە چاکی دەژین و ئیتر منداڵەکانیان سەرگەردان نابن و خۆشیان تووشی داماوی نایەن.

## دەعوەتی قانع و وەڵامی سێ پرسیار

**کاک عەبدوڵڵا محەممەد لە سەی سادق گێڕایەوە و فەرمووی:**

لە ماڵی یەکێ لە پیاوەگەورەکان بە بۆنەی مامۆستا قانعەوە میوانداریەك ساز کرابوو. یەکێك لەوانە کە دەعوەت کرابوو و مامۆستای خۆشنەدەویست و دانووی لەگەڵیا نەدەکوڵا. لەو دەعوەتە و لەو رێز گرتنە لە مامۆستا، رازی نەبووە، ویستوویەتی مامۆستا بشکێنێ، وتوویەتی: مەلا قانع شتی غەڵەتی زۆری وتووە. بۆیە لە رووی خۆیدا دەڵێم، نەبێتە غەیبەت. شیعر و قسەکانی هەموو تەناقوزە و هەموو شتێکی بۆ فیز و دەمارە. ئەگەر باسی کورد دەکا، بۆ ئەوەیە ناتوانێ شتی‌تر باسبکا. چونکە شاعیر نییە و ئەم رەخنانەم رووبەرووی خۆی

دەڵێم و دەزانم وەڵامی نییە. مامۆستاش وتوویەتی یەکە یەکە ڕەخنەکانت بڵێ، جا ئەگەر توانیم وەڵامدەدەمەوە و دانیشتووان داوەریکەن. ئەویش وتوویەتی: یەکەم، بیستوومە دەڵێن ستالینت خۆشدەوێ. ستالین یەك ملیۆن ئینسانی کوشتووە، کە بە هیچ شایەنێکی مرۆڤایەتیدا ناکێشرێ. ئاخر کوشتنی ملیۆن بە کام بەڵگە پەسا دەدرێت؟ من پێم وایە مرۆڤایەتی بۆ کردەوەی ستالین و هیتلێر وەڵامی نییە، ئەمە یەك. لە یەکێ لە شیعرەکانتدا دەڵێی:

نە ڕەندی، نە قەلەندەری، نە فارسی، نە بەربەری

کوردێکی پڕ دەردەسەری، بێقیمەتی وەك تووری تەڕ

کوردت بە بێقیمەت داناوە. وەکو تووری تەڕ ناوی دەبەی، کەچی خۆت بە خەمخۆری کورد دەزانی، ئەمە دوو. سێیەم: جلی مەلایەتیت لەبەر دایە و دەڵێی سەیدم و... کەچی دینت بە گاڵتە گرتووە و ڕەخنەی لێدەگری... و چەند شتیتر. هەموو دانیشتووان گوێ قوڵاخ بوون تا بزانن وەڵامی مامۆستا چییە. مامۆستاش وتوویەتی نازم نییە وەڵام بدەمەوە، هەموو خەڵك خۆیان وەڵامەکە دەزانن. بەڵام بە کورتی ڕەخنەکانت شیدەکەمەوە، بەڵکو خۆت تێگەی.

یەکەم: لە بارەی ستالینەوە ئەوە من و لەوە تۆ و ئەوە هەموو خەڵك جارێکم ستایش لە ستالین کرد بێ، ناوی ستالینم بردبێ. ئاخر کاکە من ئیشم بە ستالین چییە؟ کێ شتێکی لێم بیستووە، فەرمووی هەموو ئەوانەی کە بە هەر هۆیەکەوە خەڵك دەچەوسێننەوە و دەیانکوژن من بە خراپیان دەزانم. جا کاکە فەرموو بەڵگەت بدە، ئەگینا فەرمایشتەکەی جەنابت قسەیە. جا ئەگەر تۆ سەلماندت لە هەرجێگایەکدا و بە هەر جۆرێ من لە ستالین ستایشم کردبێ و بە چاك ناوم بردبێ. بەشە گۆشتە برژاوەکەی ئەم نیوەڕۆیەی خۆمت دەدەمێ. بە گیانی مام قادر[1] درۆ ناکەم. با من ئەم نیوەڕۆیەش هەر وەکو جاران بە بێ قەلی برژاو بژیم. بەڵام چونکە هەرگیز شتی وام نەوتووە بە خەیاڵی رەحەتەوە بەشە گۆشتە قەلی برژاوی خۆم دەخۆم. لە بارەی ئەو تاکەشەوە کە فەرمووت، ئەم بەیتە جەنابت سەرنجت نەداوە. ئەگەر تۆزێ بیرلێدەکردەوە دەتزانی هیچکەس لە جیهاندا نییە بتوانێ کورد بە خراپ بزانێ و بە بێقیمەت تەماشایکا، جگە لە شەیتان. تەماشای هەموو شیعرەکەت نەکردووە. ئەو بەیتە هی ئەو شیعرەیە کە خەوێکم دیوە و لەگەڵ شەیتان دەدوێم. ئەوە شەیتانە قسە بە کورد دەڵێ، نەك من. من کوردم خۆشدەوێ لەناوەت جەنابیشت.

---

[1]ـ رەنگە مەبەستی لە بەڕێزشێخ قادری چۆبسە بێت.

لە وەڵامی پرسیاری سێیەمدا دەڵێم: ئەریٚ برا کوا من رەخنەم لە ئیسلام گرتووە و خوانەخواستە لەکویٚ خراپەیەك بە دەم و قەڵەم و بیرمدا دژ بە ئیسلام هاتووە؟ من لە تەواوی تەمەنمدا بێزاری و نارەزایی خۆم لە پیاوی دوو روو دەربڕیوە. وەکو خۆت دەڵێیٚ جلی مەلای (نایینی)م لە بەر دایە و نوێژ دەکەم. خۆیشم وا دەزانم پێغەمبەری خوا (د.خ) هیچ ئۆمەتێکی وەکو من خۆشی نەویستووە. چونکە بە گژ ئەوانەدا چووم کە بە درۆ قسەکانی ئەویان بۆ خێری خۆیان گۆڕیوون و بە درۆ خۆیان کردووەتە جێگەدارى ئەو. جا کاکە گیان ئەوانە وا مەزاخانەیەکیان داناوە و دینیان تێیدا هەراجکردووە و بە هەر قیمەتێك دەیفرۆشن: ئەوانە وا خۆیان بە رابەر و پێشەوا دەزانن، بەڵام نە رابەرن و نە پێشەوا، زەمی ئەوانە و دەرخستنی تەڵەکەو فرۆفێڵیان زەمی ئیسلام نییە، بەڵکو خزمەتە بە ئیسلام. فەرمووت تەناقوز لە شیعرەکانتدا هەیە. تۆ تەناقوز بە چی دەزانی؟ ئەم وشە تیٚ بگەیت و بزانی من چی دەڵێم، ئەو دە دینارە وا خالۆ قادر دەیدا بە میوانەکانی بۆ خەرجی سەفەرەکەمان، دەڵێم بیدا بە تۆ، بە مەرجیٚ دینارەکان هەڵگری و «دە» کە بخەیتە سەر «تەناقوزە»کە، ئیتر ئیشی خۆت کردووە، دەست لەم قسانە هەڵدەگری و دەچیتە سەر

بەرنامەی خۆت، جا کاکە گیان دوور لە رووت، هەرچی پیاوی نەزانە، پێی وایە من شتێکی تازە پەیا بووم، کە چی وانییە. ئەمانە و هەموو ئایین و بیر و راکان هەر ئەوانە دەڵێن، من بە شێوەیەکی سووك و ساکار بە زمانەکەی خۆمان بۆ خەڵکی دەگێڕمەوە. ئەوەتا هەموو کەس پێی خۆشە.

جا هەر ئەو وەڵامانەی کردوون بە گاڵتە و شۆخی و کۆڕەکەی رازاندۆتەوەو دانیشتووان زۆر پێکەنیون کە مامۆستا ئەوەندە بیری تیژ بووە. تەناقوز و حیسابی ئەبجەد و ئەم پرسیارکەرە کە جۆری ژیانی رابوردووی لەگەڵ ئەم تێبینییەی مامۆستادا زۆر دەگونجێ: (دانیشتووان کابرا دەناسن و دەزانن ژنی زۆری هێناوە) سەر سوڕهێنەر دەبێ. مەبەستی قانع لە دە، پیتی (ی)یە کە بە حسابی ئەبجەد دەکاتە دە، بیخەرە نێوان نون و ئەلفی تەناقوزەوە، تەنیا... دەر دەچێت!

## قانع و سووتاندنی دێکان

لەو کاتەدا کە پیلانگێڕان بە فیتەی ئینگلیس، دەیانویست سەرۆك عەشیرەتەکان لە یەك دوور بن و دەوڵەتەکان ناچار بوون پەیڕەوی سیاسەتی بەریتانیا بکەن. بەریتانیاش خێری بۆ کەس نەدەویست، تەنیا بەرژەوەندیی خۆی لە پێش چاو بوو.

بەرژەوەندیی ئەویش هەڵنانیان بوو، بۆ شەڕ کردن لەگەڵ یەکتردا. دەیانوت ئەگەر وا نەبێ ئێمە یارمەتیی سەرانی عەشیرەتەکان نادەین. ئەوان هەروا و ئەمان هەروا، جا لە بەر ئەوە، ئەگەر سەرانی عەشیرەتەکان یەك برایەن و بیانزانیبایە چی دەکەن، ئیتر نەدەبوونە (وجەالمصالحە). جا هەر بەم بۆنەیەوە هیچ کات نەیاندەهێشت سەرۆك عەشیرەکان یەکبن و دەیانکردنە دوژمن. یەکێکیان دەکردە سەرتیپ و ئەویان دەخستە تەنگانەوە و پاش ماوەیەك دەور دەگۆڕا. ئیتر بۆیە ئەم ناوچەیە وای لێهاتبوو. بۆیە گەیشتبووە ئەو جێگە، هۆی زۆری هەیە لێرەدا ناگونجێ باسی بکەین. هەر لە «رۆم» و «عوسمانی» ەوە زۆرویژەکان خۆیان سەپاندووە بە سەر کوردە داماوەکاندا. نموونەیەك لەو پیلانە شەڕێك بوو لە بەینی سەرانی هەورامی کە سەلاتینی هەورامان لە نەوەی بەهمەن سولتان بوون و سەدان ساڵ پێش هاتنی ئینگلیس لە هەوراماندا بێ هیچ شەڕ و شۆڕی ناو خۆ لەگەڵ خەڵکدا بە چاکی و پاکی دەژیان و رەنگە بڵێم تاکە کەسێ لە دەستی فەرمانڕەواکان نارازی نەبووە. بە داخەوە من لە رابوردووی مەریوان نازانم: رەنگە ئەویش وەکو هەورامان بووبێ، ئەوەی کە روونە: هیچ کوردێك بێ فێڵی دوژمن دژی کوردێکیتر نەبووە. بە هەر حاڵ شەڕێکی ناشیرین

لە نێوان هەورامان و مەریواندا روویداوە. دێ سووتان و ماڵی رەش و رووتی مەریوانی تاڵانکرا و چەند پیاوان کوژران بە بێ ئەوەی هیچ خێرێکی بۆ خەڵك بێ. مامۆستا باسی ئەم شەڕ و هەرایەمی لە خوالێخۆشبوو رەزا بەگی بارامـاوا بیستووە. رەزابەگ پیاوێکی ژیر و قسەخۆش و قسەزان و دەرد چێشتوو بوو. زۆر شتی وردی لە بیر بوو، یا بیستبووی. مامۆستا نارەزایی خۆی و داخی لەم شەڕە دەردەبڕێ کە شەڕێکی زۆر بێزراو بووە. تفەنگچی هەورامی دێنە سەر دێی دەرزیان و تاڵانیدەکەن، ماڵ بە ماڵ دەیسووتێنن، خەڵکەکە ئاوارە دەکەن، چەند کەس لەم شەڕەدا دەکوژرێن و دوژمنایەتییەکە دەکەوێتە نێوان هەورامی و مەریوانی.

ئەم شەڕە ساڵی ١٣٤٠ ی کۆچی مانگی روویداوە. من خۆم بۆ ئەم شەڕە لە فایق بەگی زەلکە، کە ئێستا لە سنە دوکانی پارچە فرۆشی هەیە و بە رەنجی شانی خۆی دەژی، پرسیارمکرد. چاکی لێدەزانێ. کوژراوەکانی دەناسێ. بەڵام شیعرەکانی لەبەر نەبوون. بۆیە لە کاك عەلی بۆرێدەری پرسیارمکرد و ئەویش فەرمووی: من هەموو شیعرەکانم لەبەر نین، بەڵام ئەوەی کە لە بیرمە بۆتانی دەخوێنمەوە، جا ئەوە ئێوە و ئەوە شەڕنامەی مامۆستا قانع:

چ خاکێکە بە سەرمانا کراوە

چ ئاوێکە لە بەرمانا رژاوە؟

شەڕی هەورامی و رۆڵەی مەریوان

چ حەربێکە، بە چی ناوی نراوە؟

چ جەنگێکە برای هەورامی مەزڵووم

بەکام شەڕ بوو، دەوای دەردی کراوە؟

بە کام تاوان هەژاری «دەرزیانی»[18]

لە رێی کێدا بووە خوێنی رژاوە؟

زەخیرە و رەنجی ساڵانی لەدەس چوو

لە بەر چی ماڵ بەماڵ سووتێنراوە؟

مەڕ و ماڵات لە کلپەی ئاگری شەڕ

بە زیندوویی چلۆن برژێنراوە؟

کوڕی هەورامی پڕ تین و ئەوینم

بە دەستی کام برای خنکێنراوە؟

لە رێ کاروانی هەورامی بە دیلی

لە بەر چی؟ بۆ حوزووری کێ براوە؟

شەڕی دووکەس لە یەك ماڵا لە بەر چی؟

چ تۆمێکە بە پیسی چێنراوە؟

شەڕی کێ بوو؟ بە دەس کێ بوو لە بەر کێ

مەڕی کام ماڵە کوردە جووتە زاوە؟

١٨ـ دەرزیان دێیەکە لە دێکانی مەریوان، دوو کیلۆمەتر لە شارۆچکەی کانی دینارەوە دوورە.

بـــــە دەستوور ........... کۆنە لۆتی

چ خـــوێنی کوردە بـێقیـمەت رژاوە؟

دە بـەسیە کاکی زاڵم بەسیە تا کـەی؟

تـــەماشـاکـــە زەمـــانە گـــــۆڕدراوە

مـــــــەریوان مـــامەیە و هەورامی لالۆ

چ پیـــــلان و چ داوێـــکە نـــــراوە؟

هەتـــا ئـێستا شەڕی نێو دەوڵەتان بوو

کـــەچـی ئـێستا شـەڕی مـــاڵان کراوە

شـەڕی ناحەق بە سەر کـــوردا سەپاوە

ســـــکی کـــــوردە لە مـەیداندا دڕاوە

هەزار لەعنەت لە شەڕخوازی زەمـــــانە

ئـــەوەی لای خـوا لە شـەیتانێ کـــراوە

لـە خێر و خۆشـی کوردە بێ نەسیـــبی

مـوبـــــارەك بێ لە شەڕ سەهمت دراوە

شەڕی بەین دوو برا ئەقڵەن مەحاڵـــــە

بـــرا کوشتـــــن چ پیـس و بـێزراوە!

بـە وەڵڵا کورد شەڕاشۆ نەبووە هەرگـیز

هـــــەمیشەی خـوا شەری پێ گێڕدراوە

نە هەورامی و مەریوانێ بە یەك بوون

بە پیر شـــالیار قەســەم مەجبوور کراوە

بە ڕۆحی کابل و شێخ ڕەش قەسەم بێ
مەریوانیش بە گۆچان نێردراوە
کەسێ گەر نەچووە بۆ سووتان و تاڵان
بە ئەمری ئاغەکان تێی هەڵدراوە
لە زنجدایە، لە ناو بەردا لە گەوڕا
بەرەو مەیدانی شەڕ دەرهێنراوە
ژن و خێزان و ئەولاد و عەیاڵی
بە بێ ڕەحمی لە ماڵی دەرکراوە
کەسێ ملکەچ نەبوو بێ ڕوو بە مەیدان
سەری چوو سەروەتی تاڵانکراوە
دەزانم بەسیە وازبێنە لە بەر چی
سمێڵی پیاوەتیت قرتێنراوە؟
دە چەوساوەی ئەسیری کۆت و زەنجیر
بزانە بابی تۆ چی پێ کراوە؟
هەتا کەی نابڕی زەنجیر و دەسبەن
سەدان ساڵە لە دەستی تۆ نراوە
تەمایەر بیت کە دەورانێکیتر بێت
نەجاتت بێ لە دەستئەمچەشنەڕاوە؟
خوا فەرموویە بۆ خۆت بێرە مەیدان
بزانە کۆمەکی ئەو بێ حەساوە

کە خۆت رازی بە هەر دەرد و بەڵا بی

دەفەوتاوی بە دەس دەرد و بەڵاوە

کەخۆت فشکرد هەتا بارت لە سەر نێن

بە بێرەحمی قەیاسەت کێشراوە

لە نێش و دەرد و ئازار بێزوانان

بزن بارە و پشیلەیش هەر میاوە

برا خۆ تۆ زوان و قوڕگ و دەنگت

هەیە و بۆ بانگەوازت دانراوە

دە هاوارێ کە کاتی دەردە داریت

کە هاوارت لە دنیا دەنگی داوە

لە بەر مەزڵوومی تۆ گشت دێنە هاوار

چ هاوارێ؟ وەکو ساجی زڕاوە

دە بڕوانە برا چاوت هەڵێنە

هەمووی دونیا وەکو ئێرە نەماوە

ئەبێ رۆژێ ببینم سەروەری کورد

لە هەر لا ناوی کوردە و قاوە قاوە

دەبا پەرژینێ قایمبێ لە رووتان

حەیا و شەرمەم بە جارێ نایە لاوە

ئەوەی خایەن بە کورد و کوردستانە

دەزانم زۆڵە، دایکی .................

بەیەك هیمەت، هەموو هەڵسین بە یەکجار
برا ئێستاکە نۆبەی خووگەڕاوە

دە خان خانی و عەشایەربازی بەسکە
دەهۆڵێ بوو. درا، دەنگی نەماوە

ئەگەر دنیا هەمووی بەش بەش جیابێ
بەشی ئێمە لە دۆڵاش تا پزاوە

منیش بێبەش وەکو باقی هەژاران
دەیان ساڵە ئەویش داگیر کراوە

ئەگەر رۆژێ بە ئاواتێ گەیشتین
دەزانم ماق قانع. هەر خوراوە

## ئوسا عەلی و شیعرێکی نەناسراو

ئوسا عەلی نادری

خوالێخۆشبوو ئوسا عەلی نادری هەبوو خەڵکی بۆرِیدەر بوو، هاتبووە دەوری «دەرەتفێ» و «کانی‌سانان» لە بەر بێکاری ناچار بووبوو بە بەرگدوور و بە ئوسا عەلی خەیات ناوبانگی دەرکردبوو. لەم ئاخرەدا ماڵی چوو بۆ شاری مەریوان. پیاوێکی سەخی، قسەخۆش و پیاوانە بوو. خزمەتی خەڵکی زۆر دەکرد، لەگەڵ دادە رەعنای خێزانیدا کە ئەویش ژنێکی کوردانە و لێهاتوو و میواندار و

ماندوونـەنـاس بـوو. بـبووە دایکـی ئـەو منداڵانانـە کـە لەبـەر بێەدەرەسەیی ناچار بوون بۆ خوێندن لە دێوە بچن بۆ شار.

هـەر سـاڵە چـەند کـەس لـەماڵیاندا دەیـانخوێند. ئـەم دادە رەعنـا و ئوسـا عەلیـە وەکـو ئـەوە خزمـەتکاری بـێ حـەق وابـوون. دەسـتەیەك مـیوان دەھـات و دەسـتەیەکیتـر دەچـوو، هـەرگیز هـیچ کامیان رویان گرژ نەدەکرد.

ئوسـا عـەلی زۆر شـێ دەربـارەی مامۆسـتا قـانع دەزانـی و شـیعری ئـەوی زۆر لەبـەر بـوو. شـیعری شـەڕی مـەریوان و هـەوراماان و شـیعری مـەولانا عـەلی کـە بـۆ خواڵێخۆشـبوو مـەلا عـەلی، کـە یـەکێ لـە مامۆسـتاکانی ئەو سـەردەمـە بـوو نووسـیوە. هـەر وەھـا شـیعری دارمـازوو و قـەزوان و پـەرۆ شـڕەکە. دەڵـێ دار مـازوو و دارقـەزوان بـۆ ئـێوە شـین بـوون و رواون، بـۆ ئـەوەی بـە سـەمەر و دەرامـەتتان نـەداری نـەھێڵن و هـەرگیز بێکـارە و مفتـەخۆر نـەھێڵن. کـێ پەڕۆیـەکی پـاکردن و لەبـەر سـێبەرتاندا دانیشـت بـۆ مفتـەخۆری؟ کـێ بـوو کـوردی فێـری مفتـەخۆری و مفتـەدەری کـرد؟ شـیعرێکی زۆر جوانـە. بـەڵام مـن نایانووسـم لـە بـەر ئـەوەی رەنگـە ببێتـە هـۆی دڵێشـانی بـڕێ لـە بنەماڵـەکانی مـەریوان. مـنیش بەسـەریاندا رادەبـوورم، ئـیتر هـەر وەکـو بـاقی گـەنجی ژێرخـاکی وڵات وندەبـن و کـەس دڵـی ناھێشـێ. هـەر ئـەم

وەستا عەلییە شیعری شاعیرانی‌تری لەبەر بوو. هەرچەند نەخوێندەوار بوو بەڵام زۆر زیرەك و زۆر بیرتیژ بوو. رەنگبێ دوو سێ كتێب شیعری لە بەر بووبێ. ئەم شیعرەی خوارەوەی لە بەر بوو، پێی وا بوو هی مامۆستایە و دوای بڵاو كردنەوەی شیعری «مینالێ» كێشە كەوتووەتە نێوان «ناری» و «قانع» و مامۆستای دەرەتفێ. مەلایەك لە پێنجوێن كە ناوەكەی نازانم و لە بیرم نەماوە ئەم شیعرەم بۆ خوێندەوە. بۆ ئەوانەی لەو دەورەدا كە شیعری مامۆستایان بیستووە، بە تایبەتی بەرێز مەحموود بەگی حەیدەری كە پیاوێكی زیرەك و راستوێژە و وتی هی قانع نییە، هەر وەها شیعرەكە تێكەڵە وەكو دوو شیعر بووبێ و تێكەڵاو كرابێ. جا هەر چیم كرد بۆم راستنەبوەوە و بۆم جیانەكرایەوە. دڵیشم نەهات لایبەم. بە ناوی شیعری قانعیشەوە بڵاویناكەمەوە. لە بەر فەرموودەی وەستا عەلی و نە وەك هی ئەو بێ دەینووسم. وەستا عەلی زۆر بە راشكاوییەوە وتی هی قانعە و بە زمانی یەكێكەوە نووسیویەتی. هەر وەها وتی لەمانە زۆرتر بوون و لە بیرم نەماوە. ئایەت و حەدیسی رەق رەقی زۆری تێدا بوو، بۆیە لەبەرم نییە. جا هی هەر كەس بێ شیعرە و كوردییە، شتی چاكی تێدایە و حەیفە بفەوتێ، بەڵكو كەسێ ئەم شیعرەی هەبێ و بۆمان روونبكاتەوە. لە دوایدا كە نیشانی مامۆستا وریا قانعم دا

فەرمووی: لەو باوەڕەدا نیم ئەم شیعرە هی قانع بێت. جا کە وا بوو هی قانع نیە و لە بەر فەرموودەکەی کاک عەلی بلاویدەکەمەوە. تا بەلکو کەسانێ بزانن شیعری کێیە و بۆمانی راستکەنەوە.

ویرد و تەهلیلە و تەحیات و زیکرم
دەرس و تەئلیف و تەحریر و فیکرم
ئارەزوو و ئامانج، هۆش و گۆشەکەم
خەو و خۆراك و عەیش و نۆشەکەم
بۆ مەنعم ئەکەن مەلام و پیرم
عالمم ناگام، ئەفامم زیرم
ئەوانەی ئەکەن قسەی خۆڕایی
تۆی مودەڕیس و مەلای ئاوایی
نازانن کاکە دوور لە شعوورن
لە وادی عیشق و موحیبەت دوورن
دەسبەردارم بە، وازم لێ بێنە
مەمهێنە قسە و دەنگم دەر مەهێنە
کام دەردەناسێ دەردم ئەزانێ
ئەم بارەی عیلم و عیشق ئەتوانێ
برام هیچ زیرێ لۆمەی من ناکا
ئەگەر کەسێ بوو تەجاهول ئەکا
سوقرات، ئەرەستوو، حوکەمای یۆنان
عیلمی سەرف و نەحو، بەدیع و بەیان

تـا ئێـرە دیـارە چـەند بـەیت لــە بـەین بەیتـەکاندا نـەماون، یـان جێگۆڕکییان پێکراوە. پاشـان دەگاتە باقی شـیعرەکە:

هەر بە منداڵــی بۆ حوجرەی فەقێ
قـەناعەتکردن بە نانــــە رەقــێ
هەڵوام نان و دۆ ، شــەربەتم ئاو بوو
گاڵ و جۆم لە جێی گۆشت و پلاو بوو
من هەرچی رەنــج و زەحمەتم کێشا
چــەن شەو نەخەوتم لە دەرد و ئێشا
بەو هــەموو ئێش و دەرد و ئـازارە
کە من چەشتوومە لـــەم رۆژگارە
علیم و مەعریـفـەت، تەجروبە و زانین
هـەموویان فێر بووم بە گوێرەی توانین
ماوەی تەمەنم خــەریکی چی بووم
هەمووی بەتاڵ بوو ئەوەی کەدیبووم
ئێستا تێدەگەم هــەر کا و بایەك بوو
چیم بە دەس هێنا هەر هەوایـەك بوو
هەر نەزانی بوو ، هــەر بێ ئـــاگایی
گا بیری شــەکر و گا بیـری چایی
هــەرچی رەنجــــەمدا زۆر تر بزانم
تـــازە تــێگەیم کە هیـــچ نازانم
فەلسەفە و مەنتیق چییان کرد بۆ مـن
لێم بوون بـە ئافات هەر وەکو دوژمن

ئاخ چەندە دوور بوو ئارەزوو و ئەمەل

پەردەکەی گاران دارەگـــەی سەرکەل

کە تێگەیشتم زۆر دامام بۆ خـــۆم

ھەتا کـەی جێــوی نەزانی نەخۆم ؟

کاکـــە لە جیاتی ئـەم دەردی سەرە

لەم دنیـــا پیسـەی بێسـەر و بەرە

ھەر لە منداڵـــــی هـــەتاکو ئێستا

کەمەری هیـــــمەت مەردیمان بەستا

نەسیر نەفسانەی ھەوەس نــــەبوایەین

بە راســـــی حـــاڵی لە زین بوایەین

لە فیـــکر و خـــەیاڵ گەنجی و .....

لــە پەلـــەقاژەی جۆگەلەی زینـــا

خۆم نەدۆزیۆ نەمـــــزانـــی من کێم

لــە کوێ ھاتووم و کامــە شوێن و جێم

خۆ ھەر گیانداری نەخوا و نەخەوێ

تەمــــەنی نەڕوا و پـــەکی ناکەوێ

یەك نانی گەنم یـــــەکێ تر قەڵاس

نــەمیان حەریر و ئــــەوی‌تر پەڵاس

ھەر کام تەمەنی جـــۆرێ بردە سەر

یەکێ بە خۆشی یەکـــێ دەردی سەر

ئێستا تێگەییم چۆن دەڕوا تــــەمەن

بە ھۆقە و ئیزرەم بە تەنەکە و مەن

یەکێ ئەکێشێ و یەکێ ئەپێوێ
یەکێ سوکنا بوو یەکێ ئەدێوێ
ئەمانە هەمووی وڕێنە و بەهانە
هەڵووك و تۆپی دەس منداڵانە
من خۆم ئەزانم چیم لێ قەوماوە
منیش هەر وەك تۆ رێم لێ گۆڕاوە
هەر وەکو کەسێ سەری با لە سەنگ
لە سەری لاچێ مەستی و شێتی و مەنگ
جا ئێستە خەریك شوکرانەی خوام
لە خەوی غەفڵەت زوو داچڵەکام
حاڵیم بوو ژیان هەر ئەمە نییە
هەر فلس و عانە و هەر درهەم نییە
ئەر دڵی ئینسان عەرشی خوایە
کەی جێگای عەمر و زەیدی تیایە؟
گەر ئینسان ماواو جێگەی خۆی ناسی
کەوتە سەر رێگای راسی بە راسی
ئەبینێ هەیهوو جێگای زۆر بەرزە
یەکجار بچووکە ئەم کورەی عەرزە
لە کوێوە هات و بۆچی هاتووە
بانگی ئیرجیعی لە کێ بیستووە ؟
جا تێدەفکرێ ئەگەر دەرکی هەس
ئیدای فادخلی فی عبادی بەس

ئەم هاوارەی بیست لێشی حاڵی بوو
مێشکی لە هەر چی پووچە خاڵی بوو
لە قەید و بەندی دنیا و مافیها
بە هەشت و خۆشی هەرچی و اتێدا
کە رزگاری بوو نەحەسێتەوە
لە سەرمەقولات نەوەستێتەوە
جا ئیتر لایەق الی ربها
ناظر و ناظر کەون و مافیها
هاوار و لاڵە و دۆعام دەم بە دەم
ئەمەم دەسکەوێ لە دەستی نەدەم

مامۆستا مەلا عەلی مەلا عەبدوڵڵا

## قانع و شێخێک

مامۆستا مەلا عەلی[1] گێڕایەوە و فەرمووی:
جارێکیان لە سەی سادق لە ماڵی مامۆستا مەلا ساڵحی سەی سادقدا میوان بووم. مامۆستا قانع

---

١- خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عەلی پیاوێکی خوێندەوار و ئایینپەروەر بوو. لە بنەماڵەی «حاجی مەلا نەزیر»ی لەوێڵەیی بوو. زۆر جێگای کوردستان گەڕا و گوێزاوگوێزی زۆری کەوتۆتە بەر. شیعر و نووسراوەی زۆری هەیە کە بە داخەوە لە چاپ نەدراون. لە مانگی گوڵانی ١٣٤١ای کۆچی مانگیدا لە دنیا دەرچووە. ئەم گەورە پیاوە کوڕی «مەلا عەبدوڵڵا»ی «خاتوو ئەسما»ی بەناوبانگە، کە بەپاز و دەستنووسەکانی بەڵگەیە بۆ مێژووی کورد، بە تایبەت هەورامان. نووسەر بۆ هەورامانناسی کەڵکی زۆری لەم بەپاز و دەستنووسانە وەر گرتووە.

بیستبووی لەوێم، بە هۆی خزمایەتی و خۆشەویستییەك کە لە نێوانیاندا هەبوو، هات بۆ لام و مامۆستا شەو نەیهێشت بڕواتەوە. شەو جارجارە لە سەر باروودۆخی ڕۆژ لەگەڵ مامۆستادا دەکەوتنە کێشە و باسەکەیان بە درێژی و وەکو جەدەلی لێدەهات. زۆربەی باسەکان باسی بیروبڕوا و ئایین و شیعرەکانی مامۆستا بوو.

مامۆستا مەلا ساڵح فەرمووی: تۆ هێندە باسی خوا و پێغەمبەر و ئەوانە دەکەی، وا دیارە بڕوات بە ئەولیا و شێخ و تەریقەت و کەشف و کەرامات نییە؟ ئەویش بە وردی و لەسەرخۆ، وەڵامی دەدایەوە و لەوانە فەرمووی: ئەگەر تۆ بڕوا بەوە بزانی من دەسەر داوێنی شێخ ... ی هەڵەبجە بیم و دەستی ماچکەم و لێی بپاڕێمەوە کە ببێتە هۆ لە بەینی من و خوادا و من هەر داواکارییەکم ببێ، ئەو بە خودای بگەیێنێ و چونکە من دەنگم نایگاتێ و من بۆ هەر شتێکم بچم بۆ خزمەتی ئەو داوا بکەم، ئەو بۆم بڵێ بە خودا و بەڵکو بۆم جێبەجێ بێ یا فێرم کا، چۆن بژیم، کاکە من ئیشی وا ناکەم. من ئەو و ئێوانەی وەکو ئەو وان بە دژی ئایین و ڕەوشی بەرزی مرۆڤایەتی دەزانم و من پێم وانییە ئەگەر ئیماندارێك نەچێ بۆ لای کەشف زانێك یا ئەگەر کەشفزانێك نەبێ دەستی پێوە بگری شتێك دەفەومێ.ئاخر برا شێخ... چونکە کوڕی شێخ... لە بنەماڵەی ... بووە خۆی کردووە بە خاوەنی ئایین و... بۆچی قورئان و حەدیس نراونەتە لاوە و ئەم کابرایانە جێگاکەیان

گرتوورنەتەوە و چۆن رەوایە کۆمەڵی چەوساوە بخرێتە شوێنی ئەمانە و بۆ هەر کوێ کە بیانەوێ رایانکێشن؟

منیش وەك مامۆستا بڕێ رەخنە و تێبینیم بوو لەسەر ژیان و کردەوەی، بەڵام مامۆستا وەڵامی من و مامۆستاشی دایەوە و بە بەڵگە سەلماندی کە پیاوێکی ئاینپەروەر و لە خوا ترس و دڵسۆزی خەڵکە و قسەی پڕ و پووچ و دروستکراو خراوەتە شوێنی، جا من خۆم چونکە ئەو شێخە کە ئەو ناوی برد، رقم لێی بوو، بە باشم نەدەزانی پێم خۆشبوو مامۆستا بە چاکی نەدەزانی و رەدی دەکردەوە.

## قانع و زەماوەند

مامۆستا حەمە یوسف گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان مامۆستا قانع لەگەڵ خاتوو ئەمنەی خێزانی بە لای زەماوەندێکدا تێدەپەڕن کە هەردووکیان پیر و بەساڵا چوون. مامۆستا بە عادەتەکەی خۆی کە زەردەخەنە دەخستە سەر لێوی ئەوانەی کە دیاندی، تەنانەت لە شایی و زەماوەندیشدا کە خەڵك خۆشحاڵن و هەڵدەپەڕن، دەیویست خۆشحاڵتریان بکات و شادییەکەیان شیرینتر بکات، لە شاییەکەدا دەپرسێ: ئەم زەماوەندە هی کێیە؟ دەڵێن: هی ئەم برادەرەیە. ئەویش دەڵێ: ئەمە زەماوەندی تۆیە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ قوربان. دەڵێ: کاکە منیش وەکو تۆ ئەم بەزمەم گێڕا، ئەم خەڵکەم

هەڵپەڕاند و ئاوەها جەنجاڵێکم ساز کرد، بەڵام عاقیبەتەکەی ئەمە بوو کە دەیبینی. دەست دەکێشێ بۆ خاتوو ئەمنە و دەڵێ: ئەمە نەتیجەی ئەو هەموو جەنجاڵە بوو کە من گرتم، جا ئیتر خۆت دەزانی. خەڵك دەست دەکەنە پێکەنین و دەزانن مامۆستا ئەیەوێ نیشان بدا بە هەموو کەسەوە نزیکە و شەریکی شایی و شیوەنی خەڵکە.

## قانع و حافز

**دیسان کاك عەلی گێڕایەوە و فەرمووی:**

لە سلێمانی لەگەڵ نابینایەك قسە دەکا. نابیناکە دەڵێ: قانع من چیم کردووە، خوا غەزەبی لێگرتم کوێریکردم؟ ئەمە زوڵم نییە خوا لە منی کردووە؟ قانع دەڵێ: من بەخیلی دەبەم بە تۆ کە چەندی خۆشدەوێت و کوێری کردووی. غەزەبی لە من گرتووە ئەم چاوە مژمۆڕانەی داومێ. نابیناکە سەری سوڕ دەمێنێ. مامۆستا دەڵێ ئەگەر وەکو من بوویتایە، ڕۆژێ چەند جار خێزانەکەت بدیایە، بە «درەوش» چاوی خۆت هەڵدەکۆڵی تا نەیبینی. خوا غەزەبی لە من گرتووە نەك لە تۆ. کابرای نابینا زۆر پێدەکەنێ و سوکنایی دێ.

## قانع و سەی نەجمەدین

سەی نەجمەدین کەلجینی پیاوێکی دیندار و لە خوا ترس بوو. زەمانە و نەداری گەیاندبوویە پێنجوێن و خێزانی مردبوو، ئیتر ژنی نەهێنا بوووە. تەنیا کوڕێکی هەبوو. لە دوای چەند

ساڵ فێری سۆرانی نەدەبوو، لەگەڵ هەورامیدا تێکەڵیدەکرد و شتێکی لێ ساز دەکرد. بۆ هەر کەس قسەی بکردایە. پێدەکەنی و کەم کەس لە قسەکانی تێدەگەیشت. دوکانە چکۆلەیەکی هەبوو شتی تێدا دەفرۆشت. کاسبی سەر پێی و هەموو جۆرە ئیشێکی پیاوانەی دەکرد. خەڵك زۆریان خۆشدەویست. زۆر پاك و بە دڵ چوو بوو. مێزەرێکی سەوزی بە تەقەڵ لکاندبوو بە کڵاوەکەیدا کە تۆزێ قووچ بوو، پێیان دەوت «تانج». زۆر زیت و لێهاتوو بوو. جار جارە ئیش و کاری مامۆستای هەڵدەسووڕاند. ماست و دۆ و نان و داری دەکڕی بۆ ماڵی مامۆستا. سەی شەمسەدینی برای، کە ئێستە، بەپێی فەرموودەی خۆی تەمەنی (١٣٥) ساڵە و لە مەریوان دادەنیشێ، فەرمووی:

ئەم سەی نەجمەدینە رۆژێ پاش نوێژی بەیانی کە هێشتا تەواو رۆشنی نەکردبوو چەند نانی گەرم دێنێ بۆ ماڵی مامۆستا. تەماشا دەکا مامۆستا هێشتا خەبەری نەبۆتەوە. خاتوو ئەمنە لە سەر بەرماڵە و خەریکی نوێژە. سەی کە ئەمە دەبینێ ماتدەبێ و مامۆستا خەبەری دەبێتەوە. خاتووئەمنە دەپرسێ: ئەرێ بۆ ماتی؟ دەڵێ: هیچ. خاتووئەمنە هەر دەڵێ: چی بووە؟ مامۆستا بە ژێری تێدەگا مەسەلە چییە. دەڵێ، ئەگەر ئەم نانە دادەنێ، بێدینێك دەیخوا کە هێشتا نوێژی بەیانی نەکردووە، ئەگەر دەیباتەوە، ئەوەی لە سەر بەر ماڵە لە نانی گەرم بێبەشە، سەی نەجمە دەڵێ: ئەرێ بە خوا چاکت زانی. دەڵێ دە باشە بەشەکەی خاتووئەمنە

و منداڵەکان دانی و بەشەکەی من بەوە. منیش لە قینی تۆدا نوێژی ئەم بەیانییە ناکەم، خۆ دەبینی هێشتا زووە و نوێژ ماوە. لە ڕۆژی دوایدا کە خوا پرسی بۆ نەتکرد، دەڵێم تۆ بە هەر چی بێدین و نوێژنەکەر و کافرە رزق دەدەی. سەی نەجمە بۆ تەنیا نوێژێك نان بە من نادا. سەی نەجمە دەبینێ راستەکا و ئێژێ ها ئەوە نانەکە. مامۆستا دەڵێ: نەخێر تازە من رقم هەڵساوە و لە داخی تۆدا ئەم بەیانییە نوێژ ناکەم. سەی نەجمە هەر چی دەپاڕێتەوە بڕا هەڵسە درەنگە خەریکە نوێژەکەت دەچێ، مامۆستا دەڵێ: نەخێر تازە من رقم هەڵساوە و لە داخی تۆدا ئەم بەیانییە نوێژ ناکەم. سەی نەجمە وەفرەی لێ دەبڕێت. ئەگەر مامۆستا ئەم نوێژەی نەکا ئەو وەڵامی خوا چی بداتەوە؟ دەڵێ: هەڵسە نوێژەکەت بکە، تەنیا روبعە دینارێکم هەیە دەتدەمێ، لەو کاتەشدا روبعە دیناری زۆر بووە مامۆستا دەڵێ: جا من بە روبعە دینارێك خۆ دەنێمە ناو ئەو ناوە ساردە؟ سەی نەجمە دەڵێ: دەی باشە بە چی رازی دەبی؟ دەڵێ: ئەو روبعە دینارە بدە بە سەر و پێ و پاکەتێك و کیتەڵەیەك ماست، بیهێنەوە. دەڵێ: بە سەر چاو. مامۆستا دەستدەکا بە دەستنوێژ گرتن و سەی نەجمەش دەڕوا سەر و پێ و ماست و پاکەت دەکڕێ و دێتەوە. نانی گەرم و سەر و پێ و جگەرەی غازی و ماستاو بە

شوێنیدا، نانێكى چاك دەخۆن و مامۆستا دەڵێ سەی ئەجە ئەگەر ئەم نوێژەم نەكردایە چیت دەكرد؟ دەڵێ وەڵڵا هەرگیز مەرحەبام نەدەكردى. مامۆستا بە عادەتەكەى خۆى كە بڕێك بەسەر هاتى دەكردە شیعر، ئەم شیعرەى خوارەوە دەنووسێ:

بەداخەوە سەراپا شیعرەكەم دەستەكەوت.

خوایە كارەكانت زۆر بێ قوسووورە

بەڵام ئەم تۆیش وەكوسەى نەجمە سوورە

بە خاتر دوو ركات نوێژى بەیانى

سەر و پێ و ماست وپاكەت، نانى هانى

لە بەر هەر نوێژێ تۆیش هێندەت بدایە

خەڵاتى نوێژى رۆژى ئەمونە بایە

هەموو بەرماڵ دڕابوو ، بەرد سوابوو

لە بەر تەزبیح دەنك قەزوان نەمابوو

نەرێنى لاڕێ ، نەرێنى هارى نەرێنى چەوت

هەموو دنیا دەبوویە ماڵى مزگەوت

تەماشاكە چلۆن سەید لە بەر تۆ

لە تاریكى بەیانیدا تەپوكۆ

خەریكى كار و بارى خەڵك و خوایە

نەڵێى قەرزى هەموویانى لە لایە

منى بێچارە هەر كارم سوپاسە

لە تۆو سەید ، لە هەركەس كارى واسە

یەکێ وەك مــن لە بەر باری نــەداری
لـــە بەر ئەم کارەساتە بەرد ئــەباری
ئــەگەر پاداشی دەردی مـن بە شایێن
لــە تایەکی تــرازووی عـــەدلی دانێن
بە هەشتی خوابەخوا هێشتا کـو سووکە
لـــە ئەو تاکی تــرازوودا بچــووکە
کــە چەن قورســـە خــواباری گرانـم
منی قـانع، چـلۆنە نــەیتوانم؟!

## قانع و سەعی بەگ

لە پێنجوێن سەعی بەگێ هەبوو پێیان دەوت «سەعەی حەمل بەگ» پیاوێکی چاك و خۆش مەشـــرەب بـــوو، مــەلا و خوێـــندەواری خۆشدەویست. زۆر قسەخۆش و نوکتەزان بوو. جل و بەرگی جوانی لە بەردە کرد. دنیا پشتی لــێ هــەڵکردبوو، نــەداری رووی تێکــردبوو.

سەعی بەگ

نەیدەزانی چی بکا. هەر کارێکی بۆ ژیان دەکرد نەیدەگرت. ئەم کاك سەعیدە هەمیشە لای مەلای گەورە و پیاوە بەرزەکان دادەنیشت. لەگەڵ مامۆستا قانعدا بەینی زۆر خۆشبوو، لـە قسەدا زۆریش پێکەوە نەدەسازان. سەعی بەگ بە مەنی خۆی دەپێوا و مامۆستایش بەیرەو و

پرۆگرامی خۆی. رۆژێك سەعی بەگ دەڵێ: مامۆستا ئەوە تۆ بۆ لەگەڵ.. بەینت شێواوە؟ دەڵێ: وەڵلا کاکە سەعی ددانی دەر هێنا بوو، جۆرێ قسەیدەکرد من لێی نەمتوانی لەگەڵیدابم. سەعی بەگ لەمە تێناگات و ماوەیەك تووشی هەر کەس دەبێت و لە هەر لا باسی مامۆستا دەکرێ دەڵێ: مامۆستا عادەتێکی خەراپی هەیە، هەر کەس ددانی کەوت ئیتر لەگەڵیدا نادوێ. هەتا رۆژێ سەعی بەگ حاڵی دەکەن ئەمە قسەیەکی کۆنە و مەسەلە وایە. سەعی بەگ ئەم گاڵتەو شۆخییەی مامۆستای گرتبووە دڵ و رەنجا بوو، لای موفق توونچی ئەم شکایەتەی کردبوو. موفق دەڵێ: کاکە سەعە ئەم قانعە سەییدە و لە سەییدەکانی دۆڵاشە، بچۆ بۆ لای و ئەم شیعرەی بۆ بخوێنەوە. جا کە سەعیبەگ دوای ماوەیەك زۆر مامۆستای نەدیوە، هەر لە دوورەوە دەڵێ: مامۆستا من لە تۆ تێنەگەیشتم، جا کە تێگەیشتم ئیتر خەریکبوو شێت بم. ئەوەتا وەڵامم بۆ هێناوی لە قسەکەی تۆ خراپترە، مامۆستاش دەفەرموێ: سەعەگیان ئەمە قسەی موفقییە.

هـــــۆ بـــــاواسەی کۆنــــــە دۆلاشی

دەر بە دەر کراو ئـــــاشەوان بـــــاشی

مــــەلای راکـــردوو ئـــــاوارەی دەردان

سەر قافڵەی گـــرۆی هەناسە سەردان

ئـــــاوارەی وڵات، راکردووی هــــەدەف

رێگە لێگیراو لــــــە هەر چوار تەرەف

ئاگا بە ئەحواڵ دەردی بێدەرمان
تەماشات دەکەم دەمرم لە شەرمان
ئاخر کام ئینسان وەکو تۆ وایە؟
غەیری تۆ هیچکەس دەنگی دەرنایە
هیچکەسێ گیانی نەمایە لاوە
وەك تۆ کێم دیوە بە رووی دنیاوە؟
هێندە زوانی خۆت بۆ رانەگیرا
غەرقی لە دەریای ئەندیشە و بیرا
فەرمووتە کە کەوت دیهاتی ...
دەمی خاڵی بوو جا نەبێ ...
جەنابت ئاگات لە خۆتان نییە
چاك گوێم بۆ بگرە بزانە چییە
سەیی ئەو پرچی ئێوەش بتاشن
بە کوردی گورگی پشتی دۆڵاشن
فەرقیان چییە؟ گورگ و سەگ برا
هەر کامیان جۆرێ ناویان لێنرا
خۆزگە ،چرچیل، یش سەگێ بوایە
............................... کردایە
بەس بۆ مەزاحە باسی گورگ و سەگ
تەنیا بە خاتر لالە سەعی بەگ

ئەم شیعرەم نووسی بۆ دڵدانەوە
بۆ لا چوونی شەڕ ئاشتیدانەوە
کاکە گیان هەموو شۆخی و مەزاحە
ئیهانەت نییە ئەمری مەباحە
مەزاح و شۆخی شتێکی جوانە
خوو و خدەی پاکی ئێمەی کوردانە
لە ناو ئێمەدا بووە تا بووە
هەزاران ساڵە بەرپێوە چووە
قانع ناوی تۆ هەمیشە بەرزە
هەزار وەك موفتی دێنێتە لەرزە

## سەعی بەگ و قانع

هەر ئەم کاك سەمەیە گێڕایەوە و وتی:

چووم بۆ لای مامۆستا، وتم فریامکەوە. هیچم بۆ ناکرێ. نە پارەم هەیە و نە دەرامەت. ناتوانم بژیم. مامۆستا هەرچی بیریکردەوە بە جێگایەك نەگەیشت. زۆری خەفەت بۆ خواردم. نە پارەی هەبوو بمداتێ و نە دەیتوانی بە خێومبکا. زستانیش بوو، زستانێکی ناخۆش. دوای چەند جار رۆیشتن بۆ لای مامۆستا وتم بیرمکردووەتەوە ئەم زستانە بچمە بەندیخانە تا بەهار. نازانم چ بکەم عەیب نەبێ و ئابڕووم نەچێ. دزی و حیزی و جاسووسی و ئەمانە هەموویان خراپن. لە مەجلیسەکەدا کابرایەکی ژیر

دانیشتبوو، وتی: تووتن زۆر قاچاخە بە هەر کەسەوە بیگرن تووتنەکە دەبەن و بە ئەندازەی پارەی تووتنەکە جەریمە دەکرێ. وتمان فکرێکی چاکە بەڵام لە کوێ تووتن بێنم؟ مامۆستا فەرمووی من برێ تووتنم هەیە بیبە. وتم خۆت چی دەکەی؟ وتی خوا پەلك ناخا. منیش تووتنەکەم حیسابکرد، جورمەکەی ئەوەندە بوو تا بەهار لە بەندیخانە دەمامەوە. خۆشی خۆشی تووتنم گرت بە دەستەوە بە بازاردا دەستمکرد بە گەڕان و پاش چەند رۆژ نەگیرام. لە پشتەوە سواری پیکابێك بووم. بۆ سلێمانی و هەتا ئەوێ کەس نەیوت ئەوە چییە. لە سلێمانی تووتنم فرۆشت. پارەی تووتنەکە چەند بوو لەوەندە خێری کرد. هاتمەوە هەموو پارەکەم دا بە تووتن، وتم با زۆر بێ و زۆر لە بەندیخانەدا بێنمەوە. تووتنم هەڵگرت و هەرچی تەماشامکرد پۆلیس بیگرێ هیچ خەبەرێ نەبوو. گەیشتمە سلێمانی و فرۆشتم. دووبارە هەموو پارەکەم دا بە تووتن. ئەمجارەش کەس نەیوت کەرت بە چەند. پارەیەکی زۆری تێدا بوو. فیکرمکرد ئەمە ئیشێکی چاکە بۆ بچمە سجن. برێ لە پارەکەم خستە باخەڵمەوە و برێکیشم دا بە تووتن. ئەمجار بە ترس و لەرزەوە خوا نەیگرن، خوا نەیگرن، بردم. گەیشتمە پاڵ شار. پۆلیس پێیزانی و لێمیان گرت. هەر چی هاوارمکرد فایدەی نەبوو بردمیان بۆ

پۆلیسخانە. تووتنەکەیان برد و حسابیان کرد جەریمەکەی دەیکردە ئەوەندە. وتم نیمە دەچمە بەندیخانەوە. دەستیان کرد بەگیرفانمدا پارەکەیان دەر هێنا، ڕێك بە ئەندازەی جەریمەکە بوو. تەنیا ئەوەندەی کەم بوو پێنج ڕۆژ بچمە بەندیخانە. بەڵام پێیان بەخشیم و دەریانکردم. زۆر بە خەمبارییەوە هاتمە گاراجی ئسحابەسپی. دەگەڕام بە شوێن کەسێکدا دوو ڕووپیەی لێ بسێنم و بێمەوە پێنجوێن. تەماشامکرد کابرایەك بیستوویە من لێرەم و نیو دیناری لامە، بە شوێنمدا دەگەڕێ. ئەگەر بمدۆزێتەوە و داوام لێ بکا چی بکەم. چاوم پێکەوت، ناو سکم داکەوت. سڵامم کرد و وتی برا بیستوومە خەریکی کاسبیت و چاکیش دەوڵەمەند بوویت. پێم خۆشە ببین بە شەریك. دەڵێن تووتنفرۆشی شتێکی چاکە ئەمە دە دینار خۆت و خوای خۆت هەر چی خێری کرد دووبەش. ئەو دە دینارەم کردە مایە و لەو هەمووە نا ئومێدییە ڕزگارم بوو. لەو ساڵە وەزعم گۆڕا و لە سایەی تووتنەکەی مامۆستاوە ژیانم گۆڕا و زۆر چاکبوو.

## قانع و تیشکی چرا قووە (لایت)

لە پێنجوێن خوالێخۆشبوو سەلیم هەڵواچی هەبوو. ژنێکی هەبوو ژیر و لێهاتوو. ناوی ئەمنەخان بوو. دەچووە ماڵی

مامۆستا. هەر چەند مامۆستا زۆر لە پێنجوێندا نەبوو، بەڵام لەو ماوەیەدا شتی زۆری لێ دەگێڕنەوە. ئەم زنە دەچێتە شەونشینی. چراقوومەیەکی پێ دەبێ. هێشتا چراقووە لەبووبووە باو. دەروێش حەمە ناوێکی خەڵکی مرانە لە ماڵی مامۆستا دەبێ. چراقووەکە بە دەست ئەم زنەوە دەبێ جار جار دەستێکی پێدادەنێ رۆشنی دەکا. دەروێش حەمەش بە سەیرەوە تەماشا دەکا و سەردەنێتە لای گوێی مامۆستاوە، دەڵێ ئەم زنە مەلایە کە نووری لێ دەبارێ، ئەوە چاوی شێخە. مامۆستا تێدەگا چیە، دەڵێ: دەروێش حەمە ئەوە نووری عیلم و زانینە. چاوی ژیریە، چاوی بینینە. جا دەروێش حەمە تێدەگەینێ.

## قانع و دوعای خێر بۆ شێخ

مامۆستا جارجار لە دەرد و رەنجی کۆمەڵ زۆری بۆ هاتووە کە چارەی بۆ نەکراوە. ناچار بووە هەر بەو زوانە کە خەڵك فێری بوون بدوێ. ئەگەر فەلایەکی داماوی نەدار ئەوەندە دەرامەتی نەبووە کە بە باشی بژی و ناچار بووە ژن و منداڵی لە خراپترین بواری نالەباردا بەرێوە بەرێ، بۆ ئەوە کاژەڵەی بێتە گیسك و گیسكی بێتە بزن و بزنەکان زۆر بن و لە کەرە و کەشکەکەیان کەڵك وەرگرن. تەنانەت دێیەکانی دەوری شار ماستیان بە منداڵەکانیان نەدەدا، بۆ ئەوەی بیبەنە شار و بیفرۆشن، بیدەن بە شەکر و چای.

مامۆستا کاتێك لە یەکێك لـە دێـەکانی مـەریواندا بـووە، ژنـێك دەچێتە لای خێزانی مامۆسـتا و دەڵـێ: بوروکـێکم بێـزوو دەکـا و زۆر حەزی لە گۆشتە. ئەگەر مریشکێك لە ماڵی دراوسێکەمان بدزم. بەهار کەرە بفرۆشم حەقەکەی بدەم، بڵێ بە مامۆستا خوا قەبووڵی دەکـا؟ بـە خوا شەو تا بەیانی خەوی پیا ناکەوێ. زۆر بەزەییم پێدا دێتەوە زۆریـش لەڕ و لاوازە. خێزانی ئەم باسە بۆ مامۆستا دەگێڕێتەوە و باسی بێگۆشتی و نەبوونی خەڵکی دێکە دەکـا. مامۆسـتا دەڵـێ بڵـێ تـا دو رۆژیتـر راوەستێ.

کوڕێکی لاو، بە ناوی سوبحان بانگدەکا و دەڵێ ئەم نامەیـە ئـێوارە بێنە مزگەوت و بڵێ ئەمڕۆ پێیان داوم پێش نوێژی مەغریب بیدە دەستم با کەس نەزانێ. دەڵێ بە سەر چاو. ئێوارە کـە هـەمو خـەڵك دەچـنە مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، نامەکە دەداتە دەسـتی مامۆسـتا و مامۆسـتا تەماشایدەکا و دەفەرموێ: هەمور چـاك گـوێ بگـرن لـەم نامەیـە، بـا بیخوێنمەوە. نووسراوە:

*بە ناوی خوای گەورە،*

*خەڵکی دیندار و پیاو چاکی ...*

*حـــەزرەتی شـــێخ خـــەوێکی دیـــوە خوانەخواســـە بەڵایـــەك بـە ڕێوەیـە، هـەر کـەس هـەر چـی لـە دەسـتی دێ دوعـای خێـر و مــــەولوودی و ئیحســـــان بکـــا و بەشـــی کاتـــەوە بەســـەر*

*خەڵکدا، بەڵکوو خوا ئیحسانەکە قەبووڵبکا و رەحمبکا، ئەم بەڵایە دوور کەوێتەوە.*

جا ئێستا هەر کەس بە پێی توانای گوێرەکەیەك، بزنێك، پەزێك، گیسکێك ئەدا، بڵێ با بنووسین و بەیانی زوو بیهێنێ بۆ بەر مزگەوت با سەری ببڕین و بەشیکەینەوە بەسەر خەڵکدا.

دەبێتە گریان و شیوەن و هەر کەس دەتوانێ چەند سەر حەیوان بدا، دەینووسن. بەیانی هەمووی دێنە بەر مزگەوت، سەریاندەبڕن. بە سەر خەڵکی ئاوایدا بەشیدەکەنەوە. ئەوەندە گۆشت زۆر دەبێ. گۆشتێکی زۆر دەنێرنە ماڵی مامۆستا. بەشی هەموو کەس زۆر دەبێ. خەڵك جگە لە خواردن و ناردنی بۆ ماڵە ئاشنا لە دێکانی دەور و بەر، بڕێ قاورمەشیان لێدروست کرد. مامۆستا دێتەوە بۆ ماڵ تماشا دەکا، خێزانی سکڵی دار بەڕووی خستووە و خەریکە گۆشت دەبرژێنێ. خێزانی دەڵێ ئەرێ یا شێخ ئەم مەولوودیە چی بوو؟ بەڵای چی؟ کاری وا چاك تا ئێستە رووی نەداوە، بەڵام من زۆر دەترسم پێم وایە کەتنی تۆیە.

خەڵك لە دوورەگۆشتی دەمردێن و لە دێکانی دەور و بەر دەبێتە دعایە و هەموو دەس پێدەکەن و ئەوەندە حەیوان سەر بڕا خەڵك سەری سوڕ دەما. پاش چەند رۆژ خێزانی مامۆستا دەڵێ

چاوم بە ژنەکە کەوت، وتوویە خەبەری مەولوودیان بەستبوو بووکە داماوەکەم زۆر کەیفی خۆش بوو، هەتا بەیانی نەخەوت و لە مالی خۆشمانەوە دوو سێ سەر حەیوان چوو بوو، کە گۆشتەکەیان هێنایەوە بە خوا قەسەم سێ چوار پلی بە کالی خوارد. زۆر زۆر مەولوودییەکی خۆش بوو. مامۆستا دەلێ ئێمە ئەوەندە قاورمەمان دروستکردبوو تا ماوەیەکی زۆر هەر گۆشتمان دەخوارد و دوعامان دەکرد بۆ لاچوونی بەلا. کاتێ مامۆستا لە مزگەوت دێتەوە خێزانی دەلێ: ئەوە بۆ چی چاوت سوور بووە. دەلێ بە خوا خەلکەکە هێندە بە دل و بە کول دەگریان منیش خۆم پێ نەگیرا. رەنگە لە هەموویان زۆرتر گریابم بە هیچ جۆرێ کولم نەدەنیشتەوە. لەوە سەیرتر مامۆستا لە کاتی گێرانەوەدا دووبارە دلی پر دەبێ. ئەوەش با بلێین لەو دەورەدا عادەت نەبوو لە دێکاندا وەکو قەسابی، کەس حەیوانێك سەربڕێ مەگەر نەخۆش بووبێ، یا دەست و پێی شکابێ.

## قانع و پۆلیس و کەرسواری

شێخ مەحموودی کانیسانان گێڕایەوە فەرمووی:

لە کاتێکدا مالی لە دێی بەردەبەل دەبێ - بەردەبەل دێیەکە لە بناری شارەزوور - شەو لە نیوە لایدا بوو، بارانیش دەباری.

دەدەن لە دەرگا و تەماشا دەکەن بارچاوشێ (ئەفسەر) و شەش پۆلیسە. دەڵێن: بێ دەرەوە. مامۆستاش دەفەرموێ: بۆ کوێ؟ دەڵێن: بۆ (هەڵەبجە). دەڵێ: بۆ؟ دەڵێن: بۆ ئەو قسە قۆڕانە وا دەیانووسی. مامۆستا بە شێخ مەحموودی کانیسانان، کە خزمی نزیکیە و میوانیەتی دەفەرموێ: لە گەڵم وەرە. تەماشا دەکەن کەرێکی سپییان هێناوە زۆر زل و بەرز. مامۆستا سوار دەکەن و هەر دوو قاچی بە پشتوێنەکەی لە ژێر سکی کەرەکەوە دەبەستنەوە. ئەفسەرەکە دەڵێ ئەوە دەردت بێقەسەی قۆڕ دەکەی! دەڵێ: تۆ چووزانی سالەهایە بە ئاواتم ئەم سوننەتە بەجێبێنم. ئاخر سواربی کەر سوننەتە. ئێستا خوا بۆی رێکخستووم و لە ئێوەش زۆر مەمنوونم. لە زووەوە پێم خۆشبوو لە شەودا سەفەرێکم بۆ رێکەوێ. لە زوویشەوە پێم خۆشبوو بچمە شار. دەستان خۆش، هەموو ئەمانەم بە جارێ بۆ رێکەوت. دەڵێ کە مامۆستا هەر پێدەکەنێ و خۆی نارەحەت نیشان نەدەدا. پۆلیسەکان لە داخا خەریك بوو شەقیاندەبرد تا گەیشتنە تاکە چایخانەکەی سەر رێگە، کە لە نزیکی هەڵەبجەوە بوو. دابەزین و چایان خواردەوە و دووبارە سواریانکردەوە و دوو پاکەیان بە یەکێری بەستەوە. بە پۆلیسەکەی فەرموو: مامە پۆلیس بڵێ بە ئەفسەرەکە تۆزێ کاغەزم بداتێ و قەڵەمێك.

ئەفسەرەکە وتی: کاغەزت بۆ چییە بە قاچی بە سزاو بە سەر کەرەوە؟ وتی ئاخر ئێوە پەلەتانکرد نەتانهێشت کاغەز هەڵگرم. قاقەزیان دایە دەستی و ئەویش دەستیکرد بە نووسین. بە پۆلیسەکەی وت: بیدە بە دەست ئەفسەرەکەوە، کە دایە دەستی ئەو پارچە شیعرەی نووسیبوو کە لە دیوانەکەیدا هەیە بە ناو نیشانی «کاکی زاڵم»، خوێندیەوە تا گەیشتە:

پۆلیس بە فیدای فیشەکەکەی شان و ملت بم
هەر خۆم بە فیدای قۆندەرەکەو قاچ و قولت بم
قوربانی زکی برسی و عەینوانی زلت بم
دەس هەڵگرە لەم زوڵمە نە وا جنگ و ملت بم
ئاهی منی مەزلووم مەهاوە سەری شانت

دەڵێ وەکو شێتی لێ هات. شەو نەخەوتبوو، ماندوو بوو، رێگە دوور و زۆر قوڕ و باران بوو. هەڵیدەخستەوە و دەیقیڕان: تۆ مەلای، تۆ شێخی، تۆ دینت هەیە؟ لە ئێران راتکردووە و لێرەش واز ناهێنی؟ ئەم قسە قۆڕانە چین دەیانکەیت و کارت بەم کارانە چییە؟ خوا غەزەبت لێ بگری. بۆ واز لە خۆت ناهێنی؟ دەی بە خوایەك کە خوای هەژدەهەزار عالەمە دەبێ ٦ ساڵ بتخەمە بەندیخانەوە. قانع وتی: دەی بە خوا ناتوانی، ئاخر من چیم کردووە؟ ئێوە شەو دەرگام پێدەگرن و ئەمبەن بۆ

هەڵبەجــە. دەڵــێ: ئــێمە نــزیکی نــاو شــار بوویــن، پۆلیســـەکان وەنەوزیان دەدا و جار جار سەر نووچیان دەبرد و بۆڵە بۆڵ یا دوعایان دەکرد، یا وەکو ئامۆژگاری، دەیانوت: مامۆستا تۆ کارت بەم کارانەوە چییە؟ تۆ بانگ و نوێژی خۆت بکە و سەرفیترەی خۆت بخۆ و دانیشە. دەڵێ لە نزیکی پۆلیسخانە کە ماڵی، ئاشنایەکی مامۆستا هەبوو. من چووم بۆ ماڵیان خەبەر بدەم مامۆستایان برد. چوومە ماڵە ئاشناکە، دوو کوڕی هەبوون، ناردنی بۆ پۆلیسخانە و زۆری پێنەچوو مامۆستا هاتەوە، وتی: هەر بردمیانە ژوورەوە جگە لەوە کە لە پێشدا بۆم ساز درا بوو، بارچاوشەکە چوو شیعرەکەی دایە دەستی بەرپرسەکە و شکایەتی کرد و وتی بڕوانە لە ڕێگەشدا واز ناهێنێ هەر خەریکی قسەی قۆڕە. بەرپرسەکە خوێندیەوە زۆر پێکەنی و وتی بە کابرا تۆ بچۆ. پاشان (٤)دیناری نایە بەر دەستم و وتی: مامۆستا تەنیا ئەمە شکدەبەم، فەرموو بڕۆ، منیش هاتمەوە.

## قانع و شێخ ئەحمەدی ڕەشەدێ

دیسان شێخ مەحموود دەڵێ:

لەگەڵ مامۆستادا لە شارەزوورەوە هاتینە پێنجوێن، گەیشتینە ناوەڕاستی شار، تووشی خواڵێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی ڕەشەدێ بووین (شێخ ئەحمەد پیاوێکی گەورە و لە خانەدانی کۆنەپۆشی

بوو. پیاوێکی لێهاتوو بوو لە لای خەڵکی مەریوان رێزێکی تایبەتی هەبوو). ناندار و ناودارێکی وا بوو لە زۆربەی ناوچەی کوردەواریدا دەیانناسی و رێزیان لێدەگرت. فەرمووی: قانع من لە ئاسماندا بە شوێن تۆدا دەگەڕام، تۆ وای لە زەویدا؟ زۆر پێمخۆشبوو بینیتم. هەموو شێخەکانی کۆنەپۆش دەعوەتی منن، دەبێ تەشریف بێنی. خالۆ شێخ مەحموود، تۆش دەبێ بێیت بۆ ماڵی حاجی فەرەج، رۆیشتین. هەموو شێخی کۆنەپۆشی دانیشتبوون. ... بەش، زۆر بە فێزەوە لە لای سەرووی کۆڕەکەوە دانیشتبوو. جا ئەوەش بزانین زۆر چکۆلە بوو. ویستی قانع بشکێنێ، بۆیە لە کاژی (قالب) گاڵتەو شۆخیدا وتی: قانع وەرە با باسێکی خۆمان بکەین، هەر کەس بۆڕی خوارد گرەوەکەی دانابێ. شێخ ئەحمەدی رەشە دێ وئەم خەڵکە داوەر بن. قانع وتی: باشە تۆ لەپێشدا باسی خۆت بکە، جا منیش دوایی. شێخ... دەستیکرد بە قسە کردن و هەرچی زانی لە باسی قانع و مژمۆزی و غاباتی و ئاشەوانی و... وتی. خەڵکەکەش جار جار پێدەکەنین، وەکو باسێکی گاڵتە و گەپی لێهاتبوو.

قانع وتی باشە تۆ ماوەیەکی زۆرە قسە دەکەی من هیچم نەوتووە. ئێستا من زۆر کورت داستانێك دەگێڕمەوە و بەس:

رۆژێ من لە خزمەت خوادا بووم. لە کاتێکدا خەریکبوو خەڵکی دروستدەکرد، سەیری ئەم هەموو گیانلەبەرەم دەکرد. تەماشامکرد ئەم جەنابی شێخەی دروستەکردووە و قوریش تەواو بووە. عەرزی خوا گیانم کرد: باری تەعالا تۆ شێخ... ت دروستەکردووە. فەرمووی ئەوەتە قورِ ئەماوە پاك و تەمیز بێ، منیش زۆر پاڕامەوە ئەمە ئەگەر نەبێ هەروا دەرباز دەبێ و هیچ عەزابی نادرێ، فەرمووی تۆزێ قورِ ماوە و برێ خەوش و خاڵ کە ئەویش بۆ ئەوە نابێ. منیش زۆر پاڕامەوە و هاوارمکرد. فەرمووی: دەباشە لە خەوش و خاڵی قورەکە کە ماوەتەوە کۆی کەنەوە با ببێتە شێخ... ، بەڵام زۆر بچکۆلە دەبێ. مەلائیکە تۆزە قورەکە و خەوش و خاڵەکەیان کۆ کردەوە و کردیانە شێخ... ئێستا هاتووە باسی من دەکا. ئاخر ئەمە کەی پیاوەتییە؟ ئەگەر من نەبوایەم ئێستا ئەم هەر نەدەبوو. خەڵکەکە تماشای شێخ... یان دەکرد کە زۆر بچکۆلە بوو. ئەوەندە پێکەنین خەریکبوو لە سەر خۆیان بچن، کۆڕەکە بە خۆشی رازایەوە. شێخ... وتی بە خوا بۆرِمخوارد. خۆی لە هەموان زۆرتر پێدەکەنی. خوالیخۆشبوو شێخ ئەحمەد

فەرمووی، قانع ماوەیەکی زۆرە پێنەکەنیبووم، یا خوا بەخێر بێت قەیناکە شێخ... ت شکاند.

## قانع و خوازبێنی بۆ وریای کوڕی

دیسان شێخ مەحموودی کانیسانان گێڕایەوە فەرمووی:

ڕۆژێ دەچێ بۆ سەرگەت، بۆ ماڵی کاک ئەحمەد. کاک ئەحمەد پیاوێکی زۆر پاوانە و لە خانەدانی سەیدانی سەرگەتە. زۆر بە دین و لە خواترس بووە. گەورە پیاوێکی دەست و دڵباز و لێهاتوو بوو. دەڵێ کاک ئەحمەد ئەو کچەتم بدەری بۆ وریای کوڕم. کاکە ئەحمەد دەڵێ نایدەم. دەڵێ: بۆ؟ دەڵێ ئاخر من چۆن کچ دەدەم بە کوڕی تۆ؟ هەر ڕۆژەی لە دێیەکدای و ماڵی چەند جار دەگوێزیتەوە. دەڵێ بیدەری ئەگینا لێت دەسێنم. دەڵێ کاکە ناتوانم و هەرگیز نایدەم، خۆ کچم لە هەردەوە نەدۆزیوەتەوە تا بیدەم بە کوڕی تۆ. وەکو بەچکە پشیلە بیگری بەدەمەوە، کون بە کون بیگێڕی. باسی مەکە و هەرگیزاو هەرگیز. قانع دەڵێ دەباشە ئەگەر لێم نەسەندی تۆ ڕاستەدەکەی. خواحافیزی دەکا و دەچێ بۆ بیارە بۆ دیدەنی شێخی بیارە. شێخ زۆر ڕێزی لێدەگری و دەفەرموێ چۆن بووە هاتووی. دەڵێ: قوربان هاتووم ئیشێکم هەیە بۆم بکەیت. دەفەرموێ: هەرچی بێ بە سەر چاو، قانع دەڵێ قوربان بچین بۆ

سەرگەت بۆ ماڵی کاک ئەحمەد، بەڵکو ئەو کچەی لێ بسێنین بۆ وریای کوڕم، شێخ دەفەرموێ: حازرم بە مەرجێك ئەو شیعرە چوارچوارییەم بەتەواوی بۆ بخوێنێتەوە. ئەویش دەڵێ: بە سەر چاو و بۆی دەخوێنێتەوە. تا دەگاتە ئەم بەیتە کە دەڵێ:

چوار شتن ئەمڕۆ کە بوونە بایسی کوردی هەژار

خانەقا یەك، تەکیە دوو، عەمامە سێ، عابا چوار

شێخ زۆر پێدەکەنێ و دەفەرموێ نە هەموو خانەقایەك. دەکەونە ڕێ بۆ سەرگەت. قانع لە ڕێگەدا دەفەرموێ قوربان ئێستە ئێمە دەچینە سەرگەت تا شتێکمان بۆ حازر کەن لە برسان دەمرین، با سوارێك لە پێشەوە بە غار بڕوا و کاك ئەحمەد ئاگادار بکات کە شێخ بۆ ماڵی ئەوان تەشریف دێنێ. شێخ دەفەرمێ: ئەوا سوارێك دەنێرین. بە پێی فەرموودەی شێخ مەحموود، کاك ئەحمەد بە سەر و پێی پەتی دێتە پیریانەوە. لە ڕێگەدا قانع دەڵێ قوربان هەرچی بە کاکە ئەحمەد دەڵێم تۆ عاجز لەبی. کاك ئەحمەد دێتە خزمەتی شێخ، دەیەوێ دەستی شێخ ماچبکا و بە خێر هاتنی لێ بکا. قانع دەڵێ: نا، لە پێشدا پێم بڵێ دەیدەی، یا نە. کاك ئەحمەد دەڵێ: بە تۆ نا

بەڵام بە شێخ بە سەر چاو. دەڵێ باشە، بە خۆشی دەگەنە سەرگەت و پاش حەسانەوە قانع دەڵێ قوربان بە بەر چاوی تۆوە فەرمووی باشە دەیدەم، تۆ چوویتەوە دەڵێ: وتوومە دەیدەم بەڵام ئەم وتووە کەی، شێخ دەڵێ: کاك ئەحمەد کەی؟ دەڵێ: قوربان داوەمەتێ. پاش ماوەیەك قانع دەڵێ قوربان ئێستا لە خزمەتی تۆدا گەرمە و پاش چەند رۆژ سارد بوونەوە وتی مارەی نابڕم تا چەند ساڵیتر من چی بکەم؟ شێخ دووبارە دەڵێ: کاك ئەحمەد مارەیکە. دەڵێ: بە سەر چاو. قانع دەڵێ: دەی بارەڕکە ٥٠ فلسم پێنە، جا ئەگەر خەرجیکەم چۆن بڕۆمەوە؟ چاوەڕوان ئەبێ شتێکی دەستکەوێ، لەو دەورەدا وابوو دەبوا ماڵی کوڕ پارە و دیاریان بدایە بە ماڵی کچ و خەرجی زەماوەندیشیان بدایە. دوو شاهید و مامۆستا قانع خۆی دەبێتە مەلا و مارەیدەکەن. لە حوزووری شێخدا قانع لە جیاتی جل و بەرگ و خشڵ و دیاری دەڵێ قوربان من خۆم ئەم کچەم مارە کرد، لە ناو کوردەواریدا رەسمە هەر مەلایەك ژن مارە بکا مارەبڕانەی دەدەنێ. کاك ئەحمەد دەیەوێ کچەکەی مارە کراوە، بە قسەی خۆش و رێز لێیان ئەم مارەبڕانە بفەوتێنێ. فەرموو مارە بڕانەکەم بداتێ.

هەموو دەستەدەکەن بە پێکەنین. پاشان قانع دەڵێ: قوربان تا ئێرە ناتوانێ گێچەڵ بکا، بەڵام پاش چەند ڕۆژێتر کە ئێمە ویستمان بووک بەرین ئەگەر وتی جارێ نابێ چی بکەین؟ قەولی لێ بستێنە هەر وەخت هاتین، بووک بدا بە دەستەوە. شێخ دەفەرموێ کاک ئەحمەد وا بکە. دەڵێ: باشە قوربان. جا قانع دەڵێ کاک ئەحمەد ئەگەر بە خۆشی خۆت بتدایە ئەم گیسک و برنج و مریشکەت زەرەر نەدەکرد. کاک ئەحمەد دەڵێ: پێم خۆشبوو کە دە کەسی وەك تۆ هەر کام دە کوڕی وەك ڕیبایان بوایە کە شێخ هێجبی (داخوازی) بۆ بکردنایە. منیش بەو میزانە کچم بوایە و پێشکەشم بکردایە. ئەگەر بتوتبایە کچەکەت لەگەڵ ملکەکەتدا پێم ببەخشە حازر بووم و خۆشحاڵ.

## قانع و مەلایەکی ورگ زل

دیسان شێخ مەحموود گێڕایەوە و فەرمووی:

قانع جارێکیان تووشی مەلایەکی بەکجار سك زل بووبوو. تەماشای سکی مەلاکە دەکات زۆر گەورەیە. دەڵێ: مامۆستا قسەیەك بکەم نارەحەت نابی. دەڵێ: نە وەڵلا. دەڵێ: ئەگەر تۆ دێ بوایەی «دەرەورگان» دەبووی. مەلاکە خێرا دەڵێ مامۆستا قانع ئەگەر تۆیش

دێ بوایـــەی «شـــێخەکوێرە» دەبـــووی. قـــانع چـــاوی ورد و مژمۆر بوو.

## گوێرەکەی چاو قەوی

دیسان شێخ مەحموود گێڕایەوە و فەرمووی:

ڕۆژێـــك لـــە بـــەر دەرگـــای خۆمـــاندا راوەســـتا بوویـــن. گوێرەکەیـــەك لـــەوێوە تێدەپـــەڕی، چـــاوی زۆر قـــەوی و جـــوان بـــوو. مامۆســـتا ڕوویکـــردە ئاسمـــان و وتـــی: خوایـــە گیـــان دەبـــا چـــاوی ئـــەو گوێرەکـــەت بدایـــە بـــە مـــن کـــە زۆرم پێویســـتە بـــۆ نووســـین و خوێندنـــەوە. ئـــەم چـــاوانەی منـــت دا بـــا بـــە ئـــەو. دوو چڵ گیای دەویست هەر جۆر بوایە دەیدۆزیەوە.

## قانع و مامۆستایەکی ریش درێژ

دیسان شێخ مەحموود گێڕایەوە فەرمووی:

مامۆســـتایەك دەچـــێتە ماڵیـــان، ریشـــی درێـــژ دەبـــێ. خـــالو ئەمنـــە پـــێی دەڵـــێ، یـــا شـــێخ ئـــەم مامۆســـتایە بـــۆ هێـــندە ریشـــی درێـــژە. قـــانع دەڵـــێ ژنەکـــە ئـــەو ریشـــە نانـــە، ئـــاوە، لیباســـە. ئـــەوە رۆنـــە، ئـــەوە ماســـتە، ئـــەوە کەشـــکە، ئـــەوە پورلـــە، ئـــەوە ســـلاوە، ئـــەوە دەســـت ماچـــکردنە، ئـــەوە ژیـــانی دنیـــای بـــە ســـەرەوەیە، ئـــەوە هـــەزار جـــۆرە شـــتی تـــرە. خـــالو ئەمنـــەیش

دەڵێ، یا شێخ تۆش بۆ وەها ریشێك ناهێڵیتەوە؟ قانع دەڵێ ئاخر تازە بۆمن نابێ.

## قانع و کەر سواری لە بەر بێکەوشی

شێخ مەحموود گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکی تر تازە لە شارەزوورەوە هاتبووینەوە، پاییز بوو. گەڵا تەماکۆیان رنیبوو. جارە تەماکۆیەك پڕ بوو لە کەر، ئەڵەوەڕان. قانع جووتێ کڵاشی لەپێدا بوو، جگە چەند قەیتان، لە سەرەکییەوە هیچی نەمابوو. نەیدەتوانی بەدوای خۆیدا رایکێشێ. وتی مامە دەتوانی کەرێکم بۆ بگری؟ دەمەوێ منیش سواریم تا ناو شار، بە پیا ناتوانم. پام بریندار بووە. منیش، ماکەرێکی بچکۆلەم هەبوو، گرتم دەیتوانی چاك سواریبێ. سوار بوو، لێمان خوڕی. چونکە ماکەرەکە جاشی هەبوو، زۆر بە زەحمەت ملی رێی نەگرت. تا هاتینە پێنجوێن. هەر کەس چاوی پێدەکەوت لە بەر پێکەنین خۆی بۆ نەدەگیرا. ماکەرەکە چونکە بچکۆلە بوو، مامۆستا تۆزێکی مابوو پای بدا لە زەوی. وتی: لێخوڕە تا بەر دوکانەکەی حاجی قادری کەوشفرۆش کە پێیان دەوت قالەبەراز.

بــە نــاو شــاردا ســواری ماکــەر، بــە پشــق رووت، بێکۆپــان. تووشــی هــەر کەســێك دەبــوو دوای ســڵاو کــردن دەیــوت: ئــەوە چــیە بــۆ دانابــەزی؟ دەیــوت: کەوشــم نیــە. شــقێ دەچــێ بــە پــامدا. چــونکە خــەڵکی پێــنجوێن هــەموو دەیانناســـی. هەموو کەســێك تەماشـــایدەکرد، بـــەڵام مامۆســـتا گوێــی پەمانــە نــەدەدا. ڕۆیشــتین تــا گەیشــتینە بــەر دوکــانی حــاجی قــادری کەوشــفرۆش. حــاجی بــە پیریــەوە هــات وتــی: ئــەوە چــیە؟ مامۆســتا دابــەزە. وتــی: نــا دانابــەزم بــزانم بــۆ پــای مــن کەوشــت هەیــە؟ ئــەگینا دانابــەزم، ماکەرەکــەم لــە دەســت دەچــێ و نــاتوانم بــە پێخــاوس بگــەڕێم. ئــەویش وتــی: هەیــە، دابــەزە. وتــی: نــا تــا کەوشــەکە نــەهێنی دانابــەزم. چــوو جووتــێ کەوشــی بــۆ هێنــا وهــەر بــە ســەر کەرەکــەوە کردیــە پــای. پــڕ بــە پــای بــوو، جــا دابــەزی و ماکەرەکــە بــە نــاو شــاردا بــەغار گەڕایــەوە بــۆ لای جاشــەکەی. جــا خــەڵك لــێی کــۆ بوونــەوە: مامۆســتا تــۆ بــە چــاکی شــۆڕ و مێــزەرەوە عــەیب ناکــەی ســواری کــەر دەبــی؟ وتــی بــرا کــەر وەســیلەیە، ئینســانەکانیش هــەموو وەك یــەك وان، مــن و فــلان فــەرقمان چــیە؟ مەگــەر ئــەم هــەموو خەڵکــە بــە کــەر هاتووچــۆ ناکــەن؟ وتیــان: ئــاخر تــۆ فــەرقت هەیــە و تــۆ پیــاوێکی گــەورەی،

شاعیری، مەلای. وتی بۆچی هەر کەس شاعیر بوو، مەلا بوو، شێخ بوو لە ئینسانی دەردەچی؟ نە کاکە گیان ئێمە وەك یەك واین و لە کەرسوارەکان هیچمان زیاتر نییە.

## قانع و حەمە گوڵێ و گریان

مامۆستا جار بە جار بەزمێکی دروستدەکرد، یا ئیشێکی وای کردووە کە خەڵك روو بکەنە مەبەستێکی سەیر و شتێك تێبگەن. باسی دەروێش و سۆفیەتی لە مەریواندا لە زوومەوە هەیە و جار جار وەها تەنووری گەرمبووە کە برایەتی و یەکیەتیی سووتاندوە. زۆر بوومەتە هۆی زەرەر. یەکیەتی و برایەتی دینی لە ناو دەبرد. جار جار گەیشتووەتە نوێژ کردنی جیا جیا لە یەك مزگەوتدا. من خۆم لە بیرم دێ لە کانیساناندا سۆختە بووم شەڕی دەروێشی و سۆفیەتی گەیشتبووە جێگایەك نۆ (٩) ماڵ لە کانیسانان لە بەر ئەوە دەروێش بوون لە سەر ماڵ و مووچە و مەزرایان دەرکران و دەروێشەکان بە کافر ناو دەبران. کفری دەروێش بوویبووە فتوا و ئەم فەقیرانەش ناچار بە پەیڕەوی بوون. بەڵام دەروێشەکان بێدەسەڵات و بێ ساحێب بوون. لە مەریواندا زۆر شتم لەم بارەیەوە لە بیرە، لەم دووبەرەکییەدا زیانی زۆر لە خەڵك کەوت. بە پێی دابی ئەو سەردەمە ئێواران فەقێ ماڵ بە ماڵ دەگەڕا لە هەر ماڵە نانێکیان دەهێنا و لە کاتی نوێژی شێواندا دەچوونە بەرێك لە ماڵان. پێخۆر هەر چی بوایە تۆزێك دەکرایە ناو قاپێکەوە کە فەقێ لەگەڵ خۆی بردبووی،

دەیانهێنایەوە بۆ حوجرە. لە ماڵی خوالێخۆشبوو حەمەخاندا بەشە چێشتی فەقێ تەرخانبوو. نان و چێشتی چاکیان وەردەگرت. تەنانەت لە بیرمە هەر ئەم دووبەرەکییە بوو بەهۆی ئەوە مامۆستا لە خەڵك شتێ وەر نەگرێ. خوالێخۆشبوو حەمەخان کە پیاوێکی ژیر و پیاوانە و خوێندەوار بوو، ژیانی مامۆستای لە چەڵتووك و گەنم و شتی‌تر دابیندەکرد و مامۆستا چاك دەژیا و گوایا منەتی خەڵکی نەدەکێشا. ماڵە دەروێش تەحریمکرا بوون، بە تایبەت دەبوایە فەقێ بۆ نان و پێخور نەچوایەتە چەند ماڵێك.

رۆژێك ژنی یەکێ لەو ماڵانە بە منی وت: فەقێ گیان تۆ ئەو قورئانە خوێندووتە شتێکت پێ دەڵێم لای کەس دەنگ مەکە. وتم: باشە. وتی: ئێواران دوای مەغریب وەختێ کەس نەزانێ تۆ، یا شێخ برایم (مامۆستا شێخ ئیبراهیمی مەردۆخی ئەو وەختە لە کانی‌سانان ئەویش سوختە بوو) بێن بۆ ماڵی ئێمە پێخۆر و نان بەرن با خێراتی ئەم بنە ماڵە نەفەوتێ. لەو وەختەوە نایەن بۆ نان و پێخۆر ماڵی ئێمە وەکو عەزادار واین. پیاوەکەمان زۆر جار دەگری، خۆشم ناڕەحەتم. دەستیکرد بە گریان. جا ئەم مرۆڤە دڵپاك و دەروون ئاوەڵانە درا بوون بە شەڕ. دەبوایە یەکتریان بە خراپ بزانییا. جا لە زەمانی قانعیشا ئەم دەروێش و سۆفیە هەر بووە. دیسان شێخ مەحموود گێڕایەوە و فەرمووی:

رۆژێ مامۆستا لە دێی «دەرەتفێ»وە بەرەو کانی‌سانان دێت. لە سەر کانیەکەی نزیك دێی

کانی‌سانان دەروێش حەمە (حەمە گوڵێ) خەریکە دەستنوێژ دەشوا. چاوی بە قانع دەکەوێ. دوای سڵاو و ماندوو نەبوونی، دەپرسێ مامۆستا لە کوێ بووی؟ دەڵێ دەروێش حەمە، باسی مەکە، ئاخر زەمانە. خەڵك خراپی لێ قەوماوە. دەڵێ: چی بووە؟ مامۆستا دەڵێ: دامار خەریکی چیت؟ دەستوێژی چی دەشۆی؟ قورِمان بۆ گێراوەتەوە، پیسمان لێ قەوماوە. دەڵێ: مامۆستا چی بووە؟ مامۆستا دەڵێ: بابە نەیڵێم چاکە، یا خوا نەیبێ. دەڵێ تو خوا بۆم بگێڕەوە چی بووە؟ زۆر سوێندی مامۆستا دەدا و مامۆستا دەڵێ. ئەمشەو من لە دەرەتفێ بووم. دەڵێن: سۆفیەکی شێخ عەلائەدینی بارە دەروێشێکی شێخ قادری کەسنەزانی... دەڵێ: بە راست؟ دەڵێ: دەکرێ راستبێ. جا دەروێش حەمە ئەمە زەمانەیە؟ مەگەر ئەمانە هەر دووکیان موسوڵمان نین؟ کورد نین، خەڵکی دێیەك نین؟ لە یەك مزگەوتا نوێژ ناکەن؟ لە یەك جومعەدا بە یەکەوە نین؟ دەروێش حەمە دەسدەکا بە گریان و هاوکەڕۆ و رۆڵەڕۆ. دەستوێژ تەواو دەکات و بە شیوەن لەگەڵ قانعا دێتەوە کانی‌سانان. پاشان حەمە گوڵە دەچێتەوە ماڵی خۆیان. ماڵیان نزیکی

مــاڵی خوالێخۆشــبووان فــەرەج بــەگ و مــەحموود خانــەوە بــوو. لــە ماڵــەوە بــانگ هــەڵدەدا و دەگــری و هــاوار دەکــا. فــەرەج بــەگ و مــەحموودخان گوێیــان لــێدەبێ، دەڵــێن بــە کۆێخــا ســەعی ئــا بچــۆ بزانــە حەمــە گۆڵــە چــی لــێ قــەوماوە. بــۆ دەگــری. کوێخــا دەچــێ و حەمــە گوڵــە دێــنێ و تەماشــا دەکــەن لــە بــەر گریــان نــاتوانێ هــیچ بڵــێ. پــێی دەڵــێن چــی بــووە؟ دەڵــێ هــیچ قوربــان ئــاخر زەمانــە. دنیــا خەریکــە کــاولدەبێ و هــەر دەگــری. زۆری بــۆ دێــنن بڵــێ چــی بــووە. دەڵــێ: قوربــان بیســتوومە دوێنشــەو لــە دەرەتفــێ ســۆفیەکی شــێخ عەلائــەدین دەروێشــێکی شــێخ قــادری کەســنەزانی... جــا بــانگ هــەڵدەدا و دەســدەکا بــە گریــان. فــەرەج بــەگ پــێی دەڵــێ کــێ بــۆی گێڕاویتــەوە؟ دەڵــێ مامۆســتا قــانع. خێــرا فــەرەج بــەگ و مــەحموود خــان حــاڵیدەبن ئەمــە بــەزمی قانعــە. هــــەر چــــی دڵــــی دەروێــــش حەمــــە دەدەنــــەوە و دڵخۆشــیدەکەن، ئــەو هــەر باوکــەڕۆ و شــیوەندەکات. ناچــار کوێخــا ســەعی دەنێــرن بــە شــوێن قــانعدا بــەڵکو خــۆی چــارەی حەمــە گوڵــە بکــا. قــانع دێ و تەماشــا دەکــا دەروێــش حەمــە هــەر دوو چــاوی وەکــو گۆمــی خوێنیــان لــێ هــاتووە و هەنســک دەدا، خەریکــە ملــی جیــا بێتــەوە. فــەرەج بــەگ

دەڵێ قانع بۆ وات کردووە بەم داماوە؟ دەڵێ ئەمە دەردی من نییە، ئەمە دەردی ئەومیە لە مێشکیدا فێریانکردووە کە سۆل و دەروێش دوژمن بن. ئنجا شێدەکالەوە بۆ حەمە گوڵێ و دەڵێ: سۆفییەکەی شێخ عەلائەدین شووی دەروێشەکەی شێخ قادرە، پارەکە سۆفییە، ژنەکە دەروێشە. جا حەمە گوڵە هێدی دەبێتەوە.

## سەری بێرۆزی وا لە کەولۆسدا

شێخ مەحموود گێڕایەوە:

یەکێ لە شێخەکانی کەولۆس لە مەجلیسێکدا دەڵێ: سەری بێرۆزی وا لە ژێر خاکدا. قانع دەڵێ کاکە درۆیە. دەڵێ: چۆن درۆیە؟ دەڵێ: سەری بێرۆزی وا لە «کەولۆس»دا.

## گرەو لە سەر قورئا نخوێندن

دیسان شێخ مەحموود گێڕایەوە:

چەند مەلایەك لە دەعوەتێکدا لەگەڵ مامۆستا کۆ دەبنەوە. یەکێکیان زۆر بەرزەفڕ دەبێت، بەڵام زۆر خوێندەوار نابێت، قانع بەگیر دێنێت، دەڵێت: هەردووکمان قورئان بخوێنین و هەر کام غەڵەتی خوێندەوە ئەویتر بەردێکی پاکێشێ، دەڵێ: زۆر چاکە.

قانع دەڵێ: دەبا کابرایەك بگرین بچێ لە چەم بارێك چەوو ربێخ بێنێ. چونکە دەزانم لەگەر هەر کەلیمەیەکت هەڵە بێ و من رێخێکت لێ بدەم،وەکو گوزرە جورلەکەت لێ دێ.مەلایێدەکەنێ و واز دێنێ.

## ریشی یەك ساڵە

دیسان شێخ مەحموود گێرایەوە و فەرمووی:

قانع تووشی مەلایەك دەبێ، زۆر ریشەکەی درێژ دەبێ. دەڵێ مامۆستا لە کەیەوە تۆبەت کردووە؟دەڵێ لە بەهارەوە.دەڵێ کاکە پێم وایە درۆ دەفەرمووی، چونکە ئەم ریشە، ریشی یەك ساڵە نیە.

## قانع و هەڵپەرکێ

مامۆستا زۆر جار ویستوویەتی عادەتی چاك و خراپ بخاتە بەر توێژینەوە و لێکۆڵینەوە. بە عادەتی خەڵکی ئەو سەردەمەی بناری شارەزوور، هەموو ئەو خەڵکە رابواردنیان کەمبوو. هەر خەریکی ئیش و کار بوون. تەنانەت لە هەینیشدا. ماڵی لە «بەردەبەل» دەبێ. بەهار دەیکاتە عادەت کە خەڵك فێری رابواردنیش بکا، بەیانیان تیانە و کەوچك و جام و شێ پێویست (هەوەر) لەگەڵ خێزانی دەبەنە بەر ئاوایی. خەڵکیش دەشتیان لە

بەر ئاوایی بووە، کەرەسەی کوڵانی دانوولەی نۆك و گەنم و هەرزنی (جافرە) و پاقلە دەبەن و دەیکوڵێنن و چالێدەنێن. دوای نیوەڕۆ هەر کەس بەوێدا تێدەپەڕی، یا لە سەر ئیش و کار دەهاتەوە تۆزێ دانوولەیان پێدەدا بە مەرجێ تۆزێك هەڵپەڕێ. دوای نیوەڕۆ خەڵك زۆر کۆ دەبوونەوە و پاش دانوولە خواردن، مامۆستا سەر چۆپییەکەی دەگرت و هەموو هەڵدەپەڕین، مامۆستا شیعری خۆی بۆیان دەخوێندەوە.

شێخ مەحموود زۆری لە بیر نەمابوو بەڵام، خوالێخۆشبوو حەمە بەیگان (باوکی جەمەی راوچی بە ناو بانگ) زۆری لێدەزانی، منیش لە بیرم ماوە:

حویەلانی حویەلانی

پیاوێکم هەیە حوی لانی

کڵاشی بە پێ لار و خوارە

سەر و ژێرەکەی تۆزێ خوارە

خەڵکی جووت و پا بێڵ ئەکا

وەرد و بووورە بێکێل ئەکا

گەنم و نۆك و پیاز ئەکا

بەراوەردی نیاز ئەکا

ڕۆژ هەتا شەو بە دەس بە پا

بە نەوبە جووت بە نۆ بەگا

خۆی و ژنی و دایك و بابی

تێدەکۆشن بە حیسابی

تا کو خەرمانۆکێ سوورکەن

تا نەدری لە خۆ دوورکەن

لە پڕ سوارێکی لەندەهوور

پەیانەبێ تۆزێ لە دوور

دێتە سەر خەرمانی حازر

دەك هەرگیز نەبینێ کافر

بەشینەکا بێترس و خۆف

خێزانیش هەر بە ئاخ و ئۆف

ئەم هەژارە باری ماڵ خان

ئەبێ زوو بیباتەو بۆیان

جا کاتێ هی خانی بردۆ

پاژی خەرمانی کۆ کردۆ

قێخا، گزیر، شوان، هەژار

پەیا ئەبن لە سەر، لە خوار

فەقێ و سەیی، مەلا و خادەم

خولاسە کوڕانی ئادەم

بەشی خانەقا و بەشی شێخان

بەشی هاوسێ، شەل و کوێران

جیـــا ئەکرێتەو لـەو خـەرمانە

چی مابوو ئەو بەستە زمانە؟

رەنــــجی ساڵی چوو بە تـاڵان

خێزانیش بـــێ جـــل و پاڵان

ڕەش و رووت هــــەناسە سەرد

بە هــــەزاران ئـــازار و دەرد

حــــۆیــــەلانـی حــــۆیــــەلانی

بــــانگردێنی لە سەر بانــــی

رۆژێ بشێــوێت ئەم کـــــایــــە

بــــۆچی هــــەژار دەنگی نایە

بۆچی زەحمەتکێش بـــــێدەسە

مفتە خــــۆر بۆ ناڵــــێ بەسە

کـــەی بێ نۆرەی ئێوەیش بگا

هــــەر کـــــەسە بەشی خۆی ببا

بـا بــــــڕووخێ ئـــــەم بەرنـامە

دەك نــــــەمێـــنێ ئەم نیزامە

فەلا رزگــــــار و ئـــــازاد بـێ

بــــچێ بۆ سەیران و شاد بـێ

جـــــا لەگــەڵ قانع دەسگرن

ئـــــەو هەڵپەڕێ و ئەوان بمرن

## حوڕیەلانی حوڕیەلانی

### بانگردنێنی لە سەر بانی

شێخ مەحموود دەڵێ تا ئێوارە هەر کەس بەوێدا بچوایە مشتێ دانوولەی دەخوارد و هەڵدەپەڕی.

خەڵك زۆر کۆ دەبوونەوە و قسەی بۆیان دەکرد. دەڵێ پیاوێکی لە لا بوو ناوی ئەول واحید بوو. پای لار بوو. هەر چی کەوشی بۆ دەکڕی بە کەڵکی نەدەهات و خێرا خراپدەبوو. جا مامۆستا دەیوت: بەختم لارە تەنانەت پای پیاوەکەشم هەر لارە.

## قانع و بەرپرسی بیتاقە (کۆپن)

شێخ مەحموودی کانیسانانی گێڕایەوە و فەرمووی:

ساڵێکیان دەیکەنە بەرپرسی دابەشکردنی پێداویستی بیتاقە (کۆپن). هەرچی زەخیرە لە هەمارەکاندا بوو دابووری بە هەژار و نەدار. کە پێیان زانی وتیان بۆچی وات کردووە؟ وتی ئەمە عادلانە نییە، ئەوانەی دەتوانن خۆیان شت بکڕن، چ گرانیێ چ هەرزان هەر دەیکڕن. دەبێ کۆپن هی فەقیر بێت کە ناتوانن بە مەیلی خۆیان شت بکڕن!! خەریکبوو بیگرن و موحاکمەی بکەن زۆر بە زەحمەت لەجاتیبوو.

## قانع و ملك تاپۆكردن

**دیسان شێخ مەحموودی كانی‌سانانی گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆستا بۆ هەر مەبەستێك كە بە حەقی بزانیبا خێرا دەستی دەدایە پێنووسەكەی كە لە هەموو و شمشێرێك تیژتر بوو. خانەدانێكی گەورەی مەریوان زۆر خەریك دەبێ بۆ ئەوە وەسیلەی جیا كردنەوە و سەبق مولك لە رێگەی قانوونەوە داینكەن. هەلیان بۆ دەڕەخسێ و بەرپرسی ئەم ئیشە پیاوێكی گەورەی ناوداری ئەو زەمانەیە دەبێ. تەواوی گەورە پیاوانی ئەو دەورە لە یەكێ لە دێكاندا لە دەوری كۆ دەبنەوە. مامۆستا قانع ئەم سەبت و جیا كردنەوەیە بە چاك نازانێ و خۆی بە حەقدار دەزانێ و پێی وایە ئەم ئیشە دەبێتە هۆی پێشێلكردنی مالی كەسانی‌تر.

پارچە شیعرێكی زۆر سەیر، كە بەداخەوە ناكرێ بلاویكەمەوە، دەنووسێ و دەیداتە دەستی كابرایەك بە ناوی «بلە حۆجی»، دەلێ بیبەرە مەجلیسەكەو بیدەرە دەستی... ئەویش لە پەناى ئەو پیاوەدا، كە هاتووە بۆ رێكخستنی ئەم ئیشە، دانیشتووە. بلە حۆجی كاغەزەكە

دەداتــە دەســـتی... ئــەویش دەڵــێ، قوربــان تــۆ کــوردی چــاکو دەزانــی، بیخوێنــەوە بزانــە قــانع چــی نووســیوە؟ کــە دەیخوێنــەوە چــاوی ســوور دەبــی و دەســتەکا بــە لــەرزین. بــە هــەزاران ڕەنــگ دەگۆڕێــت. ئــەم هــەنێکی حورمەتــەی بــۆ قــەبووڵناکرێ. هەڵدەســتێ و هێشــتا هیچــی نــەخواردووە و ئــەم هــەموو خەرجــەی بــۆ کــراوە و پــڕ لــە چــەند کەســی لــەم مەجلیســەدا بــە خــاتری کەســێتی ئــەو کــۆ بوونەتــەوە، دەڕوا. هــەر چــی هــاواری لێدەکــەن، دانانیشــێ و ناگەڕێتــەوە و ئیشــەکە بــە هــیچ دەر دەچــێ. دەگــەڕێن بــە شــوێن بلــە حۆجــیدا بــۆ ئــەم کــارەی کــرد. وتوویــەتی ئــەویش دەڵــێ مــن چــی بکــەم؟ قــانع وتــی. دەگــەڕێن بــە شــوێن قــانعدا. ئــەویش لای یــەکێ لــە پیــاوە گــەورەکان خــۆی دەشــارێتەوە. پاشــان داوای لێدەکــەن هەرچــی بــوو چــوو، ئیشــەکە خــراپبوو. چــەند ســاڵ بــە تــەمای ئەمــە بوویــن بــە هــیچ دەرچــوو، قــانع شــیعرەکە بــدە بــا بیخوێنینــەوە بــزانین چــیت نووســیوە. شــیعرەکەیان دەداتــێ دەڵــێن بــۆ خــاتری خــوا ئەمــە چییە نووسیوتە. ناحەقی نەبوو کۆڕەکەی بەجێهێشت.

## مەلای بەرقەڵا و کراسی شڕ

**شێخ مەحموود کانیسانان گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆستا کاتێ لە دێی بەر قەڵای مەریوان مەلا بوو. چەند هاوەڵێك لە مەلاکانی مەریوان دێن بۆ دیدەنی. پاش حەسانەوە لێی دەپرسن: باری ژیان و گوزەرانت چۆنە؟ فلان بەگ لە بەرقەڵا خزمەتی چاکت دەکا، یا نە. دەڵێ با شتێکتان بۆ بگێڕمەوە: ماوەیەك لەمەو بەر خاتوو ئەمنە زۆری بۆ هێنام وتی ئەو کراسەت داکەنە با بیشۆم، منیش وتم: بۆ خاتری خوا واز بێنە هێندە دڕاو و کونکونە، دایکەنم ئیتر ناتوانم بیکەمەوە بەرم. زۆری لە سەر رۆی. چەند رۆژ ژیانی لێ تاڵکردم منیش ناچار بووم کراسم داکەند و خاتوو ئەمنەش بردی شۆردی و پاش وشکبوونەوە هێنایەوە. بە هەر دووکمان ویستمان بیکەینەوە بەرم، بەڵام هەر چەند خەریکبووین هێندە دڕاو و شڕ و وڕ بوو، نەمانتوانی قۆڵەکانی وەها ساخکەینەوە کە بیکەمە بەرم. تووڕە بووم و فڕێمدایە سەر چڵی حەوشەکە، چەند رۆژ وەکو داری کانی با هەر دیار بوو. رۆژێك دیم نەماوە، پرسیارمکرد چی لێهاتووە؟ وتیان: فلان بەگ چووە بۆ زەماوەند لە بەری کردووە. ئیتر

بزانن حاڵی من دەبێ چۆن بێ کە ئەمە ئاغە و بەراتدەری من بێ؟! پاشان لەم بارەیەوە شیعرێکی نووسیوە.

## قانع و پشیلە بەشکردن

مامۆستا بۆ پیشاندانی دژوارییە کۆمەڵایەتییەکان، لە کاتێکدا خەڵك لە ژێر باری قورسی رسووماتی ناڕەوادا، کە جەبری زەمان مەشرووعیەتی پێدابوو و ئەندامانی کۆمەڵ پەیڕەویاندەکرد و زۆربەی جووتیار و رەش و رووتەکان وەها خۆیان ناچار بە پەیڕەوکردنی زانیوە، پێیان وابوو ئەگەر لە ژێر ئەم بارە دەرچن لە شەرعی ئیسلام لایانداوە و خوایان لێ تووڕە دەبێ و هەر کەس ویستبێتی یاریدەیان بدا و لە ژێر ئەو بارە دەریانبێنێ بەرەو جەهەننەمیان دەبا و گوێیان بۆ نەگرتووە. بەڵام لە ناو ئەم خەڵکەدا بڕێ کەس تێگەیشتوون و پێیان خۆشبووە لە ژێر ئەم بارە دەرچن. ئەمەش تەنیا لە وزەی ئەو پیاوە دینییە بلیمەتانەدا بووە کە لە زمانی شەرعەوە شتێکیان وتووە، یا شیعرێکیان نووسیوە کە قانع یەکێ لە نموونە هەرە دیارەکانی ئەو کەسانە بووە. قانع هەر وەختێ مەبەستێك شیدەکاتەوە، چونکە مەلایە و دیندارە، ئیتر کەس ناتوانێ بڵێ گوناهە. جار جار نەرم و لە سەر خۆ و دەیکاتە بنێشتەخۆشەی دەمی خەڵك، هێندە دەخوێنرێتەوە کە هەموو کەس لێی تێدەگەن و باسی لێدەکەن و لێی دەکۆڵنەوە. مامۆستا بۆ نیشاندانی بڕێ مەبەست رووداوێکی کردۆتە دەستمایەو بە دانانی شیعرێك کەم

و کووڕییەکانی کۆمەڵ دەخاتە بەر دەستی خوێنەر و دەیکاتە پەند و ئامۆژگاری بۆ دوا ڕۆژ.

گوایا لە دێ‌ڵاش چەند نۆکەر بە لای ئاشە گەورەوە دەبن. تارماییی‌یەك دەبینن و تەڵەی لێدەکەن و دەیپێکن. کە دەچنە سەری تەماشا دەکەن پشیلەیە و دەڵێن پێمان وابوو گورگە. بە هەڵە پشیلەکەیان کوشتووە.

بە داخەوە ئەوانەی ئەم شیعرەیان لە بەر بوو هەموو مردوون و عەمری خوایان کردووە، جگە لە چەند کەس کە بە ناتەواوی کەمێکی دەزانن، زۆر کەمی ماوە بڕێکی لێ بڵاو ناکەینەوە. چونکە هێندێ لە بنەماڵەکان و ناوی کەسانێکی تێدایە، ناڕەحەت دەبن و ئێمەش ناڕەحەتیی کەسمان ناوێ. هەر ئەوەندەی لێ دەنووسین کە لە مەبەستەکە گەیشتبن و ویستی مامۆستا بەڕێزە چووبێ. ئەم شیعرە زۆر زۆر بووە. با ئەوەش بڵێین تا ماوەیەکی زۆر لایەنگرانی شیعری قانع هەموو لە بەریان بوو. مامۆستا سەی ئەحمەدی حسەینی کوڕی شێخ خالۆعەبدولی کانی‌سانان کە خۆشی هۆنەرێکی چاکە و هۆنراوەی زۆری هەیە سەبکی شیعری وەکو قانع ولیە، خزمی نزیکی مامۆستا قانعە و بە ڕەنجی شانی لە کانی‌سانان خەریکی جووت و گایە، کاك ئەحمەد بڕێ لەو شیعرانەی لە بەربوو و زۆریشی زەحمەت کێشا و یارمەتیدام بۆ دۆزینەوەی شیعری قانع کە دەبێ بۆ ئەم کارە گرینگە سپاسییکەم. مامۆستا لەگەڵ بابا تایەری خزمیدا، کە ئەویش پیاوێکی ژیر و قسەزان و قسە

خۆش بووە و هەر بەم بۆنەیەوە زۆر ناسیاو و بە دڵ چوو دەبێت. ئەم بابا تایەرە لە دۆڵاش بەشی خۆی مڵك و کێڵگەی بووە، دانیشتن و ئەم نێچیرە، واتە پشیلەکە، بەشەکەن بەسەر خەڵکی دێکانی دەور و بەری دۆڵاشدا بە تایبەت کانی‌سانان.

و مامۆستا ئەم شیعرانەی خوارەوە دادەنێ:

سەر و پێکەی چاخ و جەورە
دایەنێین بۆ ماڵە گەورە
چایچی و نۆکەر و کوێخا
دوای ........ تێری لێخوا
ئەگەر پاشخوانیان لێ ماوە
کە کاسەیان گێڕا دواوە
چەڵکاوەکەی بە را و تەدبیر
نۆکەر بیبا بۆ ماڵ گزیر
وا بەشکرد ئەم پشیلە
تیاما نەکرد فێڵ و حیلە
ئافەرینم ... بۆ ئاغاییت
بۆ تفەنگچیی ناو ئاواییت
بۆ چەکدار و پاسەوانت
بۆ ئاش و بۆ ئاشەوانت
پشیلە و گورگ جیا ناکەنۆ
هەرگیز سەری تیا ناکەنۆ

کــــاتێ کــــە کــەوتنە تەقـە
هەرچی بکەن لایان هەقــــە
هــەرچی بێ خۆێنێك برژێـنـن
مێشکی گیانـــدارێك بپژێــنن
ئیتر پـــــشیلە بێ یان گورگ
مەبەست نۆکەر چڵکاوە و ورگ

## قانع و ئەولیا

مەلا ئەحمەدی خاکی

مەلا ئەحمەدی خاکی گێڕایەوە و فەرمووی:

لەگــەڵ یــەکێ لـــە هاوەڵـــەکانمدا لـــە دەورەی فەقێـــەتیدا چــووینە مــاڵی مامۆســـتا قانع. ماڵی لە دێی «قەڵبەزە» بوو.

ماڵەکـــەی حەوشـــەی نـــەبوو. چـــەند بــەردی گــەورەی وەکــو حەوشــە لـــێ کــردبوون. زۆر بـــەخێر هــاتنی کــردین. پــاش ماوەیــەك پرســی: فــەقێ گیــان خــەڵکی کــام لای؟ مــیش وتم خــەڵکی مــەریوانم دێــی کــاڵی خــواروو. وتــی: خــێڵی مینــە فاتــان دەناســی؟ وتم: بــەڵێ. وتــی: بــا قــەیەکی خۆشــت بـــۆ بگێڕمـــەوە. وتم: فــەرموو. فــەرمووی: کــاتی گیــا دووریــن بــوو، خــەڵك لــە مەریوانــەوە دەهــاتن بــۆ شــارەزوور بــۆ کرێکــاری و کــەرەنتوویان دەگێــڕا. ڕۆژێــك

دیم کابرایەك هاتووە بۆماڵمان، لێم پرسی: خەڵکی کام لای؟ وتی: کاڵی خواروو، هاتووم بۆ کەرەنتوو کێشان. وتم: خێڵی فاتان دەناسی؟ وتی من منە فاتانم. وتم زۆر چاکە لان و چاکەت بۆ با بتبەم گیات پێ نیشاندەم بۆمان بدروو. وتی: چاکە. نیوەڕۆ دوای حەسانەوە و نانخواردن بردم گیام نیشاندا و گەڕامەوە. سبەی دووبارە جێگای کاریم نیشاندا و ڕۆژی دوایی دووبارە پێشانمدا و چووم بۆ ئەوێ. نیوەڕۆ گەڕامەوە و تەماشامکرد خاتوو لەعنە و منداڵەکان هەر کامە لە سەر بەردێك لە حەوشەکەدا دانیشتوون و خەریکە لە ترسا دەتۆقن. کە گوێم گرت منە لە ماڵەوە حاڵی لێهاتووە، هەتا هێزی تیایە دەقیڕێنێ و دەڵێ بەعە بەعە بەعە بەعە و هاوار دەکا. وتی: منیش لە سەر یەکێ لە بەردەکان دانیشتم تا هەر جۆرێ بوو حاڵەکەی تەواو بوو. هاتە دەرەوە منیش دەمزانی ئێمە منداڵەکان زاتیان نیە نزیکیکەون و نەگەر خوا نە خواستە شەو ئەم حاڵەی لێبێ چی بکەین. منیش وتم: کاکەگیان تۆ لە ئەوەڵەوەو وتت من گیادوورم لەتوت ئەولیام. من حەدم چییە ئەولیا گیام بۆ بدوورێ. ئەمە پارەی سێ ڕۆژەکەت بڕۆ بە سەلامەت. هەرچی

وتــی: مـــن دەروێـــش مینـــمم، ئـــەولیا نـــیم. وتم نـــەخێر تـــۆ ئەولیایت، برۆ خوا حافیزت بێ.

## قانع نەبووەتە سەرباری کەس

مەلا ئەحمەدی ساوجی

مامۆســـتا مـــەلا ئەحمـــەدی ســـاوجی کـــە پیـــاوێکی بـــاڵا بـــەرز و ژیـــر و قســـە خـــۆش و ڕووخۆشـــە. هەمیشـــە دەم بـــە پێکەنینـــە. زۆر بـــە دڵ چـــووە، مامۆســـتایەکی بێفیـــز و دەمـــارە. هـــەر کـــەس کـــە دەیناســـێ پـــێی وایـــە لـــە ئـــەو خۆشەویســـــتری نییـــــە. ئـــــەم مامۆســـــتا بەســـەرهات و قســـەی ژیرانـــەی زۆری لـــە بیرە.

باسی قانع کرا فەرمووی:

تەمـــــەنم ٨٤ ســـــاڵە، لـــــە تـــــەواوی تەمـــــەنمدا پیـــــاوی وام نـــەدیوە، خـــۆی بـــە ســـەر خـــەڵکدا نەســـەپاندووە و زۆر لـــە خزمـــــەتیدا بـــــووم. جارێکیـــــان لـــــە حوجـــــرەی مزگـــــەوتی جامیعـــەی پێـــنجوێن، شـــەو لـــە مـــن پرســـی: مـــاڵی شـــێخ ئەحمـــەدی ڕەشـــەدێ دەزانـــی؟ عـــەرزمکرد: بـــەڵێ. فـــەرمووی: دەی هەســـتە پـــێم بڵـــێ. مـــنیش چـــووم لەگـــەڵیدا پـــێم وابـــوو لـــەوێ دەخـــەوێ. کـــە گەیشـــتینە بـــەر دەرگـــا و تەقـــەمان لـــەدەرگا دا، کردیانـــەوە. کـــە مامۆســـتا قانعیـــان بـــینی، فـــەرموو، فـــەرموو دەســـتیانکرد بـــە خولکـــی. فـــەرمووی:

لێفەیەکم بەدەڵێ لە حوجرە دەدوورم. هەرچی هاواریانکرد، وتی: نا. لێفە و سەرینی هەڵگرت. لە ڕێگەدا وتی: مەلا ئەحمەد مەگەر من خۆم لێفەیەك ناتوانم؟ وتم: بەڵێ. وتی: دە چۆن بیدەم بە تۆ هەڵیگری؟ وتم قوربان: من پێم خۆشە. وتی: با پێشت خۆشبێ، بەڵام زۆر ناشیرینە. من لە بەر ئەوە لە دیوەخانەکەدا نەخەوتم و نەچوومەتە ماڵی کەسێ کە حوجرەیەکم گیر کەوتووە، بێ منەتە. ئەرکم ناخەمە سەر شانی کەس. ئەگەر حوجرە نەبووبایە دەچوومە ماڵی شێخ ئەحمەد، هاتینەوە حوجرە خەوتین. بەیانی لێفەی هەڵگرت و هەرچی هاوارمکرد، من دەیمەوە فەرمووی نابێ. خۆی بە ناو شاردا لێفە و سەرینی هەڵگرت و بردیەوە ماڵی شێخ ئەحمەدی ڕەشەدێ کە لەو کاتەدا لە پێنجوێن بوون.

## قانع و زیرەکی و وردبینی

**مامۆستا مەلا ئەحمەدی ساوجی فەرمووی:**

تازە ژنم هێنابوو لە ساوجی. مامۆستا تەشریفی هێنایە ماڵمان. فەرمووی: مەلا ئەحمەد ئەم خێزانەت کچی خاتوو رابیعە نییە؟ سەرم سوڕما و پرسیم: قوربان چۆن دەزانی؟ فەرمووی: چل ساڵ لەمەو پێش دەنگی دایکیم

بیستووە. ئێستا دەنگی هات، زانیم کچی ئەوە. چونکە دەنگی لە دەنگی ئەو دەچوو.

کاك ئیبراهیمی مەردۆخی

## قانع و رواڵەتناسی

مامۆستا شێخ برایمی مەردۆخی گێڕایەوە و فەرمووی.

لەگەڵ مەلا حەمە یوسفدا لە شارەزوور تووشی مامۆستا قانع بووین فەرمووی بە مەلا حەمەیوسف تۆ کوڕی مەلا سەعیدی ساوا نیت؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ کوڕی مەلا سەعیدم.

## شیعری بە ناو بانگی مینالێ

تازە خەڵك فێر بووبوون لە چەوریی ئاژەڵ و خۆڵەکەوە (خۆڵەمێش) جۆرێ سابوونیان دروستدەکرد. لە بڕێ دێی مەریواندا ژنانێك سابوونی چاکیان بۆ خەڵك دروستدەکرد. لە دێ دەور و بەرەکانەوە خۆڵ و پیوی ئاژەڵیان دەبردە لای وەستای سابوونکار. هەر ماڵە خۆڵەکەی خۆی کۆ دەکردەوە. لەبەر ئەوەی مزگەوت چونکە داری زۆری دەسووتاند خۆڵی زۆری هەبوو. ژنێك مینالێ ناو، خەڵکی دەرەتفێ، خێزانی مەحموود ناوێك بوو کە بە مەحموە کۆڵ بە ناو بانگ بوو. بە

جوان و شۆخ و شەنگی ناوی دەر کردبوو. جارجارە هاتووە خۆڵی لە مزگەوت بردووە کە بیکا بە سابوون. مامۆستا دەیەوێ بڕێ لەو شتانە لەو زەمانەدا باو بووە و ناوی ئەو کەسێتیانەی ئەو سەردەمە تۆمار کات. لەوانەی کە لەم شیعرەدا بۆ بایەخدان بە مەبەستەکە باسدەکا. جەنابی مامۆستا مەلا مەحموودی جوانڕۆیی، کە پیاوێکی ئایینی و زانایەکی ناودار و موددەڕیسێکی زۆر پایەبەرز بووەو لە دەرەتفێدا خەریکی خزمەتی زانست و ئایین بووە. لە هەموو زانستەکانی ئەو سەردەمە شارەزا بووە. قازیی دەورانی خۆی بووە، گەورە پیاوێکی وا بووە فەتوای لە هەموو کوردستاندا جێگەی متمانە بووە. خەڵکی ناوچەی مەریوان ڕێزێکی زۆریان بۆ داناوە. لێرەدا بوار نییە لەمە زیاتر باسیبکەین. وەگەرنە لەم کەسێتییە بۆ خۆی کتێبێکی ئەوێ لە بارەیەوە بنووسرێت. باوکی خوالێخۆشبوو گەورە پیاوێکی زانا و ڕەنجکێش و ئاگا بە دەردو دڵسۆزی مامۆستا موحەممەدی جوانڕۆیی بوو، کە ئەویش جێگایەکی تایبەتی لە دڵی خەڵکدا هەبووە. حاجی شێخ فەرەج پیاوێکی پیاوانە و ڕێزدار بووە، کەیخوسرەو بەگ پیاوێکی دیار و لێهاتوو و پیاوانە بووە. جێگای ڕێزی خەڵك بووە.

هەر وەها ناوی ناودار و بێناوی لە شیعرەکەدا هێناوە و کردوویەتە قاڵ زۆربەی خەڵک لەو زەمانەدا شیعرەکەیان لەبەر بووە. بە داخەوە نەنووسراوەتەوە. خەریکبوو بە تەواوی بفەوتێ، هەر چەند زۆریشی لێ فەوتاوە. بەڵام ئەو کەمەی لە سینەی بەڕێزان جەنابی: مەحموودبەگی حەیدەری، کە پیاوێکی ژیر و ئاگایە و زۆر بە پیاوانە ژیاوە و لە مەریوان دادەنیشێ و بەڕێز سەید لەتیفی دەرەتفێ، خزمی مامۆستا قانعە، کە لە مەریواندا دەژی، ژیر و قسەزانە. سۆل رەحیمی تاها ولەژێری، کە چەند شیعری تریشی بۆ راستکردەوە، کاک عەبدوڵڵای نەزیری لە مەریوان و خوشکە سەعیدەی حسەین لە مەریوان و چەند کەسی تر هەر کەسە تۆزێکی لێدەزانی، هەر ئەوەندەی لێ دەرچوو:

یاران سەفایە یاران سەفایە

عەجەب بەزمی خۆش شیرین سەفایە

ڕۆژێ لە ڕۆژان بە کوتو پەڕی

گیسکە گەڕۆڵێ سەگ سکی دڕی

لە ژێر پردەکە بێدەردیسەری

سەگەل دەرەتفێ پەڕینە سەری

لەدوای هەشت نۆ ڕۆژ شەریف پێی زانی

لاکی لە بەردەم سەگـــەل دەر هانی

ئەومنەی تۆزێ چەقی لێ دەسکـــەوت

لە سەگی سەند و بردی بۆ مزگەوت

دای بە کوورەکە چـــەقە تاوی کرد

نـــایە پەڕۆیە قایـــم هەڵیگرت

قاتەی کەیبانـــووی کە ئەمیە زانی

چەقی لە باخەڵ شـــەریف دەرهانی

وتی شەقە کوێر ئەیکەم بە سابـــوون

پێت ئەترەکیـــوە، جەحانم بە توون

خۆڵـــی دەڕۆژی مزگـــەوتم ئەوێ

مێناڵ بیبا کۆســـم ئـەکـــەوێ

حەمە سەلیـــم بەگ خێرا بە فـڕان

خەبەر ئەم خۆڵەی بە میـــنا گەیان

میـــنا کە زانـــی زوو بـــە دەســو بـرد

زلـــفی داهانی لارەهێـــچی کرد

چاو پڕ لەسورمە، پـــەرچەم خەناوی

دەم پڕ لە سـەدەف ڕوومەت سووراوی

کەمـــەرە بە ناز تونکرد لە کەمـــەر
گوارە و لا چەناخ، بریقەی بانـە سەر
هــاڕەی مێخەکبـــەن زڕەی ســاڵە
وریشەی ئیــــلانچی تێکەڵ بڵ پڵە
خشەی پانیبەرز ، کـشەی گوارەی زەڕ
هـەڵقەی ناگریجەی لە بان گۆنای تەڕ
بەدەن شووشەی زێڕ، لەبان پــڕ لە گوڵ
تەر لانی تەواو، نیشتوون لە بــان چڵ
ئەلهەق سەرتاپای چوون شیشەی سەهۆڵ
گیرۆدەی مەینەت دەس مەحمووە کۆڵ
بە ســـەد نزاکەت روی کـردە مزگەوت
بە هاتن مینـــا شەریف کۆسـی کەوت
روویکردە مینــا و هــات بە بۆڵە بۆڵ
وتی خاتر جەم، نایەدەم مشــتێ خۆڵ
خـــادم مـزگەوتم هـــەقی بە منـــە
مزگەوت جێی پیاوە، کەی جێگەی ژنە؟
سۆفی حسێـــن هات بە یا هـوو یا هوو
لە سەر مینالێ لە مـــلساف هەڵچوو

کەیخەسرەو بەگ هات بە دڵەی پڕجۆش

هەمانە ئەبا بۆ خــۆڵ بۆ ســـەر دۆش

حاجی شێخ فەرەج هات بە بۆڵە بـۆڵ

هەرچــی ماڵم هەس بۆت ئەدەم بە خۆڵ

سۆفی کەریم بەگ بە یا هــوو یا هــوو

لە سەر میناڵێ لە شـــــەریف هەڵچوو

حاجی حەمـــــەساڵە منەت بە گیـانم

قـــەزای مینــــــاڵێ لە کــچەکانم

ئەمینە رەش هات روویکردە مزگەوت

بە هاتنی ئەمین شـەریف کۆستی کەوت

........................................

وتی تێ هەڵدەن ســـــەر تەنەکە ئەوت

ئەولکەریم رەسوون ئەویش بۆڵە بۆڵ

مایەنە رەش کەوەت بۆ ئەدەم بــە خۆڵ

خولە بە فڕکــــــە، رایکردە بەرۆ

وتی مــامۆستا شــــــەڕە لە دەرۆ؟

کە مامۆستا هات و روانی غەوغـــایە

شەڕ شەڕی ملساف لـەگەڵ مینایە؟

وتی فەقێ بێن ئەم کەرەی ئەحمەق

لە سەر مینـــاڵی بیدەنە بەر شەق

بە واسـوِاسـکە سکت ئـەدڕم

قـەزای میناڵی لە عەلی کـوڕم

من خۆڵـەم ناوێ ئاوا بەم جۆرە

هاوار میناڵێ کۆمـەکـی زۆرە

لە وردە چەرچی هەتـا قومامدار

مەلا و بەگزادە نـۆکەر و تـوجار

دەروێش و سۆق فەقێ و ئـاغەدێ

ئەمنییە و شـوان و هەرچی گونی بێ

لە کوڕی فەلی تا عـەولەی رەسووڵ

ئەهل ئاوایی سەرسـەری و ماقووڵ

یەك یەك حـازرن بـۆ کۆمەکی ئەو

تـەرك ماڵم ئەکەن بەدەوانـوو دەو

شەریفە ملساف بە دڵەی پڕ ئێش

چەقـەکەت بەرۆ بـۆ تامە بڕوێش

ئیتر کۆتا بێ ئەم قسـە و باسـە

بە سەر هات شەریـف بـۆ بازە خاسە

## قسەی خۆش

**براادەرێکی خۆشەویستم، کاک عەینەدینی ئەحمەدزادە بەناوبانگ بە عومەری نگلی کوڕی شاعیر و گەورەپیاوی کورد مەلا سادق نگلی[1] یادی بەخێر، پیاوێکی لێهاتوو و خوێندەوار و ژیرە و دەردی زۆری چێشتووە و دەربەدەری زۆری کێشاوە. خەمی زۆری خواردووە و هەناسەی ساردی زۆری هەڵکێشاوە، ئەو زەمانە لە مەریوان دوکانی هەبوو گێڕایەوە، فەرمووی:**

مامۆستا قانع گوێدرێژێکی بردووە بۆ پێنجوێن بۆ کڕینی جۆی ڕەش. ئەو ساڵە سون گەنمی مەریوانی خوارد و بژێویی خەڵك یا گاڵ بووە، یا ڕۆیشتوونەتە پێنجوێن جۆرێك جۆ بووە پێیان وتووە جۆڕەش، هێناویانە و تێکەڵ گاڵیان کردووە و کراوە بە نان. مامۆستا برێك جۆڕەشی کڕیوە، دێتەوە بەرەو مەریوان. بانگی مەغریب دەگاتە دێی «بناوەسووتە» لە ژێر داڵانی مزگەوتەکەدا بارەکەی دەخا و ئەوەندەش باران لێی داوە دەزووی وشکی نەماوە. دەچێتە مزگەوت و لە بەر ئاگری کوورەکە خۆی گەرم و وشکدەکاتەوە. با ئەوەش بڵێین لە

---

[1] ـ مەلا سادق یەکێکە لە شاعیرە زۆر زۆر گەورە و گرانەکانی کورد کە لە دێی نگلی مەریواندا ژیاوە. شیعری زۆری هەیە. دیوانەکەی کۆ کراوەتەوە و بڕیارە لە بارەیەوە بنووسم و ڕێکوپێکیکەم بۆ چاپ و ئەرکی لە چاپدانی کاکە عومەر گرتوویەتە ئەستۆ، خوا یار بێ چاپدەکرێت. ئەم شاعیرە وەکو زۆربەی شاعیری چەوساوەکان، شواخ و تەنزوێژە و زۆر جاریش لە دیلێنی ئاغەل تووڕە بووە و چی بە دەمیدا هاتووە لەبێگیراوەتەوە و نەترساوە. زۆر بیرتیژ بووە کە بیر و فیکری لە زەمانەی خۆی پێشتر بووە.

کوردستاندا هەر دێیەك مزگەوت و مەلا و خادمی مزگەوتی هەیە و هەر غەریبیەك خانە خوێی نەبێ روو دەکاتە مزگەوت و پاش لوێژ هەر کە خەڵك زانیان غەریبە و خانەخوێی نیە، چەند کەس دەعوەتی دەکەن و زۆر بە روو خۆشییەوە دیبەنەوە ماڵی خۆیانو خزمەتیدەکەن، مامۆستاش هەر بەو عادەتە چووەتە مزگەوت. جا لەو کاتەدا خەریکە خۆی وشکدەکاتەوە و پێش بانگی ئێوارەیە و رەحمەتیی مەلای دێ مەوعیزە بکا بۆ ئەو خەڵکە. مامۆستای ناوەسووتە خەریکە دەگاتە باسی قوربانی، دەڵێ: قوربانی خێری وایە و وایە. هەر کەس قوربانی بکا لە پاشەڕۆژدا ئەو قوربانیە دەبێتە وەسیلەیەك دەیباتە بەهەشت. هەر وەها دەگاتە باسی کافران و دەڵێ دەسکردی کافر نابێ بە کار بهێنرێت، چونکە پارەیەك کە دەدرێ بەو شتە و دەسێنرێت دەبێتە هۆی قەوییوونی کافرەکان. هەر کەس دەستکرد و مەسنووعی کافر بکڕێت، خۆشی دەبێتە شەریکی ئەو کافرە و دژی ئیسلامە و لە دین دەر چووە. جا دەگاتە باسی درۆ کردن و دەڵێ درۆزن کەززابە و نابێ کەس درۆ بکا.

مامۆستا لە بەر کوورەکەدا دەڵێ: مامۆستا ئەگەر ئیجازە بدەی چەند پرسیارێکم هەیە بیکەم. مامۆستا دەڵێ: چەند جار وتوومە و دەڵێم لە کاتی مەوعیزە کردندا نابێ کەس قسە

بکات. مامۆستا قانعیش بە کەوا و پانتۆڵی تەڕەوە کەس نایناسێ، دوورپالیدەکاتەوە. مامۆستا دەڵێ: وسبە و قسە مەکە. عەوام ئەوەی خراپە کە هەرچی پێی دەڵێی تێناگا. مامۆستا روو دەکاتە خەلیفە، کە لە لای مامۆستاوە پاڵیداوەتەوە، دەڵێ: خەلیفە من لەگەڵ تۆمە، خۆ مامۆستا ماوە نادا من پرسیار بکەم، بڵێ بە مامۆستا بێدەنگبێ تا پرسیارەکان لە جەنابت بکەم. خەلیفە روو دەکاتە مامۆستای دێ و دەڵێ: مامۆستا تۆ بێدەنگبە، بزانم ئەم میوانە فەقیرە چی دەڵێ. مامۆستا خێرا بێدەنگدەبێ و مامۆستا قانع بۆ ئەوە شتێك دروستکا کە خەڵك پێبکەنن و جا یکا بە جۆرە پەیامێك کە خەڵك لە مەبەستێك تێبگەن، روو دەکاتە خەلیفە و دەڵێ: ئەم مامۆستایە درۆزنە، کافرە و کەززابە و نابێ گوێ بە قسەی بدرێ!! یەکەم پرسیار لە جەنابت ئەمەیە: ئەم مامۆستایە چەند ساڵە مەلای ئێوەیە؟ خەلیفە دەڵێ: دەوری سی ساڵێك دەبێ. دەڵێ: لەم سی ساڵەدا مامۆستا ماڵاتێکی وەکو بزن و مەڕ و گا و شتی وای بووە؟ دەڵێ: بەڵێ وەڵڵا شوکر هەمیشە ماڵاتی زۆر بووە. دەڵێ: لە پێش ئەمەدا کێ مەلاتان بوو؟ دەڵێ: خوالێخۆشبووی بارکی. دەڵێ: ئەو چەند ساڵ مەلا بوو؟ دەڵێ: دەوری سی و پێنج ساڵ. دەڵێ: دەباشە بارکیش ماڵاتی هەبوو؟ دەڵێ: نەخێر وەڵڵا.

مامۆستا قانع دەفەرموێ دەباشە لەم دەوری (٦٥) ساڵەدا خۆی، یا باوکی ئێوە بزانن مەڕێك، بزنێك، یا گوێرەکەیەکیان کردووە بە قوربانی؟ خەلیفە تەماشای خەڵکەکە دەکا و هەموو دەڵێن: نەوەڵڵا. دەڵێ: تەنانەت خۆی باوەڕی بە وتەی خۆی نییە. ئەگەر وتەی خوا و پێغەمبەری خوا دەخوێنێتەوە دەبێ بە گوێیان بکات. ئەگەر بە چاکی بزانیبا و باوەڕی بە مردن بوایە خۆی و باوکی لەم ماوەیەدا قوربانییەکیان دەکرد. پرسیاری دووەم: ئەم مامۆستایە وتی هەر کەس دەستکردی کافر بە کار بێنێ خۆیشی ئیمانی لەق دەبێ. دەباشە لە مامۆستا پرسیار بکە کەواکەی بەری گازرانییە و سەڵتەکەی شیرداخە، هەردووکیان دەستکردی کافرن. پەس خۆی ئیمانی لەقە و هەر کەس ئیمانی لەقبوو، نوێژ لە پشت سەریەوە دروست نییە. پرسیاری سێیەم: مامۆستا فەرمووی هەر کەس درۆ بکا کەززابە. خۆی بە وتەکانی خۆی بڕوای نییە، کەوا بوو درۆزنە. درۆزنیش کەززابە و مامۆستاش کەززابە. جا خەلیفە تۆ بڵێ ئێمەی عەوام چی بکەین؟ خەلیفە دەڵێ: مامۆستا خۆت وەڵامی بدەوە. مامۆستا دەڵێ: خەلیفە ئەم کابرایە پێم وایە دروستکراوی دەستی شێخ محەممەدی دۆڵاشە، کە پێی دەڵێن قانع. بە خوا بێ و نەبێ دەستی ئەوی پێگەیشتووە. ئینجا هەڵدەستێ و دەچێتە بەر کوورەکە و

دەڵێ کاکە تو خوا تۆ قانع دەناسی. مامۆستا قانع دەڵێ: بەڵێ و من قانعم. مامۆستا دەستەکانە ملی و بە خەڵکەکە دەڵێ: خەڵکینە ئەوە شێخ محەممەدی دۆڵاش، قانعە. خەڵك هەموو ڕێزی لێدەگرن و هەر کەس دەعوەتیدەکا. مامۆستا دەڵێ بە خوا نایەڵم بچێتە هیچ کوێ. میوانی منە و ئەو حەیوانە کە دەبوو بمکردایە بە قوربانی، بۆ ئەو سەریدەبڕم. مامۆستا قانعیش بە خەڵکەکە دەڵێ من ویستم بەزمێکم دروست کردبێ و تۆزێك دڵی ئێوەم شادکردبێ و پێکەنن و جێگای خۆم و گوێدرێژەکەم بێتەوە. جا دەچێتە ماڵی مامۆستا و خەڵکی ئاوایش هەموو شەو دەچنە خزمەتی و بۆ بەیانیش ناهێڵن بڕواتەوە.

## قانع و چەند نوکتەیەك

مامۆستا حەمە یوسف، مامۆستا و مودەریس لە مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:

من لە ژیانمدا دوو جار چاوم بە مامۆستا قانع کەوتووە: جارێکیان لە دێی «سەڵەسی» لە مەریوان. لە شایی خوالێخۆشبوو مامۆستا عوسمان مەردۆخیدا،

مامۆستا محەمەد یوسف ڕەفعەتی

ئێمە منداڵ بووین، سروودی «ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە» مان دەخوێند کە بۆ ئەو سەردەمە شتێکی سەیر بوو.

مامۆستا زۆری پێ خۆشبوو، زۆری ئافەرین پێ وتین. هەر لەم سەفەرەدا بوو لە ماڵی شێخ محەممەدی شێخ حەسەندا، بەیانییەکیان زوو بە خەبەر هاتین، چووین بۆ مزگەوت، نوێژمانکرد و زوو گەڕاینەوە. هێشتا مامۆستا هەڵنەستابوو، کە دەنگی ئێمەی بیست لە ژێر لێفەکەدا سەری دەرهێنا و بە عادەتەکەی خۆی، کە هەر لە بەیانییەوە بە لەی خۆش دەستی پێدەکرد لێفەکەی لادا و تەماشای پەنجەرەکەی کرد و فەرمووی ئەستەغفیروڵڵا (استغفرالله) خۆ هێشتا خۆر نەکەوتووە لێفەکەی دایەوە بە سەردا. پاش تۆزێك هەستا و چوو بۆ نوێژ. پێم خۆشە بڵێم زۆر کەس بوون لە مێژوودا بە بێ موبالات لە دیندا ناویان براوە و حوکمیان بۆ دراوە، بەڵام ئەو شتەش نەبووە مەگەر لە بەر زۆریی ئەقڵیان و نارەزا بوونیان بەو شتە نارەوایانە کە بە ناوی دینەوە هاتوونەتە ناو دین. قانعیش یەکێ بووە لەو کەسانەی کە ئەمەی بە سەردا سەپێندراوە.

جاری دووەم کە بە خزمەتی گەیشتم، من لەگەڵ شێخ ئیبراهیمی مەردۆخیدا لە (شانەدەری) دەمانخوێند. لە سەیدسادق دەگەڕاینەوە بەرەو شانەدەری، لە سەیتەرەیەك کە جێگای پشکنینی خەڵك بوو، واتە عەرەبەکان لە بەسرەوە دەهاتنە ئەوێ خەڵکیان دەپشکنی و دەیانپرسی خەڵکی کوێیت و داوای

ناسـاویان دەکـرد. بـەڵام شـوکور بـۆ خـوا ئێسـتە شـارەزووریەکان لـەوێدا دەوەسـان و دەپرسـن، لـەوەك بێگانـە و نـامۆ بـە بـیری خراپەوە تێپەڕن، خـوا ڕەحمـی هـەبێ ئـیتر جـارێکیتـر بەعسـی نـامۆ و سـێبەری ڕەشـی نەکەوێتـە سـەر شـارەزوور جـا لـەو جێگەیـەدا تووشـی مامۆسـتا قـانع بوویـن. چـووینە خزمـەتی. سـەرکاریگەری ڕێگـەوبان بـوو. دەسـتمان ماچکرد و مـن لـە پێشـدا عـەرزمکرد دەمانناسـیت؟ فـەرمووی: تـۆ لـە مـەلا سـەعید دەچـیت. عـەرزم کرد: بەڵێ. شـێخ ئـیبراهیمی ناسـییەوە. (بـا ئەمـەش بڵـێم دەڵـێن لـە بلیمەتیـەکانی قـانع ئـەوە بـوو هـەر کەسـی دەدی دەیـزانی لـە چ بنەماڵەیەکـە) لـە سێبەرێکدا لـە خزمـەتیدا دانیشـتین و دوای چـاك و چـۆنی پرسـی، ئـەریٚ خـاڵۆت ئێسـتەش لـە نوێـژدا دەقیڕێنێـت؟ (خـاڵۆم جەزبـەی لێدەهـات، تەنانـەت لـە نوێژیشـدا هـاواریدەکرد و دەیقیڕانـد) عـەرزمکرد ئـەریٚ وەڵـڵا. فـەرمووی: چـوویتەوە بڵـێ قانع دەیووت:

هــــمسرانت گـــور مـــیگیرنـــد ز دشت

کـــــور مـــیگیری تو در کوچه به گشت

عــەرزمکرد مانــای شــیعرەکە دەزانم، بــەڵام لــە مەبەســتت تێناگـەم. فـەرمووی شـاعیرێکی فـارس دەڵـی، جارێکیـان کوێـرێك لـە کۆڵانـی دێـەکدا دەگـەڕا، گیـاندارێك پڕیدایـە، لـەویش ئـەم

شیعرەی خوێندەوە. دیسان عەرزمکرد تێناگەم. فەرمووی خەڵك خەریکە دەچنە سەر مانگ و ئێستا خاڵۆت لە نوێژدا بۆم دەفیرێنێت. جا فەرمووی: ئەو ساڵەش کە شێخ عەلائەدین لە دنیا دەرچووبوو حاجی مەلا... ی ئەمزانیش دەیوت ئاسمان شینی شێخ دەکا و لەبەر فەوتی ئەوە دەبارێ. ئەو بەهارە کە شێخ فەوتی کرد (۲۹) رۆژ باران باری، هیچ پردێك نەما. خەڵك بە تەنگ هاتبوون و شاعیران لەم بارەیەوە شیعریان دەگوت. منیش[1] عەرزمکرد جا قوربان چ ئیرادێکی تیایە؟ ئەوە نییە خوا فەرموویەتی «فمابکت علیهم السماء و الارض» هەر چەند پاشان تەماشای ماناکەیم کرد حەزق موزافە. واتە خەڵکی ئاسمان و زەوی بۆیان نەدەگریان. فەرمووی: بە راستە؟ وتم: بەڵێ قوربان. فەرمووی: مەرگی پیاوچاکان نیازی بە گریانی ئاسمان نییە. شێخ عەلائەدین چاکتر بوو یا حەزرەتی حسێن؟ وتم: حەزرەتی حسێن. فەرمووی ئەو کوڕی حەزرەتی فاتمە (خوای لێ رازیبێ) و کچەزای پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێ) بوو، بەو هەموو گەورەییەوە ئاوەها بێرەحمانە شەهیدیانکرد و سەریان بڕی و کردیان بە نێزەوە، هیچ بارانیش نەباری، چونکە بارینی باران سوننەتی ئیلاهییە و هەقی بە مردن و ژیانی کەسەوە نییە. جا

---

[1] ـ ۱۳۷۳/۷/۱۶ گۆچی ماڵی بوو.

لێـرەدا مـن فەرموودەکـەی مامۆسـتام گێڕایـەوە، ئـەوەك کەسـانێ فتوای کوفر و بێدینی منیش دەرکەن.

## قانع و مەلا سەعیدی سەئاوا

کاك حەمە یوسف گێڕایەوە و فەرمووی:

خـۆم ئەمانـەم بـە مامۆسـتاوە دیـبوو. بـەڵام ئـەوەی لـە خوالێخۆشبوو بـاوکم و کەسـانیتـرم بیسـتووە بـەم جۆرەیـە، بـاوکی رەحـمەتیم (خوالێخۆشـبوو حـاجی مامۆسـتا مـەلا سـەعیدی سـەئاوای مـەریوان) گێڕایـەوە و فـەرمووی: مـنداڵ بـووم، بـاوك و دایکـم نـەمابوون. لـە «بـالك»دا بـووم. بـەگزادەی بـالك مامۆسـتایەکی زۆر خوێـندەوار و لـەدییان هێنـابوو بـۆ دەرسـی منداڵـەکانیان بـە نـاوی «مامۆسـتا مـەلا ئەحـمەدی چـاژی» کـە زۆر چـاك گولـسـتان و بوسـتان و خەمسـەی نیـزامی و «تـاریخ موعجـەم»ی دەزانـی. لەگـەڵ فـەقێ ئەحـمەدی بـالکی کتێبفـرۆش و شـێخ حەمـە سـەعیدا فەقێ بـووم. ئـەو کتێبانـەی کـە وتم خوێـندمن و زۆر چـاك دەمـزانین. مامەیـەکم هـەبوو ناردبوویـان بـۆ «مورسـك» کـە بـەنا بـێنێ بـۆ دروستکردنی مزگەوتی بـالك. بـە رەسمـی ئـەو سـەردەمە چـەکی پێ بـووە. لـە رێگـەدا چـەند چـەکدارێك دەیبیـنن و بـۆ بـردنی چـەکەکەی تەقـەی لێدەکـەن و دەیکـوژن. بـە عـادەتی ئـەم ناوچـەیەی خۆمـان ئەگـەر کەسـێك بمردایـە هـەواڵدەدرا ژنەکـەی لـە

بنەماڵــە دەر نەچــوایە. منیــان مــەجبوور کــرد دەســت لــە خوێــندن هەڵگرم و ژنی مامــم مــارە کــەم. پــاش مــارە کــردنی ئــەو ژنــە مــاڵم چــوو بــۆ «کــێلو»ی لای پێــنجوێن. پەســەکێکم لــە بــەر کــردبوو، خــەریکی ئیشــی کشــتوکاڵ بــووم، مــەرمزمەدەکرد. پــاش ماوەیــەك خێزانەکــەم مــرد، مناڵێکیشــم هــەبوو، ئــەویش مــرد. ڕۆژێــك لــەو دەشــتەدا خــەریکی مــەرمزە کــردن بــووم، بڕیــارمدا بچــمەوە خوێــندن. هــەر وامکــرد و بــەرەو چارەڵووســی خوێــندن چــووم. لــە ڕێگــەدا تووشــی مامۆســتا قــانع بــووم، مــنی دەناســی. پرســی: ئــەوە ســەعە بــۆ کــوێ دەچــی؟ وتم: بیرمکردووەتــەوە و بڕیــارمداوە بچمەوە خوێندن. فــەرمووی: جــا بــرا تــو خــوا چــوار پــەلێکی قــەوی و بــەتواناى پــێداوی، دەتوانــی هــەر ئــیش و کــارێکی پــێ بکــەی. جگــە لــەوەش تــا تــۆ دەبیتــە مــەلا، حــەزرەتی عیســا دێتــە خــوارەوە، دەبێ ببــی بە مەلای حەزرەتی عیســا. جــا دڵــت نەیشــێ مــن هــەر لــە ئێســتەوە پێــت دەڵــێم ســەعی عــەوام (واتــە نــەخوێندەوار). دوای خواحــافیزی تووشــی مامۆســتای «ســەردۆش»، بــرای مــەلا زبــەیر بــووم لــە خوێــندن تــاریفیکرد و دڵخۆشــی دامــەوە و چــووم دەستمکرد بە خوێندن. پــاش ماوەیــەك تووشــی مامۆســتا قــانع بــووم، چەند پرســیارێکی لێکــردم، زانــیم. فــەرمووی: لەمــەولا پێــت دەڵــێم سەعەی «ع» (عەین).

پاش ماوەیەکی‌تر تووشیهاتم، پرسیاری لێمکرد و وەڵامدایەوە. فەرمووی: لەمەولا پێت دەڵێم سەعەی شەش (ء) چونکە شەش وەکو سەری «ع» وایە و عەینیش هی عەوامە.

پاش ماوەیەکیتر دیسان تووشی بوومەوە، هەرچی لێی پرسیم، زانیم و بە جوانی وەڵامم دایەوە. فەرمووی: ئیتر لەمەولا پێت دەڵێم سەعەی هەمزە. هەمزەش لە شەش دەچێ، شەش لە سەری عەین دەچێ، عەین هی عەوامە. ماوەیەکی تری پێچوو، دیسان بە خزمەتی گەیشتم و پرسیاری لێکردم. فەرمووی: ئێستا ئیتر گوناحە پێت نەڵێم مەلا، بڕیارم وایە لەمەولا پێت بڵێم «مەلا سەعی». وتم: مامۆستا پرسیارێکم هەیە، بیکەم؟ فەرمووی: بپرسە. وتم: مامۆستا دەڵێن تۆ «شیووعیت». فەرمووی: سەعە تۆش وام پێ دەڵێیت؟ وەکو ژنان دەڵێن «لە داوێنی خۆت لێی هەڵبەری» ئاخر سەعە تۆ بۆ؟ من و شیووعی؟

## قانع و سواریی پیکاپ

**دیسان کاک حەمە یوسف گێڕایەوە و فەرمووی:**

ئەم پیاوە قسەخۆشانە وەکو دەریای بێسنوور وان. لە باوکم بیست کە قانع بۆ بابەتایری گێڕاوەتەوە کە ماشین هەیە و زۆر توند دەڕوا. ئەو کاتە وەك ئێستا ماشین زۆر نەبوو. کەمتر

کەسێك ماشینی دیبوو. فەرمووی: لە سلێمانی دەهاتینەوە بۆ شارەزوور، لە ڕێگادا بە بەر بێستانێکدا تێپەڕین و بە لێخوڕەکەمان وت: ڕاوەستە با شتێك بکڕین. کابرا ڕاوەستا و بە بێستانەوانەکەمان وت بۆمان بێنە. کابرا چوو هێنای و دایە دەستمان، بە لێخوڕەکەمان وت: نادەی بڕۆ. کابرا هێندە تووند لێدەخوڕی سەری کابرا بە ئەندازەی مازوویەك دیار بوو. لێخوڕەکە پێی وابوو بۆ ئەوە کە پارە نەدەین دەڵێین توند بڕوا، بەڵام بێستانەوانەکە وتبووی پارەم ناوێ، لێخوڕەکە نەیدەزانی مەبەست ئەوە بوو کە ماشین چەندە توند دەڕوات.

## قانع و مەلا سەعیدی کالی

مامۆستا مەلا ڕەشیدی گڵەیی

مامۆستا مەلا ڕەشیدی گلەیی مودەریس و پێشنوێژی مزگەوتی حاجی‌ئاوای شاری سنە، مامۆستا حەمە یوسف، جەنابی مەحموودبەگی حەیدەری، مامۆستا مەلا ئەحمەدی خاکی، سەی باقر شێخەلئیسلامی، کاك محەممەدی حەسەنی و چەند کەسی‌تر ئەمەیان گێڕایەوە بۆم. ئەمەی لێ دەرچوو:

مەلا سەعید ناوێك بووە، خەڵکی «کالی سەروو» بووە لە مەریوان. ئەم مەلا سەعیدە کابرایەکی فەقیرحاڵ و لێوە بوو. گوایا بڕێ گولستان و ناگەهان و کتێبە وردەی خوێندووە، لە «کانی‌میران ماوەتەوە» تەمەنی خوێندنی لە

گولستان تێپەڕیوە. ئەوندە فەقیرحاڵ بووە هەموو ڕۆژێ نانی ئاوایی کانی‌میرانی مەریوانی دەچنییەوە. ئێوارە بڕێکی دەکردە تریق دۆ و دەیخوارد و پارشێو، پێش بانگی بەیانی ئەوی تری دەخوارد. هێندەی دەخوارد تا نیوەڕۆ دەینالاند بە دەستیەوە. دوای نیوەڕۆ لە برسا نەیدەتوانی هەڵستێتەوە... ئەم مەلا سەعیدە داوای لە مامۆستا قانع کردبوو، تۆ ئەم هەموو شیعرە دەڵێیت، شیعرێکیش بە مندا بڵێ. مامۆستا ئەم شیعرانەی خوارەوەی بۆ نووسیبوو. مەلا سەعید لەبەریکردبوون، هەموو جارە خەڵك دەیانوت شیعرمان بۆ بخوێنەوە هەر خێرا «اعوذ بالله من الشیطان الرجیم» بسم‌اللەی دەکرد و بەم چەشنە دەستیدەکرد بە خوێندنی شیعرەکە:

یاران نەخۆشم یاران نەخۆشم

دەردی بێدەرمان خەیلێ نەخۆشم

ئاخ بۆ حەکیمێ حاڵزانی حاڵ بێ

کەواکەی بەری قولانجێ شاڵ بێ

کۆسە کارێ بێ پێ و قەدەم بە شەڕ

ئازاردار لە لای ساق نەجێتە دەر

پیس و پێ نەشۆر، ڕەنگ و بۆ گولێ

پەر و بێدیان یەك تیکە زلێ

شاخـی مریشك و خـوری کەوە مار
پەری وشتر و سێبـەر پـیرە دار
هێلکەی کەڵەگا و رۆنی مێشـووله
کێوی قەلـەبەرد لە ناو قتـووله
ئەمە هەر حەوتـی بۆمکا بە دەرمان
پێم بدا بیخۆم بە سـەهل و ئاسـان
کـەوتنم ببێ و هـەڵسـانم نەبێ
ئەم دەرمـانانە بە سنـدانم بێ
مـەلا سەعـیدم مـەلای شلێرم
مەلای کەشـك و رۆن ماست و پەنێرم
لە بەحری دنیـاچ بـەلاییـکم
لـە ئاگەهان دا چ مـەلاییـکم
بـە فیدای باڵاتبم کەنووە گلێنە
پیاتا بـەرەو بوو لە هەزار وێنـە
لە گوێزە گوێژە هـەتا لەنجئاوا
بڕ بکەم ، ئەگـەم هەتا خـۆر ئاوا
خەڵکی . سـەڵەسی . میوان پەزێرن
ئەمما چاوگەی بە میـوان فێـرن
لە گیای بەهارا هێلکە و رۆن خۆشە
سێ جار خواردوومە بەو کۆنەپۆشـە

کالی ژووروورە ئەسڵی مەرکەزم
ئەگەر تێی بچمۆ گوو بە ڕەگەزم
مەن مەلاسەعی نابەڵەد کەوتم
ئیمامی ئەهلی دێی بێمزگەوتم
چڵك و چەپەڵی زۆری هێناوە
تەنانەت تاقەت خۆیشم نەماوە
هەموومان ترۆ و سووك و لاسارین
سەرباری خەڵك و برسی و بێکارین
جا ئەگەر حوجرە و مزگەوت نەبوایە
مەن و قانعیش چیمان کردایە؟

## قانع و چاو ئێشە

مامۆستا شێخ حەمە مارف

دیسان مامۆستا حەمە یوسف لە زمان «مامۆستا شێخ حەمە مارف»[1]ەوە گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان مامۆستا قانع هاتە ماڵمان لە «بەردە رەشە»ی مەریوان فەرمووی: چاوم دێشێ دەمەوێ بچم بۆ بیارە بۆ خزمەتی شێخی عەلائەدین، بزانم دەرمانێك. دەوایەك، چارەیەکم ناکات، وتی: هاوین بوو، شووتی

1ـ بۆ ناسینی ئەم پایەبەرزە و قسەخۆشەکانی بڕواننە ئاخری ئەم کتێبە.

پێگەییبوو. شەو شوورتیمان خوارد و مامۆستا لە کاتی نووستن دا فەرمووی: من لە سەربان دەنووم، چونکە شەو نیازم هەیە زۆر بچمە دەرەوە. ماڵی دێی ئەو زەمانە هەموو بە پاڵ یەکەوە بوو، تا ئەو پەڕەوە بەڕەڵا و هەموو کەس دەیتوانی هات، چۆ بکا، تەنانەت گیاندارانی وەکو سەگ و پشیلەش. لە بەر خاتری مامۆستا و بۆ خزمەتکردنی، منیشیان لە سەربان خەواندبوو. نیوەشەو خەبەریکردمەوە و فەرمووی: مارف هەڵسە، ماڵتان نەشێوێ چاوەکانم چاك بوونەتەوە و ئیتر نیاز نییە بچمە بیارە و دەرمانی چاو ئێشەش فێر بووم. منیش عەرزمکرد: چۆن قوربان؟ فەرمووی: ئیتر هەر کەس چاوی دێشێ، بێتە ماڵ ئێوە و شوورتی زۆر بخوا و شەو ناچار بێ لە سەربان بنوێ و شەو میز زۆری بۆ بێنێ. هەڵسێتەوە بۆ میز کردنو لە جێگاکەی دوور کەوێتەوە بە چاوی بەسراوەوە بکەوێتە مل سەگێکدا و سەگەکە داترسکێ و ئەویش راچڵەکێ و لە ترساندا چاو بکاتەوە و دوو دڵۆپ ئاو لە چاوی بێت، چاوی بکرێتەوە و دنیا ببینێ و چاکبێتەوە. ئیتر نیازی بە رۆیشتن بۆ بیارە نییە.

## قانع و قسەی خۆش

دیسان کاك یوسف گێڕایەوە و فەرمووی:

باوکم بۆی گێڕامەوە. مامۆستا هات بۆ بیارە و فەرمووی: دەمەوێ بخوێنم لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسدا لەگەڵ «مامۆستا مەلا محەممەدی (نێ)دا (بە ناو بانگ بە «حەمەنێی»)». خەریکی خوێندنی «فەرایز» بوون. مامۆستا قانع بۆ شۆخی و بۆ ئەوەی مامۆستا و ئەوانە بێنێتە پێکەنین و بێتاقەتییان دەرچێ، جار جارە سەری بەرز دەکردەوە. ئافرەتێك لەوێوە تێدەپەڕی، دەیوت ئەوە ژنێکم. وەکو منداڵان دەڵێن ئەوە مازوویەکم، یا ئەوە گوێزێکم، هەموو دەستیاندەکرد بە پێکەنین.

## قانع و ژیانی منداڵەکانی

دیسان کاك یوسف گێڕایەوە و فەرمووی:

باوکم بۆی گێڕامەوە فەرمووی، لەگەڵ مەلا عیزەتی «بناوەسووتە»ییدا هاوڕێ بووین، لە بیارە دەمانخوێند. هاتین بۆ دیدەنی مامۆستا قانع کە لە «نەوێ» ـ دێیەکە لە بناری شارەزوور ـ دا بوو. شەو ماینەوە، قسەی خۆشی زۆری بۆ کردین، یەکێ لەو قسە خۆشانە ئەوە بوو فەرمووی ئێستە منداڵی ئێمە بە نسبەتی ئێوەوە وەکو «حەمە قەدۆی موسڵ» وان، ئێمەش وتمان هەزار شوکور بۆ خوا. جا زۆر چاکە منداڵی ئێوە ئێستا هێندە باری ژیانیان چاکە. فەرمووی: جا با باسی باری ژیانی ئێمە و منداڵەکانتان بۆ بکەم. ئێمە خۆمان ئاژەڵمان

نیە، خەڵك دۆمان بۆ دێنن. دۆ هێندە نییە کە بتوانین بە تەسەلی بیخۆین. جامە دۆیەکمان بۆ دێ، کە مێشی تێدەکەوێ منداڵەکانمان مێشەکە دەرناهێنن هەروا بە سووکی و ئاسانی دەیخەنە دەمیانەوە و دەیمژن. تا ئەو دۆیە کە بە مێشەکەوە ماوە بیخۆن، ئنجا فڕێی دەدەن.

باوکم دەیفەرموو: بەیانی لە ڕێگەی بیارەدا بیرم قسە خۆشەکانی قانع دەکردەوەو پێدەکەنیم و دەموت ئێستا کەسێ گوێی لێبێ، وادەزانێ شێتم هێندە پێدەکەنم.

## دەفی هەڵواسراو

مەلا محەممەدی حافز

**مامۆستا مەلا محەممەدی حافز[1] گێڕایەوە و فەرمووی:**

شێخ حسێنی شێخ کاکەحەمە بۆی گێڕامەوە و وتی: جارێکیان چوومە ماڵی مامۆستا قانع دەفێکی هەڵواسیبوو. وتم: مامۆستا شوکور دەفیشتان هەیە. فەرمووی: کاکە حسێن دەف چی، زەرگیشمان هەیە جا خاتوو ئەمنە نایەڵێ بیوەشێنم!!

---

[1] - مەلا محەممەدی حافز، زانا و بلیمەت و زیرەکی لێهاتووە، جگە لە خوێندەواری و زانستی قورئانی، گشت تەمەنی پڕ لە خێر و بێری خەریکی فێر کردن و ڕاهێنان بووە. هەر لە بەهانییەوە کە دەست دەکا بە دەرس وتنەوە، هەتا ماوە هەبێ ئاوەستێ و ماندوو نابێ، بۆ دابینکردنی ژیانی کاسبی دەکا و کاسبێکی بۆهاتووە. ئەوەی کە وەدەستی دێنێ خەرجەلی هەژاران و نەداران دەکا و لێرەدا دەردەکەوێ نەبوونی ئەندامێکی لەش وەکو چاو، نابێ ببێتە هۆی ئەوە کەسێک بە مانەوی دانیشێ و چاوەڕوانی دەستگرۆیی خێرۆمەند بێ. ئەگەر وەک ئەم مامۆستا بەرز و بەرێزە بۆ گەلەکەی جێگای شانازی بێ. ئێستا لە مەریوان دادەنیشێ و تەمەنی ٤٨ ساڵە.

## قانع و پێڵاوەکەی

مەلا محەممەدی حافز بۆی گێڕامەوە:

مامۆستا قانع لەگەڵ ماڵی «فەقێ ئەحمەدی باشماخی»دا زۆر تێکەڵییان بووە و بەکرێیان خۆشدەویست. جارێك بە فەقێ ئەحمەد دەڵێ: کەوشی خەڵك ئاو دەدا و کەوشەکانی من قوڕیش دەدەن.

## قانع و نوێژی جەژن

دیسان مەلا محەممەدی حافز گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێك مامۆستا بە ئاوارەیی و دەربەدەری دێتە «باشماخ»ی مەریوان، «شێخ ئەمین»ی رەحمەتیش لەوێ دەبێ. مامۆستا مەلا ئەحمەدی کوڕی پێنجوێنیی بە ناوبانگ، لە باشماخ دەبێ. پاش نوێژی جەژن بە عادەتی ئەو زەمانە دەبوایە بچوونایە بۆ لای فەرەج بەگ کە خەریکی کردنەوەی مەرزا میرانشا بووە. هەموو پێکەوە دەچنە لای فەرەج بەگ، ئەویش دەزانێ مامۆستا قانع گاڵتەچیو شۆخە. دەڵێ: کێ قورئانی پێش نوێژی دەخوێنێ؟ مامۆستاش دەفەرموێ: بۆ قورئانخوێندنی پێش نوێژ بوو بە گەنم گەنم؟ ئەو وتی تۆ بیخوێنە، ئەویتر وتی تۆ بیخوێنە. بڕیار درا هەر کەس خوێندی هەڵەیەکی بوو، رێگێکی پیا دەکێشرێ. مامە ئەمینم وتی: من دەیخوێنم.

دەستی پێکرد هێشتا چەند لاپەڕەی نەخوێندبوو رەحمان کرد. هێندە بەردی لێدرا وەکو گوزڕە جوولەکەی لێهات.

## قانع و سەرەخۆشی

دیسان مەلا محەممەدی حافز گێڕایەوە وتی: پیاوێك هەبوو ناوی «مامۆستا مەلا محەممەدی سۆفی کەریم بەگ» بوو، کوڕێکی هەیە، ناوی ئەحمەدە، گێڕایەوە وتی:

باوکم مردبوو، خەڵکی زۆر هاتبوون بۆ پرسە. خەڵکی پێنجوێن و شلێر و مەریوان و شێخی چوێسە هەموو دانیشتبوون. مامۆستا قانع تەشریفی هێنا و منیش خێرا چووم دەستم ماچکرد. فاتیحایەکی خوێند و پاشان دەستی هێنا بە ریشیدا و فەرمووی: ئۆخەی حەمە گیان مردی و نەجاتت بوو بە دەست فاتەوە، ئۆخەی.

## قانع و شیعری خۆی

کاك حەمەی پێنجوینی و گێڕایەوە و فەرمووی:

قانع دەچێتە حوجرەکەی دێی «نزارە»، فەقێکان نایناسن. شەو باسی شیعر دەکرێت، یەکێك لە فەقێکان دەڵێ: من ساڵێك زیاتر لەگەڵ قانیعدا بووم. شیعری قانع لە یەك

دەدەنەوە و مانایدەکەن. قانع مانای یەکێك لە شیعرەکان پەسەند ناکات و دەڵێ: مەبەستی شاعیر ئەوە نەبووە. فەقێکە دەڵێ: لە کاتی وتنی ئەم شیعرە من لەگەڵیدا بووم. مامۆستاش دەڵێ: تۆ لە بیرت نییە، ئەگینا مەبەستەکە ئەمەیە و بۆی شیدەکاتەوە. فەقێکە توورە دەبێ، دەڵێ: تۆ ئینکار دەکەی، هەتیوە ...، چونکە هێندە نەفامی نابێ ئەمشەو لەم حوجرەیەدابی. ئەویش و باقی فەقێکان دەڵێن: بۆ خاتری خوا بەم شەوە بۆ کوێ بڕوات؟ بچێتە دەرەوە سەگ دەیخوات. فەقێکە دەڵێ: حەلیە سەگ بیخوا. نەفام و ئینکار دەبێ سەگ بیخوات. قانعیش ناچار لە حوجرە دەر دەچێ و دەچێتە مزگەوت و مزگەوت چۆڵ و تاریك و کێچی زۆر دەبێ. ئەو شەوە بە هەموو ناخۆشییەوە بەسەر دەبات. بەیانی زوو لە سەر کاغەزێك پارچە شیعرێك بۆ فەقێکە دەنووسێت و لە حوجرە بانگیدەکاتە دەرەوە و دەڵێ: من قانعم و ئەمەوێت تەعریفت بکەمەوە، لەم شیعرە بخوێنەوە و ئیتر خواحافیزت بێت.

بە داخەوە ئەو کەسەی کە ئەم نوکتەیەی بۆم گێڕایەوە شیعرەکەی لەبیر نەبوو.

## قانع و شێخێکی دەسەڵاتدار

کەمالی خاوەری

کاک کەمالی خاوەری گێڕایەوە فەرمووی:

مامۆستا قازی، بە رەحمەتبێ گێڕایەوە و فەرمووی: مامۆستا قانع لە کانیسانان مەلا بووە، پێش جەژنی قوربان خێزان و ماڵ بە گریان هێناوە بۆ تەدارەکی جەژن. ئەویش گۆشتی شکنەبردووە، یەکێ لە کەسێتیەکانی ئەو سەردەمە بۆ هاوینەهەوار هاتووەتە پشتی «دۆڵاش» (ولەگەور). ماڵاتێکی زۆری هەبووە، شوانی تایبەت لەوەڕاندوویە، مامۆستا پارچە شیعرێك دەنووسێ بۆی، دەیەوێ بەزمێکیش ساز بکات بۆ ئەوەی خەڵك لە بڕێ مەبەست تێگەن. جۆری ژیانی خۆی و ئەو کەسێتیە بخاتە دەمی خەڵکەوە و بڕێ شتی سەیریشی باسکردووە، ئەم پارچە شیعرە کە بە داخەوە زۆری لێ ونبووە دەنێرێ بۆ ئەو پیاوە:

وەرە قوربان لە سەیری جێژنی قوربان

سەماوەر پڕ لە ئاوە و دۆڵە بێنان

بە هەر حاڵێ برنج پەیدا کراوە

لەگەڵ نەختێ کەرەی دێی کانیسانان

وە لێکین داخەکەم بۆ رانە گۆشتێ

فیدای چێشتێ بکەین وەك قۆچی قوربان

ئەفەرمووی گیسکەڵێ، یا بزنە قرخێ

ئەبێ بزنی زەلام بێ و نەختێ ریش پان

بە جاخی وەك . . . . . . . . ی بالکی بێ

درۆزن بێ وەکو . . . . . . نی مەریوان

بە میێزەر هەر وەکو..........

بە ریشا هەر وەکو . . . . . کۆڵان

کە هاتە باسی ئەشعار و ئەدەب هەر

وەکو قانع غەزەلباز و سەناخوان

ئەم شیعرە بڵاو کراوەتەوە

ئەم شیعرە دەنێرێ بۆ ئەو کەسە، ئەویش بە دوو کەس لە موریدەکانی بزنێکی زۆر چاخ دەنێرێتە بەر دەرگای مامۆستا و مامۆستاش دەڵێ: کاکە من ناتوانم هیچی لێ بکەم، خۆتان زەحمەتەکە بکێشن و سەریبڕن، پاکیکەن. ئەوانیش دەستدەکەنە سەر برین و پاککردنی، خاتوو ئەمنە دەڵێ: برۆ لە ئاوایدا برێ دار و تۆزێ خوێ و چەند نانێکیش پەیدا بکە با تۆزێ گۆشت ببرژێنم بۆ ئەم پیاوانە، گوناحە. قانعیش دەڵێ: بە خوا ئەوەندەم ولووە بۆ ئەم شت و ئەو شت رووم نییە، ناچارم بە جۆرێ جوابیانبکەم کە برۆن و لە بیری خواردنەدا نەبن. دەپرسێ: ئەرێ برا ئەم بزنە تەمەنی چەندە؟ دەڵێن: نازانین. دەڵێ بە رای ئێوە ئەم پیرە، یا ...؟ ئەوانیش کە ئەمە دەبیسن زۆر نارەحەتدەبن و

پێیان وایە ئاسمان دێتە خوارەوە. بزنیش پاککراوە و ئامادە. خێرا ماڵەکە بە جێدەهێڵن و دەچنەوە و دەگەن بە خزمەتی ئەو پیاوە و بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕنەوە. ئەویش زۆر پێی ناخۆشدەبێ و دەڵێ ئامادەی بچن بانگیکەن. ئەگەر نەهات، مێزەرەکەی بخەنە ملی و بیهێنن. چەند کەسێك دێن و لە نزیکی دێی کانیسانان تووشی کابرایەك دەبن و ئەم بەسەرهاتەی بۆ دەگێڕنەوە، ئەویش خۆی دەدزێتەوە و بە راکردن دەچێتە ماڵی مامۆستا و خەبەری پێدەدا. مامۆستا هەر چەند کەوشی نابێ لە لاڕێوە لە نێو زەلەکەی زرێیارەوە بەرەو «چۆڕ» دەڕوا. ئەوە شەو تەقە لە دەرگا دەدا و دەچێتە خزمەتی سەیی چۆڕ. کە سەیی ئاگادار دەبێ، دەڵێ: قانع، دەبێ کەتێکت کردبێ، ئەگینا ئێستا بەم نیوە شەوە، ئەویش شەوی جەژن، نەدەهاتی. دەڵێ جارێ برسیمە، بفەرموو تێرمکەن، جا پاشان بۆت دەگێڕمەوە. پاش تێر خواردن بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە بۆ سەیی. سەییش چارەی نابێ، پاش نوێژی جەژن داوای لێبوردن دەکا لە خەڵکەکە و دەڵێ من شتێکم بۆ پێش هاتووە، دەبێ بچم بۆ دزڵاش. چاروایەك دێنن بۆ قانع و سەییش سوار دەبێ و پێکەوە دەچنە دزڵاش بۆ لای ئەو پیاوە. ئەویش کە خەبەری پێدەگا سەیی هاتووە خێرا لە ماڵ دەچێتە پیریانەوە و زۆر رێزیان دەگرێ و دەڵێ ئەبوایە من

بهاتمایە بۆ چۆڕ، شەرمەندەلکردم، بۆ خۆت زەحمەت کێشا؟ سەیی دەڵێ: نە بۆ جەژن موبارەکی هاتووم، نە بۆ دیان. لەگەڵ ئەم پیاوەدا هاتووم. دەڵێ: مەلاکەی کانیساانان نەبی؟ دەڵێ: بەڵێ وەڵڵا ئەوە. خێرا دەڵێ: زۆر بیرم لێکردووەتەوە کە چۆن تەمێکەم. بەڵام بەخشیم بە تۆ. پاش ماوەیەك خواحافیزی دەکەن و هەر یەکە عەبایەکی زەڕبالق عەرەبیان خەڵات دەکا و مامۆستا دێتەوە. پاش هاتنەوە خێزانی دەڵێ لە دوێنێوە ئەو منداڵانە دێن بە دەوری ئەو لاکەدا، دارمان نییە تۆزێ لە گۆشتەکەیان بۆ بیرژێنم. قانعیش دەچێتە بەر ماڵی خەلیفە و دەڵێ لەو گوێدرێژەم بدەنێ بیبەم بارێ دار بێنم. خەلیفە دەڵێ: وەڵڵا مامۆستا گوێدرێژەکەم (لەم رووتە) کۆپانی نییە. جلێکیشم نیە لێی بکەم. دەڵێ: ئێمە خۆمان جلمان هەیە، خێرا دەڕوا و عەباکە دێنێت، دەیەوێ بیخاتە سەر پشتی گوێدرێژەکە، خەلیفە دەڵێ: ئەوە چییە ئەوەندە جوانە تۆ دەیکەیتە کۆپان بۆ کەر؟ مامۆستاش دەڵێ: ئەوە عابایە، شێخ پێی داوم و منیش پێویستم نییە. خەلیفە: دەڵێ باوکەڕۆ خوا غەزەبمان لێدەگرێ، بیدە بە من ئێستا بارێ داری وشکت بۆ دێنم. مامۆستاش دەڵێ: زۆر چاکە. چونکە من پێویستم بە ئەوە نییە و منداڵەکانم برسین.

دەڵێن تا ئەم ئاخرە عەباکە لە ماڵی خەلیفەدا مابوو. دەیانبردە ماڵان بۆ تەبەڕوك.

## قانع و کەوشی هەمەدان

**کاك کەمالی خاوەری گێڕایەوە و فەرمووی:**

جارێکیان یەکێ لە دەسەڵاتدارەکان دەیەوێ بڕوا بۆ هەمەدان، بە مامۆستا دەڵێ چیت پێویستە بۆت بێنم. دەڵێ: کەوشم نییە جووتێ باتەم بۆ بێنە. دەڵێ: باشە. پاشان دەسەڵاتدارەکە دێتەوە لە هەمەدان و جووتێ باتەی بۆ دێنێ. لەو وەختە باتە دەخرایە ناو پاکەتێکەوە. مامۆستا پێڵاوەکان لە پا دەکا و بە سەر پاکەتەکەوە بە خەتێکی گەورە (ئەو شیعرە فارسییە مەشهوورە دەنووسی):

دولـــت بـــخران دادی و نـــعمت به سگان

پس ما به تـــماشای جـــهان آمـــدەایم؟

بە سەر دەرگای حوجوەکەدا هەڵیدەواسێ. پاش ماوەیەك، دەسەڵاتدارەکە چاوی بە تابلۆکە دەکەوێ و دەڵێ: دە تماشایکە، لە هەمەدان کەوشی بۆ بگری بە کۆڵەوە و ئەویش وات پێ بڵێ؟! مامۆستاش دەڵێ: «بە گوڵێك بەهار نایە».

# قانع و جاوی مزگەوت

**دیسان کاک کەمالی خاوەری لە مەریوان گێڕایەوە فەرمووی:**

جارێکیان یەکێ لە دەسەڵاتدارەکان جاوێکی زۆر بە خێر دەکرێ بۆ مزگەوت و رایدەخەن. مامۆستاش چەن منداڵی بێ جل و بەرگ ئەناسێ، جاوەکە دەهاتەوە بۆ ماڵێ بە خاڵوو ئەمنە دەڵێ پێکە بە بەرگ بۆ ئەو منداڵە بێ جل و بەرگانە و دەرپێیەکیش بۆ خۆم بدوورە. خاڵوو ئەمنەش دەڵێ: ئەمەت لە کوێ هێناوە. مامۆستا دەڵێ خوا کەریمە. پاش چەند رۆژ دەسەڵاتدارەکە، مزووری[1] مزگەوتەکە هەڵدەواسێ و ئەویش هەر سوێند دەخوا کە ئاگای لێ نییە. مامۆستا کە دەزانێ بێتاوانێك هەڵواسراوە، دەچێ و دەڵێ من بردوومە ئەو داگرن. من بە ئاشکرا بردوومە و هەموو دەزانن.

دەسەڵاتدارەکە مامۆستا بانگدەکا، دەڵێ: ئەم دەنگوباسە چییە؟ دەڵێ: دەزانی پیاوەتیم کرد ئەم جاوەم برد؟ لە بەر رێزدانان بۆ ئێوە، ئاخر من مەلای ئێوەم. دەڵێ: چۆن؟ دەڵێ: خۆت دەزانی هێندەم پینە لە پانتۆڵەکەم داوە، کە ئیتر جێگای نەماوە، هێشتا هەزار کونی تیابوو. دەترسام لە یەکێ لەو

---

1ـ مزور وشەیەکی کوردییە لە بناری شارەزوور بۆ شوان و کرێکار و مجێور بەکار دەبرێت، وشەیەکی کۆنی هەورامییە. مزد+وەر مزد هەقی ئیش و کار، وەر بە مانا خۆر، لە فارسیدا بە مانای بەکرێگیراو هاتووە کە ماناکەی هەڵەیە.

کونانەوە دەعباکەم بێتە دەرەوە بچێ بە چی ... براتا. ئەو کاتە جا دەزانی چ دەقەوما؟ دە کارێکی چاکم کردووە، یان نە.

ئاخر برا مزگەوت پڕە لە حەسیر و قالی. ئەو هەموو جاوەی بۆ چییە؟ لە کاتێکدا من و ئەو هەموو عالەمە رووتن و زۆر کەس لە بەر رووتی ناتوانن بێنە دەرەوە. جا ئەویش دەستدەکات بە پێکەنین و دەڵێت جاوی مزگەوت بنێرەوە، خۆم تۆپی جاوی ساقت بۆ دەنێرم.

## مامەڵەی تووتن و کەنگر

کاک حسێن دەشتی لە مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان لەماڵی «فەقێ ئەحمەدی باشماخی» بووین لە پێنجوین. فەقێ ئەحمەد هاتەوە لە مزگەوت، وتی بە عەبدوڵای کوڕی، مامۆستا قانع،

حسێن دەشتی

کاغەزێکی نووسیوە بیخوێنەوە. ئەم شیعرانەی نووسیبوو کە بە داخەوە من زۆر کەمیانم لە بیر ماوە. باقیەکەیم لە بیر چووەتەوە. چونکە چەند ساڵ لەو کارەساتە تێدەپەڕێ. لەو کاتەدا بوو کە قانع ماڵی لە «قەڵوەزە»ی شارەزوور بوو. لە شارەزوور تووتن نەبوو. کەس ئیجازەی

نەبوو توووتن بچێنێ. مامۆستا لەگەڵ ماڵی فەقێ ئەحمەددا دەچووونە ماڵی یەکتر. مامۆستا داوای شتی لە هیچکەس نەکردووە، مەگەر لە دۆستە نزیکەکانی کە خۆشی شتی داوە بەوان. نووسیویە کە فەقێ ئەحمەد توووتنی بۆ بنێری و جۆری مامەڵە و کڕین و فرۆشتن ڕوونەکاتەوە:

لەو توووتنە کەوا خەڵات لێت دزیوە
غەیرەز خوا نەبێ هیچکەس نەیدیوە
تۆزێ لەو زارە بۆ من بنێرە
چونکە بێتووتن داماوم لێرە
جا ئەگەر دەڵێی چۆن تووتنت نییە
هام لە شارەزوور دەسەڵات چییە
چوون لە شارەزوور توووتن ناکڕێ
ئیجازەی تووتن بە کەس نادرێ
لێرەدا چەند بەیتێ دیارنین:
بە هۆقەی قورس ئەکێشی گەزۆ
عالەمت کردووە تەواو ڕەنجەڕۆ
ڕۆن و کەرە و کەشک مازوو و گەنم و جۆ
هەزاران برسی و تۆیش تەسەل و کۆ
چاوێ کەرەوە خوا بناسە
خزمەتی هەژار نیشێکی خاسە

جا منیش بەھـــار کەنگر پێکەیی
ئاواتی زگـــی تـــۆ دێنمـــە دی
گیـــا پێگەیی کەنگرت بـۆ دێنـــم
دیدار دۆســـــی خۆم بەجێدەھێـنـم
کەنـگر پێگەیی مـــن دێم بۆ پێنجوێن
شاری گەزۆ و ماس ، گەرمو و ھەنگوێن
دێم بۆ لای ئێوە بە عــەزمی دیدەن
گیات بۆ دێنم بە ھـــۆفە و بە مەن
جا لـــێی دانیشە بەو کەنـــگرە کاڵە
فەقێ ئـەحمەد جا قولی لـێ ماڵە
جوان جوان تێر بخۆ بە کولاوی و کاڵی
بێنەرەو بە یـاد پیـــشەی منـــاڵی

مـــن تـــا ئێـــرەم لــە بـیرە بــە تێکـەڵی. بــەڵام باســـی زۆری کـــردووە. باســـی دەشـــق مـــەریوان و کـــەنگر ھەڵکـــەندنی شـــارەزوور و گـــەزۆ کـــردن و جـــۆری رۆنفرۆشـــان، جـــۆری موعامەلــــەی رەنجکێشـــە دێھاتییـــەکان لەگـــەڵ بازرگـــانی بـــازاڕدا. پاشـــان خـــەڵك ئـــەم شـــیعرانەیان دەخوێندنـــەوە و زۆر کەس رەفتاری لەگەڵ دێشینەکاندا گۆڕابوو.

## قانع و قسەی خۆش

**مـەلا محەممـەدی حـافز لـە زمـانی كەسـانێكەوە و كـاك حسـێنی دەشـتی، كـە خـۆی لـەوێ بـووە، گێڕایانـەوە و فەرموویان:**

شـەوێكیان لـە مـاڵی فـەقێ ئەحـمەدی باشماخی لـە پێنجوێن دانیشـتبووین، بـەفر و باران بـوو، ماڵەكـە دڵۆپـەی دەكـرد. عـەلی پزشكی (عـەلی حـاجی رەشـی باشمـاخ)یـش لـەوێ بـوو. عـەبدوڵای كوڕی فەقێ ئەحـمەد لـە دەلاقەیەكـەوە، كـە لـە بـەینی هۆدەكـە و بـە قـەوڵی ئیمـرۆژی ئاشـپەزخانەكەدا بـوو چـای دەهێنـا. كوڕێكـی ژنـبرای عـەبدوڵایش لـەوێ بـوو. مامۆسـتا فـەرمووی: ئـەرێ باشـە، ئەوە كاك عـەلی بـۆ گیرسـانەوەی دڵۆپـە چـووەتە سـەربان خـەریكی بانگردێنـە. ئـەوا حسـێن زۆڕیـا خۆشـدەكا. عـەبدوڵاش چـای دێـنێ، منیـش میوانم و پیرم، هیچـم پـێ نـاكرێ. ئـەی ئەمـە كێیـە لـە لـەڕ دەخوا و لە وشـك دەخـەوێ؟ ئـەویش وتـی: بـە خـوا ئەمـە، ژنـبرای عەبدوڵایـە. مامۆسـتاش فـەرمووی: ئـەها ئەمـە لـە خـێڵی دەرپـێ تێكـەڵن. كـوڕە ئـاڵۆز بـوو، رۆیشـتە ئـەو دیـو. پـاش ماوەیـەك كچـەكەی فـەقێ ئەحـمەد دێتـە ژوورەكـەو دەڵـێ: مامـە قـانع چـیت وتووە بە عـەبدوڵا، ئەوەتـە لـەو دیـو خەریكـە سـكی خـۆی دەدڕێ؟ قـانع فـەرمووی: هـەر سـكی ئێوە نـەدڕێ قـەیناكا، بـا سـكی خـۆی بدڕێ، سكی خۆیەتی با هەر بیدڕێ.

## قانع و سواریی ئەسپ

**کاک حسێنی دەشتی گێڕایەوە وتی:**

یەکێ لە ئاغاکانی مەریوان ئەسپێکی بە مامۆستا قانع بەخشیبوو، کە لە دیوانەکەشیدا باسیدەکات. فەقێ ئەحمەدی باشماخی زۆر جار بۆ زۆر جێگا لە خزمەتیدا چووە. جارێکیان لە باشماخەوە بەرەو دێی «پەنگیجە»ی مەریوان دێن. مامۆستا سواری ئەو ئەسپە لاتەیە و فەقێ ئەحمەد بە پیادە لە پێشەوە دەڕوا. بە مامۆستا دەڵێ: هەزار خۆزگەت بە من کە قول و قاچێکی توانام هەیە و ئەسپە لاتە نەبوەتە ملم. تۆ هەر بە من دەڵێی پیادە، پێت خۆشە گرەوێك بکەین؟ مامۆستا دەڵێ: چۆن؟ دەڵێ: ئێستا واین لە بەر بەردە رەشەدا، من بە راکردن و تۆش بە غار، هەر کاممان زوو گەیشتە «پەنگیجە» پیاتەوە. مامۆستا دەڵێ: باشە. ئەسپە لات لەێدەخوڕێ و فەقێ ئەحمەدیش بە راکردن. کە دەگەنە لای دێی پەنگیجە فەقێ ئەحمەد زۆر لە پێشەوەیە و ئەسپە لات هەر قولتەی دێ. مامۆستا بانگدەکا مەڕۆ، مەڕۆ، برا بردتەوە، من پیادە، جا لەو سەفەرەدا شیعری ئەسپەکەی وتووە، لە دیوانەکەیدا هەیە.

# قانع و دۆینە و رۆن

**کاك یوسف گێڕایەوە و فەرمووی بابەتایەر[1] گێڕاویەوەتەوە: مامۆستا قانع فەرمووی (نازانم بابەتەکە هی کامیانە)**

جارێکیان لە شاربازێڕ رێم کەوتە دێیەك کەسم نەدەناسی. بیرمکردەوە خوایە بچمە کوێ. تووشی شوانێك بووم و پرسیارم لێکرد، لەم دێیەدا چ کەسێك ناودارە و ناندارە؟ وتی: خەلیفە فلان. وتم ژنەکەی ناوی چییە و منداڵەکانی یەکەیەکە و ماڵەکەیان چۆنە. تایبەتییەکانی‌تریش هەر چی پێویستبوو وەرمگرتن و یەکسەر چوومە ماڵی خەلیفە و سەیرمکرد ژنێك وێستاوە. پرسیارمکرد: خەلیفە ژن، فلان لە ماڵە؟ وتی: نەوەڵلا. ئێستە چووەتە دەرەوە. خەریکی پرسیار کردن بووم لە خەلیفە ژن: کورەکان، سەعید چۆنە، حەسەن چی دەکا و کچەکان چۆنن، فاتە چۆنە؟ خەریکی چین؟ خەلیفە هاتەوەو ئەم پرسیارانەی پێ سەیر بوون کە من چۆنیان دەزانم. وتی بێشەدەبی نەبێ جەنابتان چۆن تەشریفتان هێناوە؟ منیش وتم: خەلیفە ئەم پرسیارە لە من مەکە، لە شێخەکەت بپرسە. بردمیانە ماڵەوە و زۆر رێزیان لێگرتم. لەوەندە رۆنیان کردبووە ناو دۆینەوە کە بە جەدت دەتتوانی مێزەرەت لەبەری بپێچایەتەوە.

---

1ـ بۆ ناسینی ئەم گەورە پیاوەش سەرنجی پەراوێزی پاشکۆ بدەن.

## قانع و عەبدوڵاخانی دزلی

سەی باقری شێخ‌الاسلامی

کاک سەی باقر شێخولئیسلامی دانیشتووی شاری مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:

ڕۆژێک لە دوکانی «حاجی عەبدوڵای پەرتەوی» لە مەریوان دانیشتبووین، خوالێخۆشبوو «عەبدوڵا خانی دزلی» هاتە دوکانەکە و وتی: "ئینە مامۆستا قانعەکەو وێمانە؟"[1] ئەویش فەرمووی: بەڵێ و دانیشت. لە پێشدا بڕیار درابوو من بچم شەکر بکڕم. مامۆستا فەرمووی: باقر شەکرەکەت کڕی؟ عەرزمکرد: ئێستە دەچم دەیکڕم. «عەبدوڵاخان» وتی: من پارەی شەکرەکە دەدەم. مامۆستا فەرمووی: من و تۆ هێندە پێکەوە نەبووین کە من بتوانم پارە لە تۆ وەرگرم. خان هەرچی هاواریکرد مامۆستا قەبوولینەکرد.

## قانع و عەلی خانی ولەژێر

شێخ مەحمووی کانی‌سانان و کاک حەمە غەریبی ولەژێری و کاک سەی باقر گێڕایانەوە و فەرموویان:

مامۆستا قانع نامەیەک بە شیعر دەنووسێ بۆ خوالێخۆشبوو «عەلی خانی ولەژێر» و دەڵێ:

ئاشێکم هەیە لەو شارمزوورە

چەن سەعات ڕێگە لە خۆمەو دوورە

---

1ـ هەورامییە، واتە ئەمە مامۆستا قانعەکەی خۆمانە.

کەرێکم ئەوێ مزەی پێ بێنم
بەو مزە ناشە منالْ بژێنم
کەرێکم ئەوێ شان و ملپانبێ
وەك ... زۆر بە عینوانبێ
وەك ... شان و مل قەوی
ئەرگسەی کلکی بدا لە زەوی
منیش لەو ماڵە کەرێکم ئەوێ
بە هەموو شەرعێ ئەومە ئەکەوێ
وەك ... دەم بە پێکەنین
بە وێنەی ... دڵی پڕ لە قین

ئەم شیعرانە زۆر بوون هەر ئەوەیان لە بیرە. وەگەرنە تەواوی چەوسێنەران و برێ لەوانە کە فیز و فەلاسقەیان بووە دەگرێتەوە. برێکیشی لە دیوانەکەیدا بلاّو کراوەتەوە.

## قانع و دەورەی دوکتۆر موسەدیق

ئوسا حەمەئەمینی هەلاکۆ

چوومە خزمەتی ئوسا حەمەئەمینی هەلاکۆ خەڵکی «نێ»، دانیشتووی مەریوان، کە بیستبووم چووەتە خزمەتی مامۆستا و لەم بارەیەوە پرسیارمکرد، ئەمە دەقی وەلامەکەیەتی: لە دەورەی دوکتۆر موسەدیقدا پارچە شیعرێك بلاّو دەکاتەوە. لەو وەختەدا زۆر بووەتە دەنگوباس، کە بە داخەوە من تەنیا دوو

تاکەیم لە بیر ماون، کە باسی ئیستیعمار و نەوتەکەی ئابادان و دەستی بێگانە دەکا و دەڵێ:

ایا ای ابادان هم درد دردم

ایا ای ابادان هم رنگ زردم

من و تو هر دو در چنگال ابلیس

گرفتاریم به صدها سحر و تلبیس

ئەم شیعر و نووسراوە دەکەوێتە بەر چاوی دوکتۆر موسەدیق. موسەدیق بۆ تیمسار ئەحمەد بەهارمەست دەنووسێ: لە هەر کوێبێ ئەم قانعە پەیدا کە و داوای لێکە بێت بۆ لای من. ئەم پیاوە کە ئاوەها ئاگری تێبەر بووە لە داخی بێگانە پەرەستاندا لە ئێران دەرچووە، هەرچی زووتر وەسیلەی گەڕانەوەی فەراهەم کە، چونکە ئەو کەسانە کە دەرد دەناسن دەرمانیش دەزانن.

تیمسار بە هارمەست دەپرسێ کێ لە عێراقدا قەوم و خوێشی هەیە دەتوانێ بچێتە ئەو دیو. وتبوویان «حاجی عەبدوڵای نبی» (حاجی عەبە شێت) ئەویش بانگیدەکات و دەینێرێ بە شوێن مامۆستادا و نامەکەی موسەدیق و خۆشی نامەیەکی جوان دەنووسێ و داوای لێدەکا بگەڕێتەوە بۆ ئێران. ئەو کاتە مامۆستا لە کەرکووک دەبێ و شاگردی چاخانە دەبێ. حاجی عەبدوڵا دەچێتە خزمەتی و نامەکانی دەداتێ و داوای لێدەکا بگەڕێتەوە چونکە شایەتی نەماوە و دەورە گۆڕاوە و

دەورەیەکیتر هاتووە، پێویستە بگەڕێتەوە بۆ ئێران و بڕیار دراوە داواکارییەکانی جێبەجێ بکرێن و چەوسێنەران تەمێبکرێن. بە داخەوە نامەکان و شیعرەکانم لە بیر نین. مامۆستا دەگەڕێتەوە و دێتە مەریوان و لەگەڵ حاجی عەبدوڵادا چاویان بە بەهارمەست دەکەوێ. بە رەزای خوا ئەو دەگاتە مەریوان و بڕیارە بەیانی بچێ بۆ لای موسەدیق، ئەو شەوە کوودەتا دەکرێ و موسەدیق لا دەبرێ و مامۆستا بە نائومێدی دەگەڕێتەوە بۆ جێگای خۆی. بەهارمەست زۆری رێز لێنابوو، بەڵام ئیتر هیچ نەکرا. بەداخەوە ئوسا هەمە ئەمین شیعرەکانی لە بیر نەمابوون، زۆر گەڕام بە شوێن ئەو شیعرانەدا تا بەڕێز کاک سەی باقری شێخولئیسلامی کە زۆر یارمەتیدام لەم بوارەدا، بڕێک لە شیعر و بەسەرهاتەکەی دەزانی، بۆی روونکردمەوە و پاشان بەڕێز کاک وریا قانع چەند وشەی نەزانراوی بۆ راستکردمەوە، ئەمە فەرموودەکەی کاک باقر:

تیمار بەهارمەست فەرماندەی نیزامی کوردستان، کەسانێ دەنێرێ بۆ لای مامۆستا و داوای لێدەکا بگەڕێتەوە. ئەمیش وەڵامیداوەتەوە. هەڵبەت تیمار لە پەیامەکەیدا ئیدیعای ئازادی دەکا و دەڵێ چەوسێنەران سەرکوتدەکا و ناهێڵێ زۆرویژەکان بە زۆروێژی درێژە بدەن و مامۆستاش هەموو ژیانی بە شوێن چارەسەرکردنی ئەو وەزعە نالەبارەدایە و دەگەڕێ بە شوێن کەسانێکدا تیمارێکی زامە ناسۆرەکان بکەن. زەمانی موسەدیقە،

جا هەر کەس وتبێتی لەم بارەیەوە هەنگاوێك هەڵدەگرێت خێرا ئافەرینی بۆ دەکا و هەڵیدەنێ بەڵکو راستبکا. ئەم شیعرانەی بۆ دەنووسێ و هانیدەدا بۆ ئەوە لای خوار و خۆی ئازار و ئەزیەتی خەڵك نەدا و نیرووەکەی لە کوردستاندا کەمتر سەرکوتبکەن، بە بیانووی سەرکوتکردنی عەشایرەوە خەڵکە هەژار و بێدەرەتانەکە نەچەوسێنێتەوە. بە داخەوە کاك باقریش هەموو ئەم شیعرانەی لە بیر نەمابوون. تەنانەت ئەوەشی کە لە بیری مابوو چەند وشەیەکی بۆ راست نەبوونەوە. شیعرەکە بەم جۆرەیە:

ایا کرد کردان ایــــــران زمین
ایـــــا ... شیـران غریـــــن
ایا صـــــــــــدر روز تنگانه‌ای
ایا تیر در چشـــــــــم بیگانه‌ای
بسی شکر کردم که در کردستان
شده جایگاه چون توی قهرمـان
نــه تنها من از خـــاک بیگانه‌ام
نه تنها من از داغ دیوانـــــــه‌ام
نـــــه تنها منم دور از خاک و آب
نه تنـــــــها دل من بسان کباب
هزاران زمــن خلق شــــیداترند
ز درگاه بیـــگانه رسواتـــــرند

عجـب دارم از چون توی نامدار

نپرســــد ز احوال ویل و دیار

ز ظلم خوانین و اعیـــان و بک

ز زخم سنـــان و دندان ...

عراق آبادان گشت و ایران خراب

دل میـهن از داغ در اضطـراب

بهار شود، مســت گردد هوزار

شود مرهـم نیش دلهـــای زار

جا تیمسار ئەحەدی بەهارمەست وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

ای قـانع دانا و ســـخن‌سنج و سخن‌دان

با طبع روان و دل بـی بـاک چوشیــران

بـا آن همه دلبستـــگی و مــهر فراوان

کـــه هست تو را برتر از همه‌ی مـردم ایران

برخـــیز و ز بیگانه‌زمـین زود برون شو

در میـهن و کاشـانه‌ی خود آی، درون شـــو

کی گفـت برو خانـــــه‌ی بیگانه زبون شو

در میــهن خود ویل و پریشان و نگـون شـــو

گر اهـــرمنان عـــــهد وفا را بگسستند

پیمانـــه‌ی مـــردی و مـــــدارا بشـکستند

در برخـــــودی و مادر و فرزند ببستند

تـــا این که نمودند که دیوانـــــه و مستند

بسی شکر که آن دوره رسیدست به پایان
آبـــــاد شده، مثـــــــل بهشت میــــهن ایران

مامۆستا جار جار بۆ ناردنی پەیامێك، یا روونکردنەوەی جۆری ژیانێك لە بەر مانەوەی لە مێژوودا بە شیعر و تەنز و شۆخی دەنووسی.

## قانع و خان و سەیید

کاك باقری شێخولئیسلامی گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا بە زمانی دوو کەس لە کەسێتییەکانی ئەو سەردەمەی دێی سەئاوا، سەییدێك و خانێك کە هەر دوو خاوەن موڵك بوون ئەم شیعرانە دەنووسیّ کە پێمان خۆشنەبوو ناویان بێنین:

این حــــــکایت شنـو زســـعد آباد
............ و ..................... خلاف المتاد

شیخ را از خجـــــالت شلتوک
گفت با خان از طریق سلــــوک

شیخ از گـرد راه و رنج رکـاب
گفـــــــت با خان از طریق عتاب

من و تو هر دو مـــالـــک خاکیم
هردو چون هم کراس چاک چاکیم

قدم من به سوال پیش‌تر است
پس چـرا شلتوک تو بیشتر است

تو نه سگ دیده‌ای نه خیله و خێل

نه بیابان و مکر و حیله و فێل

تف نکرده ز روت پیـــــــرزنان

نه گه رِیـــدی ز بهر لقمه نان

جوابی خان بە سەید:

سیدا تو چـــرا نـــمی‌دانـــی

شیـــوەی آدمی و انسانـــــی

دەمه داسی بیـار و ریش تـراش

دائمـــــــاً در پـی سوال مباش

نشنیـــدەای که افصح الشـعرا

در گلستـــان به شعر کرده ادا

هـر کـه برخود در سوال کـشد

تا بمیرد نیازمنـــــــــد بود

## قانع و پەسەك

سەی رەشید حسێنی

کاك سەی رەشیدی حسێنی کوڕی بابەتایەر (ناسـراو بـە رەشـەی بابـە تایـەر) گێڕایـەوە و فەرمووی:

قانع و بابەتایەر[1] دەچن بۆ سـنە. ئـەو کاتـە ماشین نەبوو، دەبوایـە بـە پـێ بڕۆشـتبان. شـەو

---

١ـ بابەتایەر پیاوێکی قسەخۆش و زیر و لێهاتوو بووە و خزمایەتیی نزیکی لەگەڵ مامۆستا قانعدا هەبووە، بۆ کورتەیەک لە ژیان و قسە خۆشەکانی بڕوانە بۆ ئاخری ئەم کتێبە.

دەچنە دێی «کەڕاوا»ی هەورامان. قانع ئەو کاتە پەسـەکی دەفرۆشـت، پەسەکێکی کردبووە بەری و پەسەکێکی‌تری کردبووە قۆڵی. یـەکێ لـە خانەکان لە بەر دەرگادا خاتوونێك ئاوبدەکرد بە دەستیدا و قانعیش لە ڕێگەکەوە تێدەپەڕی. کابرا بانگدەکا: پەسەك پەسەك. قانع دەڵێ: چـییە فەرمێی، فەرمێی؟ دەڵێ: ئەو پەسەکە دەفرۆشی؟ قـانع دەڵـێ: بـەڵێ. دەڵێ: بە چەند؟ قانع دەڵێ: بێمە ئەو جێگایەی تۆ و ئەو خانمە ئـاو بکـا بە دەستمدا هەر وا پێشکەشتبـێ. لا ناکاتەوە و دەڕوا.

## قانع و گێرانی لە دێی ‹سێف›

**کاك سەی باقری شێخولئیسلامی گێڕایەوە و فەرمووی:**

مـن زۆر بـە خزمـەتی مامۆسـتا قـانع گەیشـتووم. سـاڵی (١٣٤٢)ی کۆچـی هـەتاوی ماڵیـان هـاتبوو بـۆ مـەریوان. هـەر چەند تـازە خانوویـەکی لـە دێـی «نـزارە» دروسـتکردبوو، بـەڵام بـە هـۆی شـەڕی داسـەپاوی عـەرەب بـە سـەر کوردەکـاندا ئـاوارە بووبـوو. هێـزی سـەربازیی عێـراق هـاتبوو، ئـەویش خـۆی پێـە گێڕابوو بەجێیهێشـتبوو. لـە پێشـدا بڕیـار بـوو دۆسـتەکانی ئیجـازەی بـۆ وەربگـرن، بـەڵام نـەیوێرابوو دانیشـێ تـا ئیجازەکـەی بەرێـێ، هـاتبووە «سـاوجی» پاش شـەوێك بـەرەو «سـێف» و مـاڵی ئێمـە کـەوتبووە ڕێ. نـازانم کـام پـاو چـاك بـەو شـەوە نەوەسـتابوو،

خەبەری دابوو بە ساواك. ساواكیش دەیزانی ناتوانێ لە جێگایەكیتردا بگیرێتەوە جگە لە «سێف». هاتنە ماڵی ئێمە و گرتنیان و بردنیان بۆ قەسری قەجەر. ئیتر چوون و چیان بە سەر هات، كاك وریا چاكتر دەزانێ. مەبەستم ئەوەیە لە قەسردا نەفەرێكی خەڵكی سنە دەچێتە خزمەتی، ئێژێ ئەمە قانعەكەی خۆمانە؟ مامۆستا بووره ئیشتیا بووه. مامۆستا دەڵێ: ئەگەر راستدەكەی هەتا ئێستا چیم لێ قەوماوە وەكو ئەو شیرەی كە دایكت پێی داوی حەڵاڵتان بێ، بەڵام ئێستا بەرمدەن.

## قانع و نوێژی میوان

حەمە عەلی بەگی حەیدەری

كاك «حەمە عەلی بەگی كەڵەوێنجە»گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێكیان قانع لە ماڵێكدا میوان دەبێ و چەند كەسی تریش هەر لەو ماڵە میوان دەبن. یەكێك لە میوانەكان، كە بە درێژایی ژیانی نوێژی نەكردبوو، لەگەڵ مامۆستا، كە ئیمام دەبێ هەڵدەستێ بۆ جەماعەتكردن. پاش تەواوكردنی نوێژەكە، مامۆستا سڵاو دەداتەوە چاوی بەو كابرایە دەكەوێ. ئەو رۆژە چوارشەممەی مانگی سەفەر دەبێ، كە بە كوڵە چوارشەممەی مانگی سەفەر بە

ناوبانگە. مامۆستا پاش ویرد و ئەوراد خوێندن، کاتێ دەگاتە دوعا خوێندنی پاش نوێژ، دەڵێ: خوا بمانپارێزی لە شەڕی کوڵە چوارشەمە. خوا بمانپارێزی لە شەڕی ئەو نوێژەی ... چونکە نوێژەکە بۆ تۆ نییە. کابرا قەڵسدەبێ. مامۆستا دەڵێ: بۆیە وام وت ئیتر جارێکیتر جگە لە خوا لە کەس نەترسی ڕوودەربایسی و ڕیا نەکەی.

## قانع و پۆلیسێك

ئوستا «عەبدوڵڵای حەلەبیسان» گێڕایەوە و فەرمووی:

ڕۆژێك سواری پیکابێك[1] بووم لە «سەی صادق»ەوە بۆ پێنجوێن دەڕۆیشتم. لە ڕێگەدا مامۆستا قانع دەستی ڕاگرت بۆ پیکابەکە و لە سەرەوە سوار بوو بۆ پێنجوێن. لە بەینی پۆلیسێك و کەسێکیتردا دانیشت. پۆلیسەکە تۆزێ فیزی هەبوو، بە مەیلی خۆی دانیشبوو. مامۆستاش هەمیشە لەگەڵ وەها کەسانێکدا جۆرێکیتر بوو. بە پۆلیسەکەی وت: ئەو سەر جلتە لابە با جێگامان ببێتەوە. مەبەستی پاڵتاوەکەی بوو. پۆلیس زۆر قەڵسبوو، وتی: دەزانی کابرا سەر جل بەچی دەڵێن؟ سەر جل بە هی کەر و هێستر و ئەو شتانە دەڵێن. وتی:

---

١- پیکاب سەیارەیەکی ئامریکاییە کە کارخانەی شێڤرلێت دروستیدەکات، بەڵام چونکە یەکەمین جۆری وانت بوو کە هات بۆ عێراق بە هەموو جۆرە وانتێک دەڵێن پیکاب.

کاکی پۆلیس بۆ قەڵسەدەبی؟ ئەوە چییە لە بەرتا؟ وتی: جلە. وتی: دە مەگەر ئەمەت نەکردووە بە سەر جلە کانتدا؟ وتی: با. وتی باشە ئەگەر سەر جل نییە چییە؟ ئیتر پۆلیسەکە بێدەنگ بوو.

## قانع و منداڵ

مامۆستا زۆر منداڵی خۆشویستووە. ویستوویە هەر جۆر بووە سەرنجی منداڵ و لاو بۆ لای خۆی راکێشێ و زۆریان لەگەڵ دواوە.

## قانع و موشاعیرە

«مەحموودبەگی موستەفاسوڵتانی» لە مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:

من منداڵ بووم لەگەڵ چەند فوتابییەکی هاوەڵما لای فەقێکانی ئەڵمانە دەرسمان دەخوێند. لە سەرهانی حەوزەکە راوەستا بووین. مەلایەکی چاکشۆڕی لیباس کۆنە پەیدا بوو. وتی: منداڵەکان وەرن شەرە موشاعیرە بکەین. ئێمەش پێمان وا بوو شڕۆڵەیە و هیچ نازانێ، وتمان: چاکە. دەستمان پێکرد. ئێمە منداڵ و نەزان و هەر چیمان پێ بوو وەکو تفەنگچی ناشی خەرجمانکرد و دوایی ئەویش کێشامانی بۆ پیتی «ژ» کە لە سەرەتای شیعردا زۆر کەمە، پەکمان کەوت. خۆی دە پانزدە شیعری خوێندەوە کە بە ژێ دەستیان پێدەکرد و شیعری خۆی بوون، ئێمە دەمان بوو بە تەڵەی تەقیو. کاک سەعیدبەگی موستەفا

سولتانیش فەرمووی: باوکم زۆربەی شیعرەکانی مامۆستای لە بەر بوو، کە بۆ ئەم موشاعیرە خوێندبوویەوە، کە بە زاراوەی هەورامی بوو، بە داخەوە من هەر ئەم تاکەیەم لە بیر ماوە.

ژنێن ژاوەڕۆ، ژرێژە و ژیوار[1]

شیعرت پەی ماچوو کەروت گرفتار

لە پیر مامم، «حەمەڕەشید بەگی ئەڵمانە» پەیدا بوو، چووە خزمەتی. ئێمە سەرمان سووڕ ما. فەرمووی: کوڕینە ئەمە مامۆستا قانعە. پیاوێکە لە دنیادا ناسراوە. جێی ڕێز و خۆشەویستی هەموانە. پێم وایە من دوانزدە ساڵە بووم. تاریخ شەهریوەری بیست بوو.

ژیانی مامۆستا هەموو کات و ساتێ پەندە. دەرسی تاریخە، شەرەفی مرۆڤایەتییە. ئیسپاتی گەورەیی مرۆڤە. هەر قسە و داستانێکی بێدەلیل و بێحیکمەت نین، خۆڕاگریی لە بەرانبەر تانە و تەشەرەوە، لە بەرانبەر ڕووت و قووتی و برسیەتیی منداڵەوە، لە بەرانبەر چاوی فرمێسکاویی ژنەوە، لە بەرانبەر برسیەتی و سەرماوە، لە هەموو کەس نارەشتیەوە، جگە لە قانع و قانعەکان.

---

[1]ـ هەورامییە، واتە شیعرت بۆ دەڵێم و گرفتارت دەکەم.

## قانع و مودیری خورماڵ

«حاجی ئەحمەدی رەشیدزادە» گێڕایەوە و فەرمووی:

من لــە «نـەویێ» لای قـانع بـووم، مامۆسـتا قـانع مـەلای ئـاوایی نـــەوێی بنـــاری شـــارەزوور بـــوو. خـــەڵکی دێکـــە ژیانیـــان دابـــین نـــەدەکرد. لـــە «بەردەبـــەل» نـــزیکی نـــەوێ ئاشـــێکی نایـــەوە و دەســـتیکرد بـــە ئاشـــەوانی. بـــەیانی دەچـــووە لای ئاشـــەکەی تـــا ئـــێوارە و شـــەو دەگەڕایـــەوە. زۆر نـــەدار و بێـــەنوا بـــوو. تەنانـــەت ژێـــرە خەریشـــی نـــەبوو، لـــە ماڵـــە رووخـــاوێکدا بـــوو و زۆر بـــە ســـەختی دەژیا.

مودیـــری ناحیـــەی خورمـــاڵ (بەخشـــداری خورمـــاڵ) لەگـــەڵ چـــەند پۆلیســـێ ھاتنـــە دێـــی «نـــەوێ». موختـــار[1] و ریـــش ســـپیەکان کـــۆ بوونـــەوە و بـــەرەو پـــیری چـــوون. زۆر بـــەرێزەوە بـــەخێرھاتنیان کـرد. موختـار داوایکـرد بچـێتە مـاڵی ئـەوان. مودیـر وتـی دەچـمە مـاڵی قـانع. وتیـان: قـانع ھیچـی نیـیە و جێگـا و رێگـای نیـە و مـاڵێکی رووت و رووخـاوی ھەیـە بـۆ تـۆ نـاشـێ. وتـی: نـەخێر ھـەر دەچـمە نـەوێ، چـونکە بـە تایـبەت بـۆ لای ئـەو ھـاتووم. مـاڵی قانعیان پیشـاندا، روویکـردە ماڵەکـە. قـانع لـە سـەربانە رووخاوەکـە راوەسـتا بـوو کـە مودیـر گەیشـتە بـەر ماڵەکـە وتـی: قـانع چـۆنی؟

---

1ــ موختار= قێخا، دەھدار.

وتی: مەنسوور ئەوە تۆی؟ چۆن ڕێگەت کەوتووەتە ئێرە؟ خێرا سەڵتەکەی داکەند و بۆی ڕاخست. وتی: فەرموو هەر ئەمە شکدەیەم لە سەری دانیشە. خەڵکی ئاواییش دەوری مودیریان دا و زۆر جەنجاڵ بوو، خێرا چایان هێنا. مودیر کە بە «مودیرە سوور» بە ناوبانگ بوو تەماشای ماڵە ڕووخاوەکەی کرد و وەزعی قانعی دی. بە دوو کەس لە پۆلیسەکانی وت: خێرا، بە سواری بگەڕێنەوە خورماڵ سندووقێك چا و فەردەیەك شەکر و قالیەك و دەسێ جێ‌وبان و پشتێ بێنن و بگەڕێنەوە. وتی بە موختار، ماڵێکی پاك و تازە حازر کە با بیکرم بۆ قانع. ئیتر تا ئێوارە مودیر لای قانع مایەوە و باسی زەمانی فەقێیەتیان دەکرد و شیعریان دەخوێندەوە و باسی بیرەوەریی ئەو ساڵانەیان دەکرد کە پێکەوە بوون و هەموو ئەو خەڵکە لە دەوریان بوون گوێیاندەگرت. لە بیرمەدێ قانع وتی: مەنسوورە سوور من و تۆ ڕەفیق بووین. تۆ ملت دەڵێی ملی ...ـە چۆن تۆ بوویتە مودیر و من ئاشەوانم. مودیر هەر پرسیاری لێدەکرد. وتی: قانع چەند منداڵتان هەیە؟ وتی: چەندەی نازانم. هەرزاڵێکمان بەستووە، «پووش» و «لەپان» مان بە سەردا داوە. لە بەر بێنوێژی مەغریب دوای نوێژ من لە پەسا دەدەم بە دەست ئەمنەوە بۆ سەر هەرزاڵەکە هەتا خەوتنان، ڕۆشندەکا لە دەستی ئەمنەیان دەگرم

تا خۆر دەکەوێ. درۆ ناکەم قانع هێندە نەدار بوو کەس لەو نەدارتر نەبوو. زۆر بە زەحمەت دەژیا، بەڵام پێکەنین لە سەر زمانی نەدەتارا و ناشوکر نەبوو. جگە بۆ شۆخی، گلەیی لە ژیان نەدەکرد.

ئەم داستانەم (واتە هاتنی مودیری خورماڵ بۆ ماڵی قانع) لە چەند کەسێکی‌تر بیستووە. بەڵام کەسانێ لایان وابوو مودیر دووجار چووەتە دیدەنی، کە جاری دووەم قانع ماڵ و فەرش و شتەکانی فرۆشتوون. مودیر لێی دەپرسێ: کوا شتەکانت؟ دەڵێ: قەرزاریی ئاشەوانی پێی فرۆشتم. قەرزەکانم داونەتەوە. مودیر دەڵێ: جێگایەکی چاکم بۆ داناوی ببیتە کارگێڕ. دەڵێ: شەرتی چییە؟ دەڵێ: شەرتی چی؟ دەڵێ: تۆ بوویتە مودیر شەرتیان بۆ دانەناوی؟ دەڵێ: با، دەبێ پەیڕەوی یاسا و دەستوور بی. دەڵێ: یاسا و دەستوورێك ئینگلیس دەریکا و نووری سەعید مۆریکا بۆ من بەڕێوە ناچێت. پاش چەند رۆژێ دەرمدەکەن، لەوانەیە بەندیشم بکەن. مودیر دەڵێ: دەمی خۆت بگرە هێندە مەڵێ. قانع دەڵێ: ئاخر وتم دەبێ خۆت بفرۆشی بەو پارەیە کە دەتدەنێ. دەمت هەڵدووری و بێدەنگ بیت. وەکو عەرەب دەڵێن «اُسکُت کما سکَتَ الدُجاجة تحت الدیك». من بێم لە ژێر تۆدا ساکتبم و تۆ لە ژێر قایمەقامدا و قایمەقام لە ژێر

موحـافیزدا تـا دەگاتـە نـووری سـەعید و ئـەویش لـە ژێـر بەچـکە زۆلـێکی ئینگلیـسیدا ساکتبـێ. جـا کاکـە مـن بـۆ ژیـانێکی چـەند رۆژە، چـۆن ئیشـی وا دەکـەم؟ مودیـر دەڵـێ: وا نیـە. ئێسـتە مـن هەرچی مەیلمبـێ دەیلـێم. قـانع دەڵـێ: کاکـە مـەیلی نیـە. ئەگـەر بە مەیلی ئەوان نـەبێ، نابیـە مودیـر. مەگـەر مـن و تـۆ لـە حوجـرەدا رەفیق نەبووین؟ من لـە تـۆ خوێندەوارتـر نـەبووم؟ لـە سێبازیشـدا لـە تۆ ئـازاتر نـەبووم؟ دەی چـۆن «غابـات»یشـیان لێسـەندمەوە؟ مەگـەر لـە شـەریکە لـە سـەر کرێکـاری دەریانـەکردم؟ مەگـەر مامۆسـتای قوتابخانە نەبووم؟ دەریانەکردم؟ بۆچی تۆ دەر ناکەن؟

چـونکە «حـاجی رەشـیدزادە» خـۆی لـەوێ بـووە بـە چـاوی خـۆی دیویـە زۆرتـری لـێدەزانی بـەڵام ئـەو شـیعرانەی بـۆ مودیـری نووسـیون حـاجی رەشـیدزادە بۆمـانی نەگێڕانـەوە یـا جـاری دووەم وترویـەتی یـا حـاجی لـە بیری نـەماون. جـا هـەر وەهـا کـە دانیشـتبوون لـە سـەر کاغەزی سـپی کەللـە شەکرێك نووسـی:

چ فـەرقێکی نییە لای مـن گـەدایی یـا خـۆ پاشای

که هەر دوو هەر ئـەمانەتین خەیاڵی تەختی شا ناکەم

هەزار رەحمەت لە ئوستادم شەوێ بۆ تەربیەم فەرمووی:

ئەگـــەر من قـــانعم ناوە، چ بێ ئەمری خوا ناکەم

## قانع و دوعای چەور و شیرینی[1]

لە کاتێکدا ماڵی لە کاڵ بووە ژنێك دێ بۆ ماڵیان و بە خاتوون ئەمنە دەڵێ بە مامۆستا بڵێ دوعایەکم بۆ بنووسێ. خاتوون ئەمنەش بە مامۆستا دەڵێ: ئەم خانمە هاتووە دۆعای بۆ بکەی. ژەمووڵکەیەك[2] کەرەشی هێناوە بۆمان. مامۆستا دەفەرمێ: دوعای چی دەوێ؟ خاتوون ئەمنە بە عادەتەکەی هەمیشەیی کە دەیوت یا شێخ، دەڵێ: یا شێخ دۆعای «چەور و شیرینی» دەوێت، بۆ ئەوە لای شووەکەی خۆشەویستبێت. شووەکەی بیری ژنهێنانی لە سەر لاچێ. مامۆستاش دەفەرمێ خانمەکە ئێستە بە ئەمنە دەڵێم بەو کەرەیە کە خۆت هێناوتە هەموو لەشت چەور کە و پاشان شەکرمان هەیە بیهارێت و بیکا بە سەر کەرەکەدا. جا دەچیتەوە شووەکەت شەو هەتا بەیانی دەیلێسێتەوە. چونکە هەم چەورە هەم شیرین. خاتوون ئەمنە دەڵێ: یا شێخ شۆخی مەکە، وەڵامەکەی بدەرەوە. مامۆستاش کاتێ کە ژنەکە دەبینێ ئافرەتێکی زەحمەتکێش و خەریکی ماڵات بەخێوکردنە و نەگبەتی شووە بە خۆیدا و بۆنی دێت. دەفەرمێ: ئاخر شەرتی هەیە. دەتوانێ بیبا بەرێوە، ئەوە شووەکەی خۆشی

---

[1] ـ دوعای چەور و شیرینی، کەسانێکە دەیاننووسی بۆ ژن خەڵەتاندن و پارە لێسەندن.

[2] ـ بە قرتوکێکە بە قەد هەنارێکە پڕە مەشتێکە کەرەیان دەوت ژەمووڵکە.

گەرمەك دەبێ. ئەگەر ناتوانێ ئیتر هیچ. ژنە دەڵێ: هەرچی شەرتی هەیە بەرپێوەی دەبەم. چونکە منداڵم هەیە، حەز ناکەم سەریان لێ بشێوێت. مامۆستا دەفەرمێ: تەنەکەتان هەیە؟ دەڵێ: بەڵێ. دەڵێ: هەر دوو رۆژ جارێ بیخە سەر کوانووەکە و لە کاتێکدا شووەکەت نییە لە ماڵ پڕیکە لە ئاوی گەرم و جوان، بە سابوون خۆت و جلەکانت بشۆ. هەموو رۆژێ جارێ سەرت بە شانە دابهێنە و مەهێڵە رشك و شق وات بە سەرەوە بێت. ئێواران کە شووەکەت دێتەوە پێش ئەوەی قسە بکا، بچۆ بە دەمیەوە و شتێکی بۆ راخە و خێرا چای بۆ ساز کە و بەخێرهاتنی بکە. لە لای وردەواڵە فرۆشەوە ئەلقەنی بکڕە لەگەڵ مێخەك بیکە بە یەخەتدا، یەك مانگ وا بکە جا ئەگەر چاك نەبوو، خەبەرەکەم بۆ بهێنەوە. ژنەکە دەڵێ دە هەزار جار بە خوا هەمووی جێبەجێدەکەم.

ژنە دەڕوا و دوای ١٥ رۆژ دێتەوە بۆ ماڵ و کیتەڵەیەك ماست و بەرمەشکەیەك کەرە دێنێ بۆیان و بە خاتوون ئەمنە دەڵێ: عەرزی مامۆستا بکە خوا دەستبگرێ بە تەمەنیەوە، دەم و نفووسەکەی هێندە چاکبوو، شووەکەم خەریکە بمخوا، هێندەی خۆشدەوێم مەگەر خوا بزانێ. بیری ژنهێنانی لە سەر لاچووە،

مامۆستاش دەفەرمێ: خوا شوکر کە ئەوان ژیانیان لێ نەشێوا، بەڵام دەبێ ئەم کارانە هەر بەر دەوامبن.

ئیتر ژنەکە بە خۆشییەوە دەچێتەوە. خاتوون ئەمنە بە مامۆستا دەڵێ خەریك بوو نەیناسمەوە هێندە پاك و بۆنخۆش بوو.

## قانع و لەغز و موعەمما

مامۆستا هەموو خەڵکی خۆش ویستووە، بە تایبەت لاو و قوتابی و خوێندکار. زۆر جار شیعری بۆ خوێندوونەتەوە. وەکو عادەتی ئەو سەردەمە «لەغز» و «موعەمما» و «مەتەڵ» لە ناو خوێندەوارانیدا باو بووە، زۆر چاکی لێ زانیوە و لەگەڵ مەلا و فەقێدا شیعری زۆری لەو بارەوە وتووە و حەزی لە دانیشتنی لە ناو فەقێ و مەلا کردووە. «مامۆستا سەی مەحموود» پێشنوێژی مزگەوتی «والی» سنە گێڕایەوە و فەرمووی:

من و خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەدی ئارەنانی و دوو فەقێی‌تر چووین بۆ ماڵی مامۆستا قانع لە «کەولۆس»ی شارەزوور. گەیشتینە بەرەوە، پاش بە خێر هاتن بە عادەتەکەی خۆی کە بە خێزانی دەوت «یا شێخ»، فەرمووی: یا شێخ چیمان هەیە بیهێنە با بیخۆین. ئێمە تازە نانمان خواردبوو، گوێمان لە قسەخۆشەکانی و شیعرە جوانەکانی گرت، تا گەیشتە «موعەمما» و «مەتەڵ». من عەرزمکرد: قوربان، من ناوم مەحموودە شیعرێك بە ناوی مەحموودا بفەرموو. تۆزێ بیریکردەوە فەرمووی:

مح تاجە بە مــوداى دەمى تێغى بڕۆدڵ

بینێ لــە دڵم شەرتەکەی ئایم نەبێ ئێستا

واتــە «مــح» بێتــە تــاج بــۆ «مــوداى» دەبێتــە محمــوداى. دەمــى تێغ و برو دڵ ئەگەر بــیێ لــە دڵــم بــەڵێن بــێ وشــەی «اى» لابــەم. یــانى «اى» لــە «محمــوداى» لابــە دەبێتــە «مــەحموود» وتــى ئێمــە هەموو لەو زیرەکی و لێهاتوویییە سەرمان سوڕما.

## قانع و ئاغایەکی کورد

«مامۆستا ئەولخالقی ریشێن» گێڕایەوە و فەرمووی:

لــەو کاتــەدا کــە مامۆســتا مــاڵی لــە شــارەزوور دەبــێ، یــەکێك لــە مالیکــەکانی ئــەو ســەردەمە لــە جوتیــارێك، کــە پێیــان دەوت رەعیــەت، ئــاڵۆز دەبــێ و فــەرماندەدا هەڵیواســن و دارکاریکــەن، کــەس ئــاوێرێ داوای لێــبوردنی بــۆ بکــا. ناچــار پــەنا دەبەنــە مامۆستا قــانع و دەڵــێن بــەڵکوو تکایــەك بکــەی، ئــەم دامــاوە بــەرەڵا بکــا، هــیچ تــاوانێکی نیــە. مامۆســتاش نامەیــەك و ئــەم چــوارینەیە دەنووسێ و دەینێرێ بۆ ئاغاکە. ئاغاکــە نامەکــە دەبــینێ خێــرا کــابرا دەبەخشــێ و زەوینــێکی بــە خــەڵات دەداتــێ: ئاغــا کــە خــۆی بــە کوردی لایەنگری ماڵی کورد زانیوە.

تفی تۆ ریشــــــى تەڕ کردم براکەم

شــــەق و گورزت دڕانوویە کەواکەم

پرووکاوم لە ژێر لۆســـــەی جەفاتا

لەدەس تۆ، یا لەدەس .یابە، هەراگەم

ئەم چوارینەیە بڵاو نەکراوەتەوە

مەبەستی مامۆستا لە یابە عەرەبەکانە.

## قانع و کاڵەك

مەلا محەمەدی نەنەیی

«مامۆســـتا مـــەلا محەممـــەدی نیکپـــەی» (نەنەیی) دانیشتووی نەنەی مەریوان فەرمووی:

لە پێنجوێن فەقێ بووم. رۆژێك مامۆستا قانع هات بۆ حوجرە و کاڵەکێکی زۆر چـکۆلـەی بـە دەستەوە بوو. سفرەکەی ئێمەی راخســت. بـڕێ نان و قەراخی ژەمی پێشووی تێدا مـابوو. پاشـان هستا و لـە تاقەکەدا قورنانێکی هێنایە پاڵدەسـی دانا و تونکلی کاڵەکە چکۆلەکەی گرتەوە و وتی: فـەرموون. بـەڵام بیکـەن بـە خـاتری ئـەم قورئانە مـەخۆن. چـونکە ئـێوە نـانی ژەمـی پێشـووتان خـواردووە مـن نەمخواردووە.زۆرمبرسـیە. هێندەشم پارەنەبوو کاڵەکێکی گەورەتر بکڕم.

مامۆسـتا هەمیشـە گلـەیی و شـکایەتیکردووە لـە دەسـت ئـەو نووســەر و زانایانــە کــە نووســراوەکانیان بــە زمــانی بێگانــە نووسـیووە. فەرموویـەتی خۆزگـا هەرچییان دەنووسـی بـە زمـانی خۆیــان بیاننووســیبایە تــا ئێســتا فەرهــەنگ و ئــەدەبی ئێمــە دەوڵەمـەندتر بوایـە. زانایـانی زۆر بەدەسـەڵاتمان بـوون کـە دەیـان نووسراوەیان پێشکەشکردووە بە ئەدەبی غەیرە کورد.

ئەمەش خەسارەتێکە جێگاکەی پڕ نابێتەوە. خۆزگا «وضوحی» «مەلا نەبوبەکر» بە زمانی ئەو زەمانەی خەڵکی چۆڕ بوایا، نەك بە زمانی عەرەبی.

## قانع و حاجی مامۆستا و بێتووشی

مامۆستا زاهید جەلالی نۆدشی

«مامۆستا زاهید جەلالی نۆدشی»گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان من و خوالێخۆشبوو کاکم، مامۆستای پایە بەرز ئەحمەدی جەلالی و خوالێخۆشبوو «مەحیەدینی جەلالی» بە دیداری مامۆستا قانع شاد بووین، پرسی: کێن و خەڵکی کوێن؟ ئێمەش وتمان: خەڵکی نۆتشەین و کوڕی فلان. فەرمووی: بەڕای من نە «حاجی مامۆستا» و نە «بێتووشی» مەلا نەبوون و پێم نەخوێندەوارن. کاکم قەڵسبوو، ویستی وەڵامیداتەوە. ئێمەش زۆرمان پێ ناخۆشبوو. چۆن «حاجی مامۆستا» مەلا نەبووە؟ فەرمووی: دەزانن بۆ وا دەڵێم؟ ئەگەر «حاجی مامۆستا» و «بێتووشی» و بێتووشیەکان نووسراوە و فتواکانیان بە زمانی خۆیان بوو با وامان لێ نەدەهات. جا ئیتر ئێمەش هاتینەوە سەر خۆمان، زانیمان مامۆستا مەبەستی چیە. وتمان راست دەفەرمووی.

بەرێزێك کە بڕیار درا ناوی نەهێنین و هەر کەس ئەیەوێ ناوی بزانێ لە نووسەر بپرسێ، گێڕایەوە و فەرمووی:

کە باسی قانع دەکرێت بە راستی رۆحم شاد دەبێ. چونکە من ئیرادەتێکی زۆر و تایبەتم بە مامۆستاوە هەبوو.

دەتوانم بڵێم هیچکەس وەکو قانع قسەخۆش نەبووە و هیچکەس ئەوەندە بیر تیژ نەبووە. هەموو شیعرەکانی لە بیر بوون. ئەوەی کە پێم سەیر بوو ئەوە بوو کەدەهاتە مەجلیسی باوکم چەند کەس لەوێدا بوایەن هەموو دەبوونە گوێگر و لە هەر دانیشتن و کۆڕێکدا هەموو خەڵك گوێ بوون و قانع زمان بوو.

قانع بە راستی ئینسان بوو. ئەگەر بمانەوێ تاریفێك لە ئینسان بکەین، دەبێ بڵێین قانع بوو. نوکتەی زۆر گرنگی ژیانی قانع ئەوەیە پەیڕەوی باوەڕی خۆی دەکرد. بیر و بڕوای خۆی بەر نەدەدا. هەمیشە کۆڕ و مەجلیسی تایبەی نەزەر و رای خۆی دەکرد. دەبوت ئەوەی کە بڕوای پێ بوو، لە کەس و لە هیچ شتێك نەدەترسا. بڕوا ناکەم خوا کەسێکی تری وەهای خەڵقکردبێ. هەرگیز قانع رۆژێك لە رۆژان مونافیقانە نەژیا.

رۆژێك لە سلێمانی لە خزمەتیدا بووم. هەواڵی «شێخانی...» پرسی. (... دێیەکە لە سنووری بانە)

منیش ئەوەی کە دەمزانی عەرزمکرد. فەرمووی حیکایەتێکی خۆشی شێخ... دەگێڕمەوە.

من ئیستعارەم دەخوێند بۆ بەراوردی نیازی جل و بەرگ و کتێب. دەبوایە بە عادەتی فەقێیان دێ بە دێ و ماڵ بە ماڵ بگەڕایەم و داوای یارمەتیم لە خەڵك بکردبا، کە پێیان دەگوت «راتبە». بۆ راتبە کردن چوومە ماڵی شێخ... کە ماڵی لەو دێیە بوو. وتی ئێوە هەر فێر بوون سواڵبکەن. موفتەخۆری بۆتە پیشەتان، ئەگینا ئێوە فەقێ نین. منیش وتم دەباشە خۆ ئیشێکیترمان بۆ ناکرێ. جگە لە راتبە دەتوانین چ ئیشێکیلەر بکەین؟ شێخ هەر نەییست، هەر مەلا و و فەقێ کوتا. پاشان وتی باشە ئێستە چەند پرسیارێکت لێدەکەم وەڵام بدەرەوە. منیش وتم: فەرموون. وتی: یەکەم پرسیار «مجاز» تەعریف کە. منیش خێرا وتم «انت انسان» ئەمە مەجازە. حەقیقەت ئەوەیە دەبوایە بوتایە «انت حمار». خەریکبوو تێم هەڵچن ناچار بووم، خۆم ناساند وتم من قانعم. تازە ناوازەی شیعر و شاعریم بڵاو بووبووەوە، کە زانیان قانعم بێدەنگ بوون و یارمەتیی چاکیان دام.

## قانع و دەست ماچکردن

ئەم بەڕێزە دیسان فەرمووی، جارێکی‌تر مامۆستایەکی بەرز و ناسراو بۆی گێڕامەوە فەرمووی:

دەچووین بۆ سلێمانی. لە چایخانەکەی «شانەدەری» دابەزین. قانع لەوێ بوو. بەرە و رووی رۆیشتم و ویستم دەستی ماچکەم. دەستی نەدایە دەستمەوە. لە بەر و بە خێرایی فەرمووی:

گرێی بەختم بە هیچ دەستێ گوشادەی بۆ نەبوو هەرگیز
بە ناهەق لێوی خۆم ئیتر لە پشت دەستی مەلا نادەم

شەرتبێ دەستان ماچنەکەم. دەستی زۆر ماچکراوە، بە هیچ کوێ نەگەیشتین.

## قانع و جوانی

مامۆستا عەلایی ئەردەلان

ئەم بەڕێزە و کاک سەی باقری شێخولئیسلامی و مامۆستا محەممەد عەلایی ئەردەلان، سەردەفتەر لە سنە و چەند کەسێکی‌تر گێڕایانەوە کە مامۆستا فەرمووی:

بەیانییەك لە خەو هەستام، ئەمنە پێی وتم بە خوا هیچمان نییە برۆ شت بێنە. منیش هیچم شکنەدەبرد چووم بۆ لای «شێخ لەتیفی حەفیدزادە“ کوڕی

گەورە پیاوی کورد «شێخ مەحوودی نەمر»، دانیشتم. شێخ لەتیف فەرمووی قانع بۆچی پەشێوی؟ بەو هەموو ناشیرینییەوە خۆت ناشیرینتر دەکەی. هەر وا قسەمان دەکرد، وتی قانع قسەمت دەدەم بە خوا، خوا لە تۆ ناشیرینتری دروستکردووە، یان نا؟ منیش وتم ئەگەر پیشانت بدەم چی؟ وتی بە خوا سێ دینارت دەدەمێ. منیش بیرمکردەوە. بەیانی من هاتم ئەمنە خەنەی گرتبو و بڕیار بوو ناو ماڵ پاککاتەوە، جگە لە خەنەکە کراسە کۆنێکی بە سەر جلەکانیدا لە بەر کردبوو، لە بەر تۆز پەڕۆیەکی بە سەر خەنەکەدا بەستبوو. خێرا وتم بە شێخ هەستە بڕۆین پیشانت دەم. شێخم هەڵساند و کۆڵانە و کۆڵان تا بردمە بەر ماڵی خۆمان. کە دامان لە دەرگا و ئەمنە هات و دەرگاکەی کردەوە شێخ چڵەکاوە و هاتە دواوە. وتی قانع ئەمە کێیە؟ وتم لە پێشا بفەرموو من ناشیرینم یان ئەمە؟ وتی وەڵا ئەمە. وتم سێ دینارەکەم بدەرێ، جا پێت دەڵێم. سێ دینارەی دامێ و وتم: با شێخ ئەمە رەفیقی شەوانەی منە.

## قانع و هەی کاڵەک

«کاک رەئووف کۆشخانەیی» گێڕایەوە و فەرمووی:

من لە منداڵیدا ماوەیەکی زۆر لە خزمەتی مامۆستا قانعدا بووم، خزمەتیم دەکرد، بۆ زۆر شوێن لەگەڵیدا بووم. جارێکیان

بەرەو مەریوان دەهاتین. سواری کەرە رەش بووبوو. گەیشتینە بەر دێی «کۆڵان». کە زانی من لە بەر منداڵی پێم وایە مامۆستا قسە ناکا، بۆ ئەوەی لە بێدەنگی دەرمبێنێت. فەرمووی: ئا رەئووف گیان هەی کاڵەکێ بکە. منیش عەرزمکرد: قوربان ئا لەم زستانە ساردەدا و لەم دەشتەدا هەی کاڵەك چ سوودی هەیە؟ یا ئەگەر کەسێ هات و وتی کاڵەکم دەوێ چی بکەین؟ فەرمووی: پێی دەڵێین بەهار ئەم زەوینە دەکەینە کاڵەك و کاڵەکی چاکی دەبێ. بۆمان دەر دەکەوێ موشتەری هەیە یا نا. وتی جا ئیتر باسی ئارەزووی دوور و درێژی بۆ کردم و زۆر شتی لەبارەی بەرنامە و ئومێدی بە داهاتووەوە بۆم باس کرد. زۆر شتی فێر کردم. دیم مامۆستا وەکو خزمەتکارێ تەماشام ناکات. وەکو کەسێك بۆم دەڕوانێت. هەر لەم بارەیەوە و ئارەزووە درێژەکانەوە فەرمووی: رەئووف زۆر پێت خۆشبوو ئاغەی کۆڵان بوایەی و لەگەڵ ئاغەی دێی «سێف»دا لێتان بوایەتە شەڕ و بچوایەنە سەر ئاوایی سێف و ئاغەی سێف «شێخولئیسلامی»تان بە دیلی بگرتایە و جا بیانوتایە دەور دەوری رەئووفە. جا ئاغە و رەعیەتی بۆ شیکردمەوە و تێگەیاندم.

## قانع و حەرامیی سوڕنا

**دیسان كاك رەئووف گێڕایەوە و فەرمووی:**

جارێك لـە خورمـاڵ چـەند مەلایـەك كـۆ دەكاتـەوە و هـۆی حـەرامیی سـوڕنایان لێدەپرسـێ. ئـەوانیش هـیچ بەڵگەیـەك پیشـان نادەن، جگە لـەوە دەڵـێن نێـر و مێـە. مامۆسـتاش دەڵـێ: شـتی زۆر هەیـە نێـر و مێـە. ئەگـەر نێـر و مـێ حـەرام بـێ نـابێ كـەوش لـە پێكەن چوون نێر و مێیە.

## قانع و دوكتۆر

**دیسان كاك رەئووف گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆسـتا دەیـەوێ لـە «دایـرەی غابـات»دا، واتـە جەنگـەڵبانی دامـەزرێ بـۆ نەهێشـتنی دار بـڕین و گوێزانـەوەی بـە ماشـین. دەڵـێن دەبێ بچـی بـۆ لای دوكـتۆری بـاوەڕ پێكـراو، بـۆت بنووسـێ سـاغی و دەتوانـی ئـیش بكـەیت. مامۆسـتا دەچـێ بـۆ لای دوكـتۆر و نـۆرە دەگـرێ. كـە نـۆرەی دەگـا دەچـێتە ژووورەوە. ئـەم دوكتۆرەكـە دەناسـێ و دوكـتۆر ئـەم ناناسـێتەوە. دەڵـێ: هیچـم نیـە و هـاتووم بـۆم بنووسـی سـاغم و بگەڕێمـەوە بیمـە كرێكـار. ئـەویش دەڵـێ ئـا بـەم چـاوە جوانانەئـەوە؟ ئـەویش دەڵـێ نامـەوێ بچـم سـەعاتسـازی بكـەم. ئەمـەوێ ئەگـەر لۆرییـەدارم دی و نـەمهێڵم دارەكـە ببا. خـۆ

تۆ لە لۆری بچووکتری و دەتبینم. خێرا دوکتۆر دەزانێ، بەم قسە خۆشانەی دەبێ قانع بێ و ئیشەکەی بۆ چاك دەکا.

## قانع و دینداری

هەر وەکو پێشتر باسمانکرد، لە بارەی خواناسی و دینداریی قانعەوە، بەڵگەی زۆرمان پیشاندا، قانع زۆر جار ویستوویە بەپێی قورئان و حەدیس ئیش و کاری بکردبا. لە بەر نەیارن نەیوێراوە و فەرموویە: خۆزگا هەموو منداڵە کوردێك بیزانیبا بە کوردی مانای قورئان لێکبداتەوە. کاتێ دەیخوێند ماناکەشی بزانیبا. جا لەم بارەیەوە «کاك رەئووف رەحیمی» گێڕایەوە و فەرمووی، کاك حەمە رەئووف گێڕایەوە و فەرمووی:

من لە خزمەتیدا بووم. لە شۆڕشەکەی عەبدولکەریم قاسمدا، لە و دیو دووبارە ئاوارە بووبوو هاتبووە دێی سێف. لە حوجرەی فەقێکاندا دەژیان. خێزان و ماڵ لە حوجرەکەدا، من و خۆشی لە ژێرزەویی حوجرەکەدا دەنووستین. شەوێك فەرمووی: رەئووف، ئاخ ئێستا ئەم زوورە بچوایەتە خوارەوە و من و تۆ بچووباینە ژێر زەوی و هەتا پەنجا ساڵیتر نەهاتباینە دەرەوە. جا کە هاتینە دەر، من مانام لە قورئان بە کوردی بدایەتەوە و ئەوە بە بیر و مێشکمدا دەهات بمگوتبایە و کەس پێی نەگوتمایە کافر و بێدین. رەئووف جگە لە من و تۆ خوا نەبێ کەس لێرەدا نییە. هیچکەس وەکو من باوەڕی بە خوا نییە و

باوەڕی بە زیندوو بوونەوە نییە و باوەڕی پێمو نییە. هەر بڵێم فلان کەس بۆ وادەکا، خێرا مۆری کافریم لێدەدەن و خەڵکە فەقیر و هەژارەکەشم لێ هەڵدەنێن و بە بێدینم دەزانن.

فەرمووی با یەکێ لە بێدینییەکانی خۆمت بۆ بگێڕمەوە. شێخ... هەیە دەیناسم لە بەر ئەوە کە ماڵمان لە یەکەوە نزیکە خۆی و خێزانی دەناسم. ڕۆژێ خەڵکی ئاوایەکان دەستە بە دەستە دەچوون بۆ ماڵی شێخ بۆ پرسە. منیش پرسیم کێ مردووە. وتیان شێخ کچێکی بووە تازە پێگەییوە و مردووە. منیش لە بەر ئاسراوی هەستام و چووم بۆ ماڵی شێخ. زۆر جەنجاڵبوو. هەموو دڵخۆشیان دەدایەوە و فاتیحایان دەخوێند. چونکە شێخ دەیناسیم، بردمیە ماڵی خۆیان و هیچکام لە منداڵەکانی هیچیان لێ نەهاتبوو. پرسیم ئەرێ ئەمە پرسەی کێیە. خۆ هەموو منداڵەکانت زیندوون؟ وتی: کچی ژنە جنۆکەکەم مردووە. ژنێکم لە جنۆکە هێناوە، کچم گەورە بوو ئێستە مردووە. منیش وتم: خوا بتگرێ ئەم هەموو بەزمە چییە بە خۆڕایی خستووتە ڕێگا؟ ئاخر لە خوا ناترسی درۆی وا دەکەی؟ بە خوا ئابڕووت ئاهێڵم. ئەویش وتی: بە خوا هەرچی بڵێی ئابڕووی خۆت دەچێ. پاشان وتی: قانع باری ژیان و دەرامەتم هاتبووە کزی، بۆیە ئەمەم ساز کرد. ئەوەتە ئەو خەڵکە هەموو

کۆ بوونەتەوە، شتی زۆریان بۆ هێناوم و باری ژیانم گۆڕاوە. تۆیش ئەگەر دژی من بوەستی، خۆت بە کافر دەردەچی. منیش پاش هاتنەوەم لەو پرسەیە جارمدا درۆیە و شێخ ناتوانێ جنۆکە بێنێ. خێرا خستیانە شوێنم ئیمانی بەجنۆکە نییە و کافرە و تەریقە و عیرفانی بە گاڵتە گرتووە.

## قانع و کوشتنی سەگ

دیسان کاک رەئووف گێڕایەوە و فەرمووی:

لە کاتێکدا ماڵی لە سێف بوو، کیتەڵەیەك ماستیان بۆ هێنابوو بۆ ئەوەی گەرم نەبێ لە دەرەوەی ماڵەکە هەڵیانواسیبوو. شەوێ تانجییەك خستبوویە خوارێ، رژا بوو، مامۆستا فەرمووی: ئەمشەو خەوم لێنەکەوتووە هەر دەم ئەم ماستەم جۆرێ پێدەکرد. تاوێ بە نان و ماست، تاوێ هەڵمدەقوڕاند، جارجاریش دەمکردە مەشکە و دەمالژەند و کەلانەم لە رۆنەکەرەکەی هەڵدەکێشا، هەمووی بە هیچ دەرچوو. پاشان فەرمووی: سەگەکە هەموو خەڵکی خستووەتە تەنگانە، خۆزگە دەکوژرا. منیش وام دەزانی ئەگەر بیکوژم مامۆستام خۆشحاڵکردووە. کەوتمە شوێن سەگەکە هەتا «مەحەمەوە». لەوێوە تا هاتمەوە دەشت ئەوەندە ماندووم

کـــرد تـــا هەڵویّســـا و کوشـــتم. هاتمـــەوە وتم مامۆســـتا ســـەگەکەم لـــە کـــوڵ خـــەڵکی نـــاوایی کـــردەوە. مامۆســـتا تەماشـــای کـــردم، پێکـــەنی و زانـــی مـــن بـــە خـــاتری لـــەو بـــە خەیاڵی خۆم ئیشێکی چاکم کردەوە، فەرمووی: ئافەرین.

## قانع و منداڵ

هـــەر وەکـــو وتمـــان مامۆســـتا لـــە منداڵـــە بچـــووکەکانەوە دەســـتی پێدەکـــرد. دەڵـــێن لـــە دێکـــاندا لـــە ســـەر ســـەلوێنکێکدا، یـــا لـــە نـــاو مـــەیدانێکی دێکـــەدا مـــنداڵی وردی کـــۆ دەکردنـــەوە، ســـروودی فێریـــان دەکـــردن، یـــا قســـەی خـــۆش و مەتـــەڵی بۆیان دەوت. دیسان کاك رەئووف گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆســـتا مـــاڵی لـــە دێـــیّ ســـێف بـــوو لـــە مـــەریوان، مـــنداڵانی کۆدەکردنـــەوە، چـــونکە مـــنداڵی بچـــووکی زۆری تێدا بوو، مەتەڵی سادەی بۆ دەگوتن:

«لـــەقازانا کـــوڵاوە، لـــە دەوریـــدا س دراوە، ئەگەر ئەزانی بێژە پڵاوە»

یا دەیپرسی:

«لـە سـەرەو تەسـکە، لـە خـوارەو بـڵاوە، ئەگـەر دەزانی بێژە کلاوە»

یا «نۆك نووکی لارە»

جا منداڵان زۆریان پێ خۆشبوو. هەموو لەو کاتە دیاریکراوەدا کۆ دەبوونەوە و دەهاتن. پاشان مامۆستا شیق فێر دەکردن. ئەو کاتە قوتابخانە نەبوو، هەموو منداڵان بێسەواد بوون. مامۆستا بە پێی توانا بۆ ماوەیەکی کەمیش بوایە دەرسی بە منداڵان دەگوت.

## قانع و کاربەدەستێك

**دیسان کاك رەئووف گێڕایەوە و فەرمووی:**

کاربەدەستێك هاتە سێف بۆ ئیشێك، پرسیاری کرد. خەڵکەکە دەیانگوت نازانین. کابرا وتی چۆن نازانن، ئێوە مامۆستا قانعتان لە ناو دایە،، چۆن دەبێ نەزانن. وتیان: ئاخر چوار مانگە لێرەیە. وتی: قانع یەك ڕۆژ لە هەر جێگایەکدا بێ ئەو خەڵکە دەبێ فەرقی بێت لەگەڵ خەڵکیتردا.

## قانع و هەڵپەرکێ

**دیسان کاك رەئووف گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆستا گێڕایەوە، جارێکیان ڕێگەم کەوتە دێیەك. بە ڕێککەوت زەماوەند بوو. ژن و پیاو هەڵدەپەڕین. مۆسیقاکەشیان شمشاڵ بوو. شێخ موحەممەد وتی: هەڵکو بچی ئەو زەماوەند تێکدەی. منیش وتم باشە. چووم بۆ ناو زەماوەند. کە تەماشای خەڵکم کرد زۆر کەیفیان خۆشە. مۆسیقاکەشیان شمشاڵە و گۆرانی خۆماڵی دەڵێن. پێم گوناحبوو ئەو شادیە لە خەڵك تێکدەم. هەر بەو جل و بەرگی مەلاییەوە خێرا سەرچۆپییەکەم گرت و دەستمکرد بە هەڵپەڕین. خەڵکەکە پێیان وابوو

بۆ تێکدانی شادیەکە هاتووم، (لەمەو بەر مەلا رێزی زۆرتر بوو، دەیتوانی ئاوا دەستوورێك بدات) کە دەستمگرت هەموو لە خۆشیدا گەشانەوە و زۆر هەڵپەڕین. لە کاتی هەڵپەڕیندا لە پشتەوە فەقیانەی کراسەکەمیان گرت. پاش ماوەیەك کە بەریاندا، تەماشامکرد چەپکێ وەنەوشەیان پێوە بەستووە. پاش ماوەیەك کە گەڕامەوە ماڵی مامۆستا، فەرمووی دەستت خۆشبێ تێکتدا. مامۆستا پێی وا بوو تێکمداوە. جا فەرمووی: ئێستەش لەزەتی ئەو شمشاڵەم لە بیر ناچێتەوە، هەر کات شمشاڵ دەبیستم، ئەو بیرەوەریەم دێتەوە بیر. پاشان فەرمووی هەر وەخت «لۆتی» هاتنە ئاوایی بیانهێنە ماڵی ئێمە. دەبێ رێزیان بۆ دانێین چونکە تەنیا مۆسیقایەك کە لە کوردەواریدا ماوەتەوە هەر ئەو زوڕنا و دەهۆڵ و شمشاڵەیە.

## شیعرێك

سەی لەتیفی دەرەتفێ

«شێخ لەتیفی دەرەتفێ» ئەم شیعرانەی بۆ خوێندمەوە. نازانم بڵاو کراونەتەوە، یان نە:

هەزار ساڵ بژیت بەگەردنکەچی
نایەنێ رۆژێ ژینی مەردانە
مێژوو دەر دەخا لە پاشە رۆژدا
کێیە خائینە بەم نیشتمانە
... 

لە ساتێکی وەها تەنگ و لە کاتێکی وەها پەستی
کە عالەم گشتی هەستاوە، دەبێ تۆ کەی لە خەو هەستی

## قانع و مەلامەحموودی خێراوا

کاک ئەنوەری مەعرووف

کاک ئەنوەری مەردۆخی ناسراو بە ئەنوەری مەعرووف، کاک ئیسماعیلی حسەینی، کاک باقری شێخولئیسلامی، مامۆستا مەلا موحەممەدی نیکپەی (نەنەیی) و چەند کەسی‌تر گێڕایانەوە و فەرموویان:

ڕۆژێک مامۆستا قانع چاوی دەکەوێ بە «مەلا مەحموودی خێراوا» کە پیاوێکی زۆر باڵابەرز و قەوی و چوارشانە بووە. دەبینێ ماشەڵڵا چەند گەورە و بە خۆوە بووە. هاوەڵێکی لێی دەپرسێ، مامۆستا ئەوە چۆن ئەم مامۆستایە ئەوەندە گەورەیە؟ مامۆستاش کە بنەماڵەیان دەناسێ و دەزانێ مەلا مەحموود تەنیا کوڕە و باوکی پیاوی چاک بووە، دەڵێ کاکە ئەمە باوکی منداڵی نەبووە، هێندە دوعای کرد و پاڕاوەتەوە و بە سەر خوادا گریاوە و هاواریکردووە کە خوا چەند کوڕێکی پێ ببەخشێ، جا خوای گەورە بەزەیی پێدا هاتووەتەوە و داواکەی وەرگرتووە و لە بەر ئەوە واز بێنێ و ئیتر بەرەکی خوا بەردا، چوار کوڕی پێ بەخشیوە، بەڵام بەسەریەکەوە بووەتە ئەم مەلا مەحموودە کە دەیبینی.

## قانع و مامۆستا عبدولکەریمی مودەریس

سەی ئیسماعیلی حسەینی

دیسان مامۆستا ئیسماعیلی حسەینی گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێك قانع دەچێتە بیارە و لە لای مامۆستا عەبدولکەریمی مودەریس دادەنیشێ و مامۆستا خەریکە دەرسی «جمع‌الجوامع» بە فەقێیەك دەڵێ و فەقێکە هەر بەڵێ دەکا. مامۆستا دەزانێ فەقێکە تێناگا و هەر بەڵێ دەکا. لە مامۆستا عەبدولکەریم داوا دەکا بە بیانوویەکەوە فەقێکە بنێرێتە دەرەوە. مامۆستاش فەقێ دەنێرێتە دەرەوە.

مامۆستا قانع بە مامۆستا دەڵێ: ئەم کابرایە لە دەرسەکەی تۆ تێناگا، جا تەماشاکە تا بۆت تاقیکەمەوە. (جمع الجوامع)ە کە هەڵدەگرێ و گولستانی سەعدی لە جێی دادەنێ، فەقێ دێتەوە تماشای کتێبەکە دەکا و بەڵێ دەکا بۆ مامۆستا. جا قانع دەڵێ: تەماشا کە نەمگوت تێناگا!

## قانع و نێنوککردن

کاك ئیسماعیلی حسەینی گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێك قانع دەچێتە دیدەنی مامۆستای گەورە عەبدولکەریمی مودەریس. ڕۆژی پێنجشەممە دەبێ.

مامۆستا خەرێکی نێزککردن دەبێ. قانع دەڵێ: مامۆستا خەریکی چییت؟ مامۆستا دەفەرموێ: مەشهوورە رۆژی پێنجشەممە چاکە نینووك بکەی، رزق زیاد دەکا و بەرەکەتی هەیە. قانیش دەفەرموێ مامۆستا کابرا لە دەشتی شارەزووردا جووتێ گا دەگێڕێ هێشتا رزقی خۆی پەیدا ناکا، تۆ دەتەوێ بە دوو نینۆك رزقت زیاد بێ؟!

## قانع و خزمایەتی

کاکە ئیسماعیلی حەسەینی گێڕایەوە و فەرمووی:

قانع دەچێتە ماڵی خوالێخۆشبوو سەی...، ماینێکی پێدەبێ بۆ سواری، چاوی ئاوی لێدێ. خاوەن ماڵەکە بە مامۆستا قانع دەڵێ: تۆ لەگەڵ خێزانمدا خزمی. ئەویش کە خێزانی سەی... دەبینێ چاوی ئاوی لێدێ. دەڵێ: خاڵۆ سەی راست دەفەرمووێ، خوا شوکر کە بە خزم دەرچووین. سەی دەڵێ: باشە قانع تۆ چۆن دەزانی خزمین؟ دەڵێ: کاکە خێزانی تۆ چاوی ئاوی لێدێ و ماینەکەی منیش هەر چاوی ئاوی لێدێ. کاکە لەم روانگەتە هاوبەشە (وجە اشتراك) چاکتر کوانێ بۆ خزمایەتی؟!

## قانع و مەنتیق

دیسان کاک ئیسماعیلی حسەینی گێڕایەوە فەرمووی:

وەکو مەشهوورە لە تاریفی زانستی «مەنتیق»دا وتراوە:

«قانون تعصم مراعاتها الذهن عن الخطأ في الفكر».

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا مەحموودی جوانڕۆیی (مامۆستای دەرەتفێ) زانستی «مەنتق»ی چاک زانیوە و فەقێ بالاّ خوێنەکان بۆ خوێندنی مەنتیق چوونەتە خزمەتی. جارێکیان «ئەحمە خادم» چووە بە گژ مامۆستا مەلا مەحمووددا. قانع ئەمە دەبینێ، زۆری پێ ناخۆش دەبێ و دەڵێ ئەگەر مامۆستا «حفظي» زهنی بوایە لە «خطاء في الفكر» ئەم ئەحە خادەمە نەدەچوو بە گژیدا.

## قانع و وردەواڵە فرۆشی و کاکە حەمەی ناری

هەر وەکو هەمووان دەزانن مامۆستا زۆربەی کار و پیشەکانی تاقیکردووەتەوە و هیچی پێ عار نەبووە. یەکێ لەو پیشانە وردەواڵە فرۆشی بووە. کاک عەلی ناری و کاک حەمەی پێنجوێنی، مەلا موحەممەدی کانی کەوەیی و شێخ تاجەدین کانیسانانی هەر کامە بڕێکیان لێکگێڕایەوە، ئەمەی لێدەرچوو:

فەرموویان جارێکیان وردەواڵە دەفرۆشێ، زەمیلە بە دەستەوە، سووق بە شان دەچێتە دێی «بێلوو». بۆ

ئەوە کە دەنگی بگاتە بە هەموو ئاوایی، دەچێتە سەر سەلوێنکێکی زۆر بەرز و هاوار دەکا «وردەواڵە» سەلوێنکەکە ژێری تەڕ بوو، قانع پای دەچەقێتە ناوی. مامۆستا «ناری» کە تەماشا دەکا، دەیناسێتەوە و دەزانێ قانعە. خێرا قەڵەم هەڵدەگرێ و دەنووسێ:

هەر ئەمەت ما بوو لە سەلوێنکا چەقیو
دەس بە داوێنی زەمیل ، خۆشی نەدیو
وردی وردەواڵەکەت بوومەو، چ وردێ وەك گلە
هاڕیام و هاتەوە سۆمێنك و ئیسقانی رزیو
تۆ و گلە و توتەڵەمین و دەرزی و دەزوو
وەك خلۆکی سەر تەشی ئەم راس و نیو
تۆ و بنێشت و ئاوێنە و شانە و خەنە
تۆ و لە ئیشی شان و مل ئارەق سڕیو
ویستی خۆتە خۆ دەزانم نانە وشکێ هەر ئەبێ
کێم وەکو تۆیە بنازم ئەی بە دنیا پێکەنیو
وردەواڵە وردە وردە وەردە روو وەردەوە من
ئەی لە ناڕاسی بە دوو روو حیلە و مەکر و فریو
گەر بە زاهیر حازری بۆ سەختی و کوێرەوەری
ژینی تۆ هەر رەمز و رازە پڕ لە ئەفراز و نشیو
چوون دەڵێی من قانعم راستە بەڕاستی قانعی
تۆیش لە سەر داری نەداری هەر وەکو ناری فریو

بە کەسێکدا دەینێرێ بۆ قانع و دەڵێ بێتە ماڵێ ئێمە. مامۆستا زەمیلەکەی دادەڵێ و ئەم شیعرانە دەنووسێ: زۆرم پێ سەیر بوو سەبکی ئەم شیعرە لەو سەردەمەدا بووە و شاعیران بە هەر جۆر شیعرێکیان بۆ بنووسیایە ئەوانیش هەر بەو کێش و هەوایە وەڵامیانداوەتەوە کەچی قانع ئەو سوننەتەی گۆڕیوە و بە شێوەی فۆلکلۆری کوردی شیعری وتووە.

وردە واڵە، وردە واڵە

کێ لە دەرە و کێ لە ماڵە

کێ خەوتووە کێ خەبەرە

کامە خێرە و کامە شەڕە

کلەی توورم بۆیە هانی

مزمۆر بیکاتە جوانی

زەمیلەم بوو بە سەرمایە

لە هەموو بابەتی تیایە

بۆ هەرکەسێ کە خەوتووە

دەردەداری نەسرەوتووە

بانگی لێکەم هەڵیسێنم

شیفای دەردی بۆ بهێنم

کۆڵ لە سەر پشت وکەلەکەم

ببمە قوربانی گەلەکەم

گەلی فەقیر و بێ ئاگا

دادی ببە مەلای خوا

بڵێم ئەمەش دەسکاریتۆس

لە خەلقەتاشاکاری تۆس

بۆچی وەهای لێقەوماوە

ئەسحابی کەهفیش هەڵساوە

فەیلەقووسی تر وا لێرە

دەروێشێکی تر بنێرە

...

لێرەدا چەند دێڕێك دیار نین

دەرزیم هێنا بۆ درومان

بۆ دەرگادانی زامەکان

دەزوو مۆمێکی بە دەورا

داگیرسێنن بێ بە چرا

کە فەرمووتە دەخولێمەوە

لە ناو دەردا دەتلێمەوە

وەکو سەلکە تەشی بەتاو

بە دەور خۆما وەك ئاسیاو

گەرۆك و سەر لێشێواوم

ئارەق لە پشت ، ئاو لە چاوم

ببـــم بە بنێشتە خۆشەی دەم

ببم بە ئاوێنـــــەکەی جەم

بم بە سەهـــــۆڵ بۆ پاو و تا

تـــــووانەوەم بێ بە شـیفا

بێم وەها دەنگــــم ، هەڵبێنم

کوولەکە لابـــــەم بیشکێنم

خـــەوتوێك لە خەو هەڵیسێنم

بێئاگـــایێ راچڵەکێـــنم

دەرمانێ بم بۆ هـــــەر دوویان

بســــووتێم بم بـە بۆسۆیان

ئاوێنـــــــەم هێناوە بۆیان

تەمـــاشابکەن مێژوویـــــان

لێرەشدا چەند دێرێك دیار نین

بێنەو بۆ ســـــەق هەڵپەڕین

لاچوونی دەرد ، ئارەقــسڕین

وەهـــــا دەسی یەکتر گـــــرن

دوژمنـیـان شەقـبەرن ، بمـرن

بدەن لــە جەپـــڵە و قاوەقاو

بڵێن قانـــع تۆیـــش بێرە ناو

دەس لە بناگـــوێ و گۆرانی

بە هــــەورامی و بە سۆرانی

شارەزووری و بادینانی

لەك و لوڕ و کرماشانی

ئیتر هەموو خوشك و برا

کۆ ببینەوە ئا لەم بەرا

خەلیفە نەڵێ دەھۆڵ لاوە

سوڕنایش کارێکی خراوە

ناری بکوتێ دەھۆڵ بە تاو

لە دنیادا بیکا بە قاو

فائیق فووکا بە زوڕنادا

دەنگی بکا بە دنیادا

وردە واڵە، وردە واڵە

کێ لەدەرە و کێ لە ماڵە

کێ خەوتووە کێ خەوەرە

کامە خێرە و کام زەرەرە

· ئەمە دەنێری بۆ مامۆستا ناری و دەڵێ با ئاوایی بگەڕێم، وردەواڵەکەم بفرۆشم جا پاشان دێم بۆ خزمەتی.

ئەم شیعرەی کاکە حەمەی پێنجوێنی بۆمی خوێندەوە، رەنگە لەگەڵ تاکە شیعرەکەی ئەو بەرێزەدا کە نەمویست ناویبەرم، پێکەوە بووبن، چونکە زۆر لە یەك دەچن...

کاك حەمە فەرمووی لە شێخێك توورە دەبێ کە دەستی ماچنەکراوە و پێی ناخۆش بووە.

کە هەرچی ماچیکەم دەست و نەبینم خێر و ئینتاجی
کە خەرمانێك لەدان خاڵیبێ من کایەك بە با نادەم

کتێبی خوام لە تەورات و لە ئینجیل تا وەکو قورئان
چ ئەمدی ماچی دەست، تەعزیم و کوڕنوش بۆ بەنی ئادەم

موحەممەد یا ئەبووبەکر و عەلی کێ دەستی ماچکردن
ئەگەر رێ راستە فینەی دینە من لەو رێگە لا نادەم

ئەگەر دەستە و ئەزەر وێستان و کوڕنووش بۆ خوایە و بەس
کە من ناسیومە خوای خۆم گوێ بە سەد رەب و خوا نادەم

لە بەر نادانی و گێژی، لە بەر ورگ و سك و عابا
دە روو رەشبێ درۆزن خۆم لە تەزویر و ریا نادەم

جگەم خوا سەر لە بەر کێ دانەوێنم، راست و لارەو بم
شەرەف، مەردانەگیم هەرگیز بە سککەی بێبەها نادەم

لە چەمەن لاوە کونی تێدایە کەشتی بەختی ئەم هۆزە
دەزانم نامرێ ئەم هۆزە بانگی ئەلویدا نادەم

## قانع و دەستکاریکردنی شیعر

قانع شیعری شاعیرانی فارس و عەرەبی زۆری لە بەر بووە. لە بەر ئەوە کە مەریوانی بووە و فارسی چاك زانیوە شیعرەکانی مەولانای رۆمی، خەیام، نیزانی، حافز و سەعدی، هەموو ژێر و روو کردووە. بە تایبەت زۆر خۆی بە سەعدی و حافزەوە گرتووە

و دیوانەکەی حافز و گولستان و بۆستانی سەعدی لە بەر بووە. لە زۆر جێگادا لە شیعر و پەندەکانی سەعدی کەڵکی وەرگرتووە. جار جاریش بۆ شۆخی و تەنز ئاڵوگۆڕی بە سەردا هێناون کاک حەمە یوسف گێڕایەوە فەرمووی: لە گولستاندا سەعدی دەگێڕێتەوە کە:

عبدالقادر گیلانی را دیدند سر بر «حصبا» نهادە و می‌بالید و می‌نالید و می‌گفت:

ای کە هرگز فراموشت نکنم

هیچت از بندە یاد می‌آید؟

مامۆستا قانع دەڵێ: «شێخ عبدالقادر... را دیدند سر بر در حەمەرشیدخان داروخان نهادە می‌بالید و می‌نالید و می‌گفت:

ای بە صندوق و شکر چا دارید

هیچت از بندە یاد می‌آید؟

## قانع و مامۆستا ئەحمەدی قازیی پێنجوێن

کاک «رەحمەتوڵڵای قازیزادە» گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا قانع هێندە قسە خۆش بوو، چووەتە هەر جێگایەک زەردەخەنەی خستۆتە سەر لێوانی دانیشتووان. دەچێتە ماڵی کاکی رەحمەتیم (مامۆستا مەلا ئەحمەدی قازیی

مامۆستا ئەحمەدی قازیی پێنجوێن

پێنجوێن) کە قەندانەکان دادەنێن چا بێنن، مامۆستا دەست بەرز دەکاتەوە و دەفەرمێ: خوایا هەزار شوکر و سپاس بۆ تۆ. مامۆستا مەلا ئەحمەد دەفەرمێ: شوکر بۆ چی؟ ئەویش دەڵێ: ئەم هۆدە مێشی تێدا نییە، ئەگینا خێرا قەندی ناو ئەم قەندانەیان هەڵدەگرت و دەیانبرد.

## قانع و ئاگرکردنەوە لە ئوتێل

حاجی ئەحمەد بەگی دەرەتفێ

قانع جار جارە بۆ نیشاندان و چارەسەر کردنی مەبەستێکی کۆمەڵایەتی خۆی فیدا کردووە و رێگایەکی دۆزیوەتەوە کە خێرا هەموو خەڵك تێگەیەنێ و ئەم دژوارییە چارەسەر بکا و ئەوانەی وا بۆ ئەرکی سەرشانی خۆیان نەجووڵاونەتەوە، رایانچڵەکێنێ. حاجی ئەحمەد بەگی دەرەتفێ[1] گێڕایەوە و فەرمووی:

رۆژێك لە سلێمانی لە ئوتێلی حاجی‌برایم ئاغا بووین و قانعیش لەوێ بوو. لە هۆڵەکەدا دانیشتبووین، لە ناکاو قانع ونبوو. زۆری پێنەچوو لە هەموو هۆدەکانەوە دووکەڵ هاتە

1ـ ئەم گەورەپیاوە دیندار و زیر و قسەزان و لێبوردوو بوو. لە دێی دەرەتفێی مەریوان پیاوانە دەژیا. خزمەتی مەلا و فەقێ و خوێندەواری دەکرد. بۆ هێشتنەوەی حوجرەکەی دەرەتفێ و پەرەپێدانی زانستی ئایینی رەنجی زۆرێکێشا. چەند رۆژ پاش گێڕانەوەی ئەم بیرەوەریانە لە مامۆستا قانع، بیستم لەدنیادەرچووە. خوا بیبەخشێ.

دەرەوە. هەموو شەپرزە بوون و هەر کەسە بە جۆرێ رایدەکرد و بانگیاندەکرد هەموو هەڵێێن و بێنە خوارەوە. خەریکبوو خەڵك بە تەواوی ئوتێلەکە چۆڵکەن، قانع لە هۆدەکەی خۆیەوە سەری دەرهێنا و وتی: رامەکەن، من بووم جلەکانم خستە سەر ئەم مەنگەڵەیە تابسووتێن. ئەم ئوتێلە هێندە ئەسپێ هەیە، هەموو گیانم هاتۆتە خوران. کە تەماشامکرد هێندە ئەسپێیان پێوەیە «تێ وەشاندن[1]» چاریان ناکا و مەجبوور بووم جگە لە ژێر دەرپێکەم هەموویان بسووتێنم تا لە دەستی ئەسپێ رزگارمبێت. خاوەنی ئوتێلەکە، حاجی برایم ئاغا پیاوێکی چاکبوو، خێرا زانی قانع ویستوویەتی بەم جۆرە خاوەنی ئوتێلەکە تێگەیەنێ کە ئوتێلەکەی زۆر پیسە. خێرا ناردی لە ماڵی خۆیان جلی بۆ هێنا و پۆشتەی کردەوە. ئەم باسەش هەموو شاری گرتەوە.

## قانع و قازیی دارۆخان

هەر وەها بۆ نیشاندانی ناشیرینێك شیعری دەنووسی و بڵاویدەکردەوە. بۆ نیشاندانی ناشیرینیی جاش و ئەم دیاردە ناحەز و ناڵەبارە، کە بە سەر شەرعدا سەپابوو، بەرابەریی دەستووری شەرعی نەبووە و دەیشکرا. زۆر جار ویستوویە ئەم

---

١ـ داڵەکاندنی جل و بەرگە لە بان ئاگر بۆ کوشتنی ئەسپێ.

دیارە ناشیرینە نەمێنێ، خەڵک لە ڕەنگەی شەرعییەوە بڕوا.

دیسان حاجی ئەحمەد بەگ گێڕایەوە و فەرمووی:

لای ئێمە شێخێك هەبوو کە قازی دارۆخان جار جارە دەیکرد بە جاش. قانع پارچە شیعرێکی زۆر سەیری بۆ نووسیبوو. بەلام بە داخەوە من هەر ئەم بەیتەم لەبیرە:

جاشی قازی بۆ لەوەڕ ڕوویکردە خاو،

کەر بە لەحنەتبێ کە پۆشیویە خەڵاتی پاڵتاو

زۆر جار لە ناو دەروێشەکاندا کەسانێك هەبوون کە لە بەر ئیش و کار و گوێنەدان بە خۆیاندا نەدەگەیشتن و سەریان پڕ بوو لە... لە شەرعی ئیمامی شافعیدا (خوای لێ ڕازیبێ) ئەگەر موو تەڕ نەبێ خۆشۆردن تەواو نابێ و لەش پاکی نابە.

دیسان حاجی ئەحمەد بەگی تەرمتلێ گێڕایەوە و فەرمووی:

پارچە شیعرێکی وتووە بە پرچی ڕشکاویدا. من تەنیا تاکەیەکم لە بەر ماوە.

مار ئەگرێ و پرچی ناکا بە شانە

ئەوەش نیشانەی دین و ئیمانە

دیسان حاجی ئەحمەد بەگ گێڕایەوە و فەرمووی:

پارچە شیعرێکی تری هەیە کە تەنیا ئەم بەیتەم لەبەرە:

بێژن بە ئەسکەندا لەو تەپڵە

زەمان مەرەسکەن بۆ کوڕی گەپڵە

دیسان حاجی ئەحمەد بەگ گێڕایەوە و فەرمووی:

پیاوێك داوای ژنێکی کردبوو، ناوی «ئامین» بوو، شووی پێ نەکرد، کابرا ناردی بۆ هێجبی کچەکەی ئامین بۆ کورەکەی. جا قانع ئەمەی کردە شیعرێك کە تەنیا ئەمەم لە بیرە:

کچی ئامین کە بوو بە بووکی مەولا

ئیتر ترسم لە ئامینە لە مەولا

مامۆستا پێی خۆشنەبووە قسەی بەلاش بکرێ و ئەو تەعارفاتە بێسەر و بنە رەواج پەیدا بکات. وەکو خەلکی ئێستا ئەگەر بلێت ئەو سەیارەیە، یا ئەو باخە جوانە پیرۆز بێت. خێرا دەڵێ قابلی نییە، پێشکەش. بۆ ئەوە ئەو دیاردە ناشیرینە لاچێ.

## قانع و فەرموو و پێشکەش

کاك رەحمەتوڵڵای قازیزادە دەگێڕێتەوە:

جارێکیان مەلا جەلال ناوێك تەنیا کەرێکی دەبێ دەیبا بۆ ئاو. لە ریگەدا تووشی قانع دەبێ و دەڵێ: مەلا جەلال ئەم کەرە چاکە بۆ کوێ دەبەی. ئەویش دەڵێ: مامۆستا پێشکەش. دەڵێ: بە راستە؟ دەڵێ: ئەی چۆن. قانع دار لە دەستی مەلا جەلال وەردەگرێ و کەر دەخاتە

پێش خۆی و دەڵێ: ئەوا قەبوولمکرد، دەست خۆشبێ. دەخورێ لە کەر بۆ بازار. مەلا جەلال دەڵێ: قوربان بۆ کوێ؟ دەڵێ: بۆ بازار بیفرۆشم. مەلا جەلال دەکەوێتە شوێنی و دەڵێ: قوربان بەخوا هەر ئەم کەرەم هەیە و زۆرم پێویستە. مامۆستا قانع دەڵێ: دە کاکە مەگەر مەجبوورمکردیت؟ لێت پاڕامەوە؟ تۆ خۆت بە ڕەزا و مەیلی خۆت پێشکەشتکردووم بۆتە ماڵم. مەلا جەلال ختێرا دەڕوا بە شوێن چەند کەسدا کە بێن و لە مامۆستا تکا بکەن گوێدرێژەکەی بداتەوە.

## قانع و دەعوەتی

کاک ئەبوبەکری چوارباری لە مەریوان و کاک حەمە لە پێنجوێن گێڕایانەوە و فەرموویان:

یەکێ لە بازرگانە مەریوانییەکان لە پێنجوێن تووشی مامۆستا دەبێ. دوای هەواڵپرسی بە مامۆستا دەڵێ: دەبێ ئەم نیوەڕۆیە دەعوەتی من بیت. مامۆستا چونکە پارەی پێ نابێ دەڵێ: نابێ و ناتوانم. بەڵام ئەو هەر زۆری بۆ دێنێ. مامۆستا قەبوولیدەکا و دەچنە چێشتخانەیەک. نان دەخۆن. لە پڕ دێن بە شوێن ئەو پیاوەدا، دەڵێن بارەکەت گەیشتووە، ئەویش لە دەعوەت و لە قانعی لە بیر نامێنێ. هەڵدەستێ و دەڕوات. قانعی

داماویش پارەی ئەویشی دێتە مل. هەر وا دادەنیشێ بەڵکوو خوا چارەیێك بكات. لە پڕ کابرایەکی ئاشنا دێت و دەبینێ قانع دانیشتووە، دەچێتە پاڵی داوا دەکات نان بخوا. قانع دەڵێ نانم خواردووە. کابرا نان دەخوا، لە پڕ خوێن لە لوتی بەر دەبێ و دەڕوا بۆ لای دەستشۆر، ئەویش نایەتەوە. نانی ئەویش دەچێتە مل قانع. ئیتر زۆر بە پەژارەوە هەر وا لە سەر مێزەکە دانیشتووە و نازانێ چی بکات. لە پڕ ئاشنایەکی مەریوانی پەیدا دەبێ و دەچێتە سەر مێزەکەی مامۆستا و داوا دەکا لە مامۆستا نان بخوا و میوانی ئەو بێت. مامۆستاش دەفەرمێ نانم خواردووە. ئەویش دەڵێ قەیناکا دووبارە بخۆ. مامۆستاش دەفەرمێ: تا ئێستە سیانە، یا نەیێتە پێنج. جا بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ کابرا دەگێڕێتەوە. کابرا بە ڕووخۆشییەوە پارەکەیان حیسابدەکا و مامۆستا ڕزگار دەبێ و شیعرێك دەنووسێ کە بە داخەوە لە بیریان نەمابوو.

## قانع و ناسینەوە

دیسان کاك ئەبوبەکر چواریاری لە زاری خوالێخۆشبوو «مەلا محەممەدی جوانڕۆیی»ەوە گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا قانع ماڵی لە «کەولۆس»ی شارەزوور بوو. ئێمە فەقێ بووین چووینە ماڵیان. هەر کە چاوی پێمان

کەوت خێرا فەرمووی تۆ کوڕی فلان کەسی تۆش کوڕی فلان کەس. لەگەڵ ئەوەشدا کە نە من و نە ڕەفیقەکەمی نەدیبوو.

## دوژمنانی قانع

ئوسا حەمە ئەمین گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا لە هیچکەس و هیچشتێ نەدەترسا. ئەو هەموو دوژمنایەتیەیان لەگەڵ دەکرد، هیچ کات تەسلیم نەدەبوو. لەبەر لایەنگری پیاوە گەورەکانی ئەو سەردەمە، چ لەو دیو، چ لەم دیو دوژمنان نەیانتوانیوە وورەی بەرزی بڕووخێنن. زۆر جاریش بەکرێگیراویان ناردووە بیکوژن. مامۆستا زانیویە بانگیکردووە کە من ئامادەم بمکوژە و پارەکە بۆ منداڵەکانت خەرجکە... کابرا زۆر شەرمەزار بووە و لەو هەموو پاکی و نەترسییە سەری سوڕماوە. یەکێ لەوانە بوبوو بە موخلیسی و خزمەتیدەکرد. جا من هەر چەند بڵێم ئەو زەمانە دنیاخۆرەکان و چەوسێنەرەکان کە بەرژەوەندیان بە هۆی قانعەوە کەوتبووە مەترسییەوە، چ پیلانێکیان بۆ دەگێڕا، ئەمڕۆ کەس ناتوانێ لەم وتانەی من تێبگا. چونکە لەگەڵ ئەو ڕۆژەدا زۆر جیاوازیی هەیە.

## قانع و یەخچاڵ

ئوسا حەمە ئەمین گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان لە شارەزوور چووینە خزمەتی. پاش چەند قسەی خۆش پرسیاریکرد: چ ئاوێ لە هەموو ئاوەکان ساردترە؟ ئێمەش وتمان: ئاوی چاوگەکەی «گوێزەبەیخان»[1]. فەرمووی: چ ئاوێکە لە هەموو ئاوەکان گەرمترە؟ وتمان: «قوڵ خورد»[2]. وتی ڕۆژێ ئەم زانستە دەگاتە جێگایەك ئاوی قوڵ خورد و گوێزەبەیخان وەکو یەکیان پێدێ. جا ئێمە ئەو کاتە تێنەدەگیشتین. چونکە نە ئێمە و نە ماموستا ناوی یەخەچاڵمان نەبیستبوو. ئەمە دەر دەخا تێڕوانی ماموستا لە زەمان پێشتر بووە و زۆری زانیوە.

## قانع و فرووجاو

ئوسا حەمە ئەمین گێڕایەوە و فەرمووی:

ماموستا ماڵی لە «بەرقەڵا» دەبێ و حاجی ماموستای «بەیەڵە» هەموو جار دەچێتە میوانی و پێی دەڵێ: دەبێ تۆش بێیت بۆ میوانی من. ماموستا دەڵێ:

---

1ـ گوێزەبەیخان کانیاوێکە لە کێوی میراجی لە پشت دوکاڵەوە، کە زێدی قانعە، سەرانگایەکی خۆشە.

2ـ قوڵخورد دێیەکە لە شارەزوور.

میوانی مەلا یا دەبێ بچێتە دیوەخانی بەگێک یا نان و ماستێك بخوا. من ئەو بەرە و زوورە ناگرمە بەر بۆ نان و ماست. حاجی مامۆستا هەر واز ناهێنێ تا بەڵێنی لێوەردەگری. حاجی مامۆستا دەچێتە «خاوەمیراوا» بۆ برنج و برێ برنج دێنێ و مامۆستا دێت بۆ ماڵیان. خێزانی حاجی مامۆستا دەچێتە سەر سەلوێنکێك و مریشکێك دەگری. نان دروستدەکرێ حاجی مامۆستا لە کاتی نانخواردندا دەڵێ بێقەزابی تۆ هەر نەدەهاتی و دەتوت نان و ماست، ئەوەتا گۆشتی فڕووج و فڕووجاو و برنج و نیعمەتی خوا زۆر و زەبەند. مامۆستاش بە عادەتەکەی خۆی کاغەز و دەفتەرەکەی دەر دێنێ و بە پارچە شیعرێك بەم میوانییەدا هەڵدەدا، کە بە داخەوە هەر ئەم تاکەیم لە بیر ماوە:

ئاوی کانی گوێزە و لە ویچی برنجی خاو

مریشکە پیرەی سەلوێنك ناوت ناوە فڕووجاو

## قانع و مزگەوت

کاك عەباسی خاوەری کانیسانان گێڕایەوە و فەرمووی:

من زۆر دەچوومە خزمەتی مامۆستا. لە بەر ئەوەی ئێمە زۆر فەقیر بووین دەهاتە ماڵمان. هەر ماڵێ فەقیر

بوایە دەچووە ماڵیان، دڵی دەدایەوە، زۆر قسەی جوانم لێ بیستووە، بەڵام پیری لە بیری بردوومەتەوە. بڕێکم لە بیرە: جارێکیان خۆی و دوو کوڕی ڕێگەیان دەکەوێتە دێیەك. منداڵەکان دەڵێن بچینە کوێ؟ مامۆستا دەڵێ ئێستا دەتانبەمە ماڵێ، لەم دێیەدا لەو گەورەتر نەبێ و خاوەنەکەشی منەت بەسەر کەسدا ناکا. پاشان ڕوو بە مزگەوتی دێیەکە دەیانبات. کە دەچنە بەر مزگەوت تەماشا دەکەن پڕە لە کەر. گاگەلیان لە پاڵ مزگەوتدا مۆڵداوە، کەر چوونەتە ناو مزگەوت. دەپرسێ کێ لەم دێیەدا دەسەڵاتدارە. خانی دێکەی پێ‌ئیشانئەدەن کە بە سەر بانێکەوە ڕاوەستاوە. مامۆستا دەچێ بۆ لای خان و خێرا دەستی ماچدەکا و دووبارە دەستی ماچدەکا. خان دەڵێ: ڕووتکراوی؟ قانع دەڵێ: نا. دووبارە دەستی ماچدەکا. خان سەری سوڕ دەمێنێ. دەڵێ: خان تەنیا کەسێ هەڵی منی سەندبێ هەر تۆی. ئافەرین خوا بتهێڵێ. خان دەڵێ: چییە؟ مامۆستاش دەڵێ: لە مێژەوە خوا لەگەڵ مندا بە مەیلی خۆی دەجووڵێتەوە، باوکمی کوشت، دایکمی کوشت. هەژاری و نەداری بە سەردا

هێنام. چاوی کز کردم، دەربەدەریکردم. بڕوام هەیە هەر چیم بە سەر هاتووە، خوا بە سەری هێناوم. دەرفەتی نەدەهاتم، نەمدەزانی چی بکەم. ئەمڕۆ دیم تۆ هەقی منت لێ سەندۆتەوە. کەرت کردۆتە ماڵەکەی، ئافەرین!

خان تێدەگا ماموستا چ ڕێگایەکی لێ گرتووە و ئەم کارە ناڕەوایە دێنێتەوە بەر چاوی. دەڵێ: خەڵکی ئێمە زستانە و زستان دەچنە مزگەوت. ماموستا دەڵێ: دەتوانی دەرگایەکی لێ خەی، یا دەرگاکەی هەڵچنی تا پاییز. خان و خەڵکی دێکە تەریقدەبنەوە و خێرا دەکەونە نیش بۆ ئەم مەبەستە. خان دەڵێ: ئەری کابرا تو خوا ڕاست بڵێ تۆ قانع نیت؟

## قانع و یاپراخی[1] سلق

بەڕێز مینەبەگی مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:

قەڵەزەیەکم لە مەریواندا هەبوو. ماموستا هات، بڕێ سلقی کڕیبوو. بە هیوا بوو کەسێ بێت و پێکەوە بچنەوە بۆ سێف. لە پڕ خوالێخۆشبوو قاسم نەژادی، مەئمووری سەرهەنگ ئەمیر موکری مەرزەبانی مەریوان هات و وتی: ماموستا سەرهەنگ بانگتدەکا.

---

[1]ـ دۆڵمە

مامۆستاش فەرمووی لەگەڵم وەرە، نە وەك زیندانیەکەن. منیش لەگەڵی چووم. سەرهەنگ وتی: مامۆستا خۆت و بورهانی کورِت دەبێ بەیانی ئامادە بن، بچن بۆ تاران ئیشیان پێتانە. ئەویش فەرمووی: سەرهەنگ دووبارە حیزە فیلەکانن؟ نازانم کەی ئەم حیزە فیلانە تەواو دەبن؟ پاشان فەرمووی: ویستم یاپراخێکی سلّق بخۆم ئەویش هیچ و شتی زۆری بە سەرهەنگ وت.

## قانع و ئەفسەرێك

کاک محەممەد ئەمینی مەردۆخی مەریوان گێرایەوە و فەرمووی:

لە ساڵی (١٣٤١) دا لە دێی «سەڵەسی». بۆ خوالێخۆشبوو کاک عوسمانی برام زەماوەندمان دەکرد.

محەممەد ئەمینی مەردۆخی

مامۆستا قانع دەعوەت بوو. لە مەجلیسەکەدا پێیان وت: مامۆستا قسەی خۆشمان بۆ بکە. سەروان... پێش لە خۆیەوە بێدەعوەت هاتبوو، دانیشتبوو. مامۆستا فەرمووی: یەکێکیان بەستووە بە دەستمەوە بۆ ئەوە قسە نەکەم، بەلام هەر دەیکەم. سەروان... وتی: مامۆستا چەورمانیکرد.

## قانع و سواری

سەلاحەدینی کەریمیان

کاک محەممەد ئەمینی مەردۆخی، دوکتۆر حەسەنی یوسفی، کاک ئیبراهیمی مەردۆخی و شێخ حسێن زونجی و کاک سەلاحەدینی کەریمیان لە سنە و چەند کەسیتر گێڕایانەوە و فەرموویان:

لە سەڵەسی زەماوەندی خوالێخۆشبوو شێخ عوسمانی زونجی بووە، مامۆستا قانعیش لەوێ بووە. کاتی گەڕانەوە کە ویستوویانە ئەسپ بهێنن بۆ مامۆستا، وتوویانە ئەسپەکە بێنن با مامۆستا سوار کەین. فەرموویە: نەخێر بڵێن با باریکەین، چونکە ئەمە بار کردنە، نەك سوار کردن.

## قانع و ناسینەوە

مامۆستا زاهیدی ئەشعەری

مامۆستا مەلا زاهیدی ئەشعەری کوڕی خوالێخۆشبوو مەلا سەعیدی ئەشعەری گێڕایەوە فەرمووی:

لەگەڵ شێخ عوسمانی ئەڵمانەدا چووین بۆ قایمقامیەتی هەڵەبجە، پاسپۆرت مۆر کەین. مامۆستا لەوێ بوو. چاوی پێمان کەوت فەرمووی: کوڕی سەعە لێرە چی دەکەی؟ منیش عەرزمکرد: چۆن دەزانی کوڕی

سەعەم؟ فەرمووی: شێوەت لەو دەچێ و فەرمووی: ئەی ئەم ڕەفیقەت کە بە سەر و گوێدا لە ئەڵمانەیی دەچێ کێیە؟ منیش عەرزمکرد: کوڕی حاجی شێخی ئەڵمانیە.

## قانع و حاجی حەمەد ئەمینی وەستا قادری تەوێڵە

بەڕێز مامۆستا عوسمان محەممەد هەورامی[1] لە نامەیەکدا چەند بابەتێکی لە بارەی مامۆستا قانعەوە نووسیبوو، ناردی بۆم. شیعرێک لە مامۆستا قانع کە پێم وایە بڵاو نەکراوەتەوە و ئەوانی تری بڵاو کراوە بوون، ئەمە دەقی نامە و شیعرەکە:

گەورەبرا و زێدەبەڕێز مامۆستا ئەحمەدی ئەزیری:

هێندەی هەموو ئە بارانەکانی گەردوون سەلام، بە هەمان هەند و دەستووریش هێندەی هەموو سۆزی سروەی ئەم جیهانە بەرین و فراوانە سەرفراز و بەختەوەر بی... کاکە گیان ئەم بابەتانە لە بارەی مامۆستا قانعەوە دەزانم پێشکەشتاندەکەم:

---

١ـ ئەگەر دەیان جار و لە دەیان لاوە سپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی برای دڵسۆز و برای بە ڕاستی ڕاستی مامۆستا عوسمان محەممەد هەورامی بکەم هەر کەمە، لەو ڕۆژەوە کە بیستی بەرهەمی بڵاونەکراوەی شاعیر و نووسەرە کوردەکان کۆ دەکەمەوە خێرا بە دەمگەمەوە هات و لە بەرهەمەکەی مەلا حەسەنی دزڵیدا زۆر یارمەتیدام و بابەت و شیعری زۆری بۆ ناردم، هەر وەها بۆ مامۆستا قانع، هەرچی پێی کرا دریغی نەکرد. جێی خۆیەتی سپاسی زۆر و پێزانینی خۆم دەربڕم و داواکارم تەمەنی پڕ خێر و بێری درێژ بێت تا خزمەتە بێمنەت و هەرەکەی زیاتر بکا، زۆر سپاس.

چـــو قانع که مرگش به پایان گشت
برست اندرین گردش کـــهنه گشت

وصیت همی کرد بـــا قوم و خویش
دلش تـــیره در یوزه مجروح و ریش

که وقـــتی گسسته شد از این حیات
به چـــــایی دهند غسلم اندر ممات

تو خـــــــرمـا فکن بر تن خسته‌ام
که در خدمــــــتش من کمر بسته‌ام

خیاطـــم زن نانـــوا بـــایدش
خمیـــر جـــوین را بیـــاسایدش

شکـر کوفته پاچ گورم کـــنید
بیفکنـــید تـــابوت هـــورم نهید

به پیشـــم رود ســـفره‌ی پر ز نان
بـــه پشتم بیارانید کـــوزه دوان

به جایی ز گـاری و شین و چمر
بگویند هی جوز و چای و شکر

کسـانی نهندم سر دوش خـویش
کـه دارای زر باشد و گاه میش

تو گوریچه از هیلکه درهم بساز
بـــه جـایی لحد خهله‌های دراز

بـــــه جایی نمازم زن خـــوب‌رو
کند مـــــشکه جنبیدن روبه‌رو
رو و چیشت ما را نهند بر زمین
بریزاند در زیرم از گـوشتین
به جـــایی که ختمم کند قاریان
بگـــویند گـــورت شود پر ز نان

جا مامۆستا عوسمان نووسیویەتی:

رۆژی یەکشـــەممە ۱۹۷٤/۳/۳۱ لـــە بـــەر دەستووســـێکی حـاجی مامۆسـتا حەمـە لـەمین قـادر تەوێڵـەیی نووسـیمەوە. نـاوبراو گوتـی: لـە پـاییزی ۱۹٦۰ی عیسـاییدا، مامۆسـتا قـانع لـە هەڵەبجـە هاتـە سـەر دوکانەکـەم، کـە باسـی گوزەرانـیم لـیّ پرسـی، لـە وەڵامـدا ئـەم هۆنراوەیـەی لـە گیرفـانی دەر هێنـا، گوتـی: ئـەم هۆنراوەیە زمانحاڵمە.

حاجی مامۆستا گوتی: منیش خێرا نووسیمەوە و لـە کۆتـاییدا ئـەم تاکەم بۆ زیاد کرد:

کسانی که ایـــــستـــادەی گور منـــنـد
بـــگـــویند شـــامین به بـــانگ بلند

مامۆستا قانع ئەوەی زۆر پێخۆش بوو، گوتـی: بەراسـتی کۆتاییەکـەی زۆر پەسەندە...

## قانع و تەلقینی پاش مەرگ

**کاک شێخ کەمالی کۆنەپۆشی لە مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆستا لەگەڵ یەکێك لە مەلاکانی ئەو سەردەمە دەکەوێتە گفتوگۆ و هەرچی دەڵێ ئەم مەلایە تێناگا، مامۆستا دەفەرموێ: دەترسم بمرم و تۆ بێیتە سەر قەبرم و تەلقینم بخوێنی و بڵێیت مامۆستا قانع مەلایەکە دێنە سەرت و بڵێ خوام ئەومیە و پێغەمبەرم ئەومیە و دینم ئەومیە. بڵێ تۆ مردووی مەترسە وابڵێ و وابڵێ. بە ئیرادەی خوای گەورە کە مامۆستا مرد، دوای دەیان ساڵ ئەو مەلایە لەسەر گۆڕەکەی ئامادە بوو و تەلقینی خوێند.

## قانع و گوریس و مەوج

لە زەمانی پێشوودا هەرکەس چاوی دەهاتە ئێش «میلۆ»یان بۆ دەکرد، بەڵکو ئێشەکەی بسرەوێت و چاو هێشەش زۆر بوو، دەوا و دوکتۆریش نەبوو. پاکوخاوێنیش وەکو ئێستا نەبوو. شێخ کەمالی کۆنەپۆشی گێڕایەوە و فەرمووی:

باوکی رەحمەتیم (خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی رەشەدێ)[1] لە رێگەی سلێمانیدا دەچێتە کەولۆس بۆ دیدەنی مامۆستا قانع و مامۆستا

---

١ـ شێخ ئەحمەدی رەشەدێ، پیاوێکی گەورە و ئیماندار و زۆر زیرەك و قسەخۆشبوو، یەکێك لە کەسێتییە ناودار و بە دەستەڵاتەکانی ناوچەی مەریوان بوو، جگە لە خوێندەواری و

دەفەرموێ: خولە سەوزەی پیاوی کاك ئەحمەد، چای چاك دروستدەکا و چایەکی چاکمان بۆ لێدەنێ. جا ئەمنە کاك ئەحمەد حەزی لە قبوڵیی مریشکە، بۆمان دروستکە، وەختێ نانخواردن کابرایەك هاتە ژوورەوە و مەوجێك و گوریسێکی پێیە و ئەڵێ: مامۆستا کاکەم مردووە و وەسیەتی کردووە دوای خۆی ئەم گوریس و مەوجە بدرێ بە تۆ. مامۆستا قەڵس دەبێ و زۆر نارەحەتدەبێ و تێکدەچێ، باوکیشم دەڵێ: ئاخ قانع، ئەم توورەیی و قەڵسییە چییە؟ کابرا پیاوەتی کردووە و تۆی کردووە بە میراتگری خۆی! و قانعیش دەڵێ: کاك ئەحمەد باوەڕ بکە دوو سێ ساڵە و خوا دەیەوێ چاوم دابێنێ و تووشی چاو ئێشەم بکات، لە بەر ئەوە گوریس و مەوجم نەبوو، بەزەیی پێمدا هاتەوە و چاوی دانەهێنام. ئەم خوا خراپ بۆ کردووە، ئەم گوریس و مەوجەی هێنا و ئێستا خوا دەڵێ‌ێکی بۆ نامێنێتەوە و بەزەیی بە مندا نایەتەوە و چاوم دادێ.

بەیانی باوکم دەچێ بۆ سلێمانی، پاش سێ ڕۆژ دەگەڕێتەوە. فەرمووی بە خوا قەسەم لە ناو مێلوودا بوو چاوی گلیدەکرد، وتی: کاك ئەحمەد، نەموت؟ بڕوانە چاوم چی لێهات؟

---

قسەزانی، سەرۆکی عەشیرەتی کۆنەپۆشی بوو، پیاوانی وەکو قانع و ناری خۆشیان ویستووە و لە سەخاوەت و ناندانیدا بەناوبانگ بووە، خوا بیبەخشێ.

## مامۆستا و هەژارێك

مامۆستا هەر کات شتێکی ناڕەوای بدیبایە خۆی پێنەدەگیرا و ئەگەر هەژارێك بە هەر جۆر ستەمی لێکرابێ یا بێحورمەتی پێکرابێ، لە لایەن هەر کەسەوە بووبێ، خۆی پێنەگیراوە و شمشێری شیعری بۆ کێشاوە و هەقی ئەو هەژارەی سەندووە. شێخ کەمالی کۆنەپۆشی دیسان گێڕایەوە و فەرمووی:

کابرایەکی هەژار دەچێتە لای مامۆستا قانع و دەڵێ: چوومەتە خزمەتی شێخ لەتیف و گوێی پێنەداوم و من زۆر ناڕەحەتم. ئیتر نازانم چۆن بووە خوالێخۆشبوو شێخ لەتیف گوێی پێنەداوە، ئەگینا شێخ لەتیف پیاوێکی گەورە و زۆر بەڕەحم و بەزەیی و بەچکە شێری لێهاتوو و پیاوانە بووە. مامۆستا لەگەڵ ئەوەدا کە شێخ لەتیفی زۆر خۆشویستووە و پێکەوە زۆر خۆشانبووە، خێرا دەست دەداتە قەڵەم و کاغەز، ئەم شیعرانە دەنووسێ، بۆ تۆڵە سەندنی ئەو هەژارە شارەزووریە و دەینێرێ بۆ خوالێخۆشبوو شێخ لەتیف.

گەورەزادەی خاك شێری بێشەڵان

سولالەی وەجاخ ئاگری کوردان

دوێنێ چوومە سەرچاوەی عابیرین

کەل (ملە کەوە)[1] وەك خولدی بەرین

---

١ــ ملەکەوە نزیك شاری پێنجوێنە، کەوتۆتە سەر ڕێی شارەزوور و پێنجوێن.

پرسیم ئەی سەرکەل کوژەری یـــاران
جێگەی شکـــارگەی گشت نەوشکاران
قەسەمت ئـــەدەم ئـــــەیوبی ئەکراد
قەسەمت ئەدەم بە تێشەی فـــــەرهاد
ئەوەڵ تا ئاخر چیت دیوە بە چـــاو
لە شێرانی کورد پیاوی ساحیب نـــاو

وەڵامی ملەکەوە:

بـــــە ئەمری خــــوا هـاتە گفتوگۆ
وتی ئـــەی قانع کوردی رەنجـــەڕۆ
تا ئەوسا من بووم جێگەی شێران بووم
جێگەی بـــازە راو کورد و گۆران بووم
فەوجی نیزامیی کـەریم خــانم دی
تۆپ و تۆپخانەی هەڵۆخـــانــم دی
شێخ مەحموودم دی شێری رووی مەیدان
ئەحیا کـــونەندەی بنەچەی کوردان
چرای حەوت ســەد ساڵ کوژاوەی هەڵکرد
بۆ کوردی مەزڵووم کـەوتە دەستـــو برد

دوور کەوتە و نەما ناو و نیشانی

نەما ئـــەعرەتەی رۆژی مـــەیدانی

ئێستـــا کـــە ئـــەڵێن تـــازە جوانێ

مـــەغروور و مەدهۆش ئەحواڵ نەزانێ

ئـەڵێن جـــوان و بێتـــەجروبەیە

نازانێ کوڕی رۆژ هـــەر بە کێیە

فەزڵی شارسانی بە تـــڕ و عینوان

ئەدا بە مل خەڵك دێهاتی مـــەیدان

## مامۆستا و کەریم بەگی بیبانی

بەڕێز کاك سەلاح عەبدولقادر لە سلێمانی فەرمووی:

لە خزمەتی مامۆستا مەلا ساڵحی شارەزووری[1] دا بووم. شیعرێکی مامۆستا قانعی بۆ خوێندەوە و فەرمووی کەریم بـەگی بیبـانی ئـامۆزای

---

١ـ مامۆستا مەلا ساڵحی شارەزووری کە لە سەی سادق ئیمام و خەتیب و پیاوێکی پیاوچاکە و زۆر خوێندەوار و دڵێکی ناوچەکەی هەبووە، بە رەنجی شانی خۆی دەژیا و ئەمانەت لە دووکانەکەشیدا شەریکی کاسبی بوو، لە ئەرکی سەرشانی خۆی نەدەبوارد و وەکو رێنمایەکی دڵسۆز جێ هانا و پەنای خەڵکە هەژارەکەی شارەزوور بوو. ئەم پیاوە گەورەیە زۆر قسەخۆش و شۆخ و سەڵی و لێهاتوو بوو. شاعیرێکی زۆر باش بوو، شیعری بە سۆرانی و زاراوەی هەورامی و فارسی دەوت و لە دێی گەڕاوی هەورامان ساڵی ١٩١٠ لەدایکبووە و لە ١٩٩٨/٦/٢دا کۆچی دوایی کردووە . لە گۆڕستانی سەی سادق نێژراوە و ئەم گەورە پیاوە باوکی خوالێخۆشبوو مامۆستا محەممەدی شارەزوورییە کە ئەویش نووسەرێکی زۆر بە دەسەڵات بووە لە ماوەی تەمەنی کەمیدا زۆر خزمەتی ئایین و ئەدەبی کوردی کرد و نووسراوی زۆری بەجێهێشتووە.

فەقێ محەممەدی هەمەوەندی باوکی مەحموود فەهمی هەمەوەندە، سابیر بەگی کەریم بەگی بیبانی فەقێ محەممەدی بیبانی لە دیوەخانەکەی ئەحمەدبەگی بالکدا لە بالکی مەریوان کوشت. عەلی بیبانی برای فەقێ محەممەد سابیر بەگی کوشتەوە و پاشان شێخ محەممەدە بچکۆلە کە ئامۆزای شێخ مەحموودی حەفید بوو، عەلی بیبانی کوشتەوەو مامۆستا قانع لە دڵی «نێ» دا ئەم شیعرەی بەم بۆنەیەوە نووسیوە.

خوا قووەی بە بیبانی عەتا دا
لە سەر سابیر قەزا شابڵی لا دا
لە خاکی غوربەتا بێزار و یاوەر
رەگ و ریشەی بە یەك ئانێ بە با دا
قەدەر کوشتی خەرەد تەئریخی وا وت
چەقەڵ بوو شێری شێرانی فەنادا

## قانع و حەمە رەشیدخان

مامۆستا رەحیم لوقمانی

کاك رەحیم لوقمانی گێڕایەوە و فەرمووی شێخ محەممەد غەریبی دەرەزیارەتی سەقز، کە کاتی خۆی مامۆستا قانع هاتوچۆی کردوون، بۆی گێڕامەوە و فەرمووی:

جارێکیان لە بانە دەعوەتی ماڵی حەمە رەشیدخان بووین. وارێککەوت مامۆستا قانعیش لەوێ بوو. کاتێ چایان بۆ هێناین. مامۆستا هەر نەیخواردەوە. خان

فەرمووی مامۆستا چایەکەت بخۆرەوە. مامۆستا وتی: وەڵڵا قوربان دیانم نییە! خانیش وتی: جا کەی چا بە دیان دەخورێنەوە؟ مامۆستا قانعیش وتی: بە دیان ناخورێ، بەڵام چایی نێوە دیانی دەوێ.

## قانع و جوانڕۆیی

مامۆستا مەلامحەممەدی جوانڕۆیی

مامۆستا مەلامحەممەدی جوانڕۆیی[1] گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان بە خزمەتی مامۆستا قانع گەیشتم، لێی پرسیم: ئەرێ تۆ کوڕی مەنتیقزانەکەی[2] کاڵەك ئاوای[3]؟ منیش عەرزمکرد: بەڵێ. فەرمووی: جا دەبێتە باوکت؟ منیش عەرزمکرد: ئەگەر بمە باوکم کێ بێتە من؟ پاشان منیش وەکو لاوێکی بێتەجرەبە عەرزمکرد: مامۆستا شیعرێکم بۆ بخوێنەوە، ئەویش بێئەوەی دڵم بشکێنێ خێرا میدادەکەی دەر هێنا و نووسی:

---

١ـ مامۆستا محەممەد جوانڕۆیی زانایەکی لایەنی و زیر و لێهاتوو بوو، لە بەر لەوەی کە نەیئێنە سەرباری خەڵک و بە رەنجی خۆی بژی لە دەرەتانی هاتە مەریوان و بە کاسبی جۆراوجۆر خۆی خەریکدەکرد. لەوێش وەکو قانع لە زۆر لێش و کاردا بۆی نەدەهات. لە ژیاندا رەنجێکی زۆری کێشا و دەردی زۆری چەشت، بەڵام ناشوکر نەبوو، بەو زەحمەت و رەنجە رازی بوو، منداڵەکانی خوێندەوار و زیرن و خزمەتکاری کۆمەڵن. داوامکرد ژیانی و بەسەرهاتیم بۆ بنێرن، کە لە جێگایەکدا تۆمار بکرێت، بە داخەوە نەهاتن بەدەنگمەوە.

٢ـ مەنتیقزان، مەبەست مامۆستا مەلا مەحموودی جوانڕۆییە کە لە زانستی مەنتیقدا بەناوبانگبووە

٣ـ کاڵەکئاوا، مەبەست دێی دەرمەنییە کە کاڵەکی زۆر بووە.

جـــوانڕووی جـــوانڕۆیی جـــوانی ڕۆیی و پـــیری هات
ئەجــــەل زوو زوو دەڵێ کیش و خەریکە ها بڵێ هەی مات
لە جوانیی ڕوو نەسیبێکم نەبوو ، نەمبوو جوان ڕوویێ
وەکو کورد و عەرەب نێژن هەزار ئاخ و هەزار هەیهات

پاشان فەرمووی ئەم شیعرە ١٦ تاکە بوو، کە بە داخەوە من هەر ئەم دوو تاکەیم لە بەرن.

## قانع و کشتوکاڵ

**کاک ئەحمەدی بایەوەی گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆســـتا چـــەند ســـاڵێك مـــاڵی لـــە «بناوەســـووتە» بـــوو. ئاشـــی حـــاجی قـــەتاحی «مینەمـــەڵێ» گـــرتبوو بـــە ئیجـــارە و خـــەریکی ئاشـــەوانی بـــوو. چـــەند ســـاڵێك زۆر زەحـــمەتی کێشـــا لـــەو ئاشـــەدا و هـــەر نـــەیگرت و هـــەر نـــەدار بـــوو. کابرایـــەك هـــەبوو بـــە نـــاوی قێخـــا حەمەڕەشید کە لە مێژەوە لەگـەڵ مامۆســـتا ئاشـــنا بـــوو. وتـــی: لەگـــەر پێـــت خۆشـــە مـــن زەوینـــێکم هەیـــە لـــە بـــەینی «بناوەســـووتە» و «هەرگینـــە»دا، بچـــۆ بیکێڵـــە و خۆتـــی پـــێوە خەریکبکـــە، بـــەڵکو ژیـــانت لـــەم ڕێگایـــەوە دابینبکـــرێت و لـــەم نەداریـــە ڕزگـــار بێـــت. مامۆســـتاش ئـــەو ســـاڵە لـــە زەویـــو زاردا ڕەنجـــێکی زۆری کێشـــا، هەموو شتی وەشاندبوو. لـە نـۆك و گەنمـەوە تـا شـووتی و کاڵـەك و پیـاز. بـە ئـیرادەی خـوا هـەموو ئـاگر و ئافـەت لێـیدان و هـیچ

خۆڕێکی نەبوو. جا دەیفەرموو، ئەحمەد من خۆم دەمزانی هەر چی بکەم ئافەت لێیدەدا، بۆیە ئەو هەموو شتەم کرد کە یەکێکیان چاکبێت و ئافەت لێنەدا. پاشان فەرمووی: ژیانی من هەر وا هاتووە و هیچ کات ناشوکر نیم، هەر جۆر بێ دنیا تەواو دەبێ ئەم چەند ڕۆژە هەر جۆرێ بڕوات فەرقی نییە.

## قانع و پیازی بناوەسووتە

لە ناو خەڵکی ئەوکاتەی ئەو دەور و بەرەدا سواریی گوێدرێژ بۆ ئافرەت زۆر عەیب و ناشیرین بوو. مامۆستا کە هەمیشە خەریکی لابردنی خورافات و ئەم دیاردە ناشیرینە بوو، خەزێ و خاتوو ئەمنە تەنانەت لە شاریشدا سواری کەر دەبوون. کاک ئەحمەدی بابەرەی گێڕایەوە و فەرمووی:

پیازی «بناوەسووتە» بۆ چاکی و شیرینی وەکو پیازی «بۆڕیدەر» بەناوبانگە. دۆستەکانی مامۆستا لە بناوەسووتە شکارتەی پیازیان بۆ کردبوو. لە کاتێکدا بوو کە لە پێنجوێن بڕیاردرا بوو کۆڕێکی لەدەبی بۆ بگرن. ماڵی لە «کەولۆس» بوو. لەگەڵ خاتوو ئەمنە دێن بۆ پێنجوێن و بناوەسووتە. هێشتا نەگەیشتبوونە پێنجوێن بە خاتووئەمنە دەڵێ: دەبێ لێرە دابەزین. ئەویش دەڵێ: ئاخر بۆ؟ مەگەر ناچینە پێنجوێن. مامۆستا دەفەرمێ: دەبێ دابەزین. لەوێ کە لە سەیارەکە دادەبەزن،

گوێدرێژێـك بـەکرێدەگرێ بـە روبعـەدینارێك و سـوار دەبـێ و بـە خاتوو نەمنە دەڵـێ: دەبـێ تـۆش سـوار بـی. هـەر چـی خـاتوو نەمنـە هاوار دەکا مـن بـە پـا دێـم، دەڵـێ نـابێ دەبـێ دوو پشـتەکی سـوار بـین. هـەر دووکیـان پێکـەوە سـوار دەبـن تـا دەگەنـە مـەیانی شـار و خـەڵك چـاوەڕوانیدەکەن. کـە تەماشـا دەکـەن خـۆی و خێـزانی سـواری کـەرێك بـوون سـەریان سـوڕ دەمێنێ. دەپرسـن مامۆسـتا ئـەوە چیـە؟ دەڵـێ: کاکـە ئەمـە وەسـیلەی هاتوچـۆ و بارکێشـانی هەژارانە، ژن و پیاویش بـۆ کـەر سـواری هـیچ فـەرقیان نیـە. ئەگـەر ژن سواری کەر بێت ئابڕووی ناچێ و گوناحیش نیە.

## قانع و دینداری

مامۆستا سەی محەمەدی موسەنیفی

**مامۆسـتا سـەی محەمـەدی موسـەنیفی دانیشتووی مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:**

خوالێخۆشـبوو بورهـان قـانع لـە کـانی‌سـانان بـوو، ئـەیاران تۆمـەتیان لـێدابوو شـیوعیـە و ئـیتر نـەیدەوێرا دانیشـێ، لـە کـانی‌سـانانەوە بـە ڕێگـای سـوورێندا لەگـەڵ خوالێخۆشبوو شـێخ مـەحموودی کـانی‌سـانانیدا، چـووین بـۆ خزمـەت مامۆسـتا قـانع کـە مـاڵی لـە قەڵبـەزەی شـارەزوور بـوو. بـۆ ئـەوەی لێی بپرسین ئایا منداڵـەکانی شـیوعین، یـا نـە؟ بۆچـی تۆمـەتی وایـان

بۆ هەڵبەستووە؟ مامۆستا ئێمەی دی، بە بەرگی مەلایەوە هات بە پیرمانەوە. سەگێك بە شوێنیەوە بوو، زوو زوو هەڵمەتی دەهێنا بۆمان، تەنگی پێهەڵچنیبووین، پرسیارمانکرد: ئەم سەگە چییە؟ فەرمووی: ئەم ئاوایە بچکۆلەیە و منیش ناحەزم هەیە و هیچکەس بە شەو ناتوانێ نزیکی ماڵمان بێتەوە، بە رۆژیش ئەگەر پۆلیس، یا کاربەدەستێك بێتە دێکەوە و دەبینێ ماڵەکە بەرزە و دارلۆتییەکەمان (داری ئانتێنی رادیۆ) بە سەر ماڵەکەوە هەیە، لە بەر ئەم سەگە ناوێرێ بێتە ماڵمان. جا کە میوانی خۆمان بێ، خۆم دێم و دەیهێنمەوە ماڵ لە ماڵیشماندا هێندە شت نییە کە پێیدا بگەرێ و پیسیکات. جا عەرزمکرد تۆمەتی شیوعیگەریان داوەتە پاڵ کاك بورهان، وایە، یان نە؟ بێدەنگ هەڵسایەوە، لە سەر رەفەی هۆدەکە قورنانێکی داگرت و کردیەوە و فەرمووی: ئەمە بخوێنەوە. کە خوێندمەوە نووسیبووی «هەر کورێکم و هەر نەوە و نەبیرەیەکم لە سەر مەرامی شیووعیگەری بێ، لە من نییە و من نامەوێ. لە ناو نیشانی من بێبەریبێ.» جا فەرمووی: خۆ من نەمدەزانی ئێوە دێن بۆ ئێرە. ئەمە وەسیەتی منە و هەر کەس بڕوا دەکات بیکات و ئەگەر نایکات خۆی دەزانێ، من مونافق نیم لە جل و بەرگی دیندا دژی دینبم. خەڵك لە بەر دین یارمەتی من بدەن و من لە

مزگـەوت جومعـە بکـەم، بڕواشـم نـەبێ؟ جـا ئەگـەر وا بم روو راست نیم.

## گەورەیی قانع

مامۆستا مەلا عارف بەیەرەیی

مامۆسـتا هێـندە خـۆی بـە کـەم زانـیوە و فیـز و دەمـاری نـەبووە. بـە بەشـی خـۆی رازی بـووە رەنگـە کـەس وەهـا نـەبووبێ، تەنانـەت بـەوەی لـە دنیـەکدا ریگای بۆتـەوە بە زۆری زانیوە. جا بنوارە گـەورەیی قـانع. مامۆسـتا مـەلا عـارف بەیـەرەیی دانیـشتووی بەرقەڵای خواروی مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:

پرسیم لـە قانع تۆ مـەلای «کـاڵ»ی دەرامـەتت چۆنە؟ فـەرمووی: سـەگەکانی دەمناسنەوە لێم ناوەڕن. ئەمە کەمە؟ منیش وتم: نـەوەڵا زۆر زۆرە. فەرمووی: جا چی لەوە چاکترە؟ مەگەر من کێم و چیم؟ هـەر ئەوەندە رێگام دەدەن لە ناو خەڵکدا دانیشم زۆرە و رازیم.

## قانع و شێخ

مامۆستا عەلائەدین

مامۆسـ ـتا عەلائـ ـەدین مودەریـ ـس و پێشنوێژی مزگـەوتی مـوارەلئـاوای شـاری سـنە گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆسـ ـتا مـ ـاڵی لـ ـە سـ ـەی‌سـ ـادقدا دەبێـ ـت. شـ ـێخ... دەبێتـ ـە مـ ـیوانی. بـ ـەیانی مامۆسـ ـتا دەچـ ـێتە مزگـ ـەوت بـ ـۆ نوێـ ـژ و دەگەڕێتـ ـەوە، هێشـ ـتا شـ ـێخ ... لـ ـە خـ ـەو هەڵنەسـ ـتاوە. بـ ـە

عادەتەکەی خۆی کە بە خەزانی دەگوت شێخ، بانگدەکا یا شێخ. شێخ... لە ژێر لێفەکەوە سەر دەردێنێ. قانع دەڵێ: لەگەڵ تۆم نییە بخەوە لەگەڵ ئەو شێخەکەی ترمە.

## قانع و جوابدانەوە

هەر وەھا کە وتمان مامۆستا هەر شتێکی بدیبایە کە بە ناوی دینەوە دەبێتە هۆی ناشیرینیی دین، خێرا هاواری بەرز دەبووەوە. ناحەز و ساویلکەش پڕوپاگەندەیان بۆ بڵاو دەکردەوە و بانگی کەمتەرخەمییان لە دیندا بۆ دەدا...

مامۆستا «محەممەدی رەعنایی»ی ئیمام جومعەی دێی «کۆڵەسارە»ی سنە گێڕایەوە و فەرمووی:

من لە پێنجوێن فەقێ بووم لە مزگەوتی پاشا. بە هۆی ناسراوێکەوە لە شارەزوور لەگەڵ مامۆستا قانعدا بووم، رۆژێك تەشریفی هێنا بۆ حوجرە. پاشان پێکەوە چووین بۆ جومعە. وا رێککەوتبوو تازە مەلا... بووبوو بە خەتیبی جومعەی پێنجوێن. دانیشتین بۆ نوێژ و مەلا... دەستیکرد بە خوتبە خوێندن و باسی شەرابی دەکرد. بۆ نموونە وتی شەراب تەنیا لە تری دروستدەکرێ و تری لە مێوە و مێو لە میزی شەیتان سەوز بووە. شەرابی خالیس میزی شەیتانە کە ناوی ترێیە، بۆیە مەستدەکات. لەم جۆرە دەلیلانە و خوتبەیەکی زۆر بێسەر و بەری خوێندەوە. نوێژ کرا و مامۆستا لایکرد بە لای منەوە و

فەرمووی: ئەم خوتبەیەت بەدڵبوو؟ عەرزمکرد: ئەی خۆت قوربان. فەرمووی: ناوێری؟ عەرزمکرد: نە وەڵڵا. فەرمووی: من دەوێرم و ناترسم. بریا لە جیاتی ئەم خوتبەیەکە بۆ ئەم هەموو خەڵکە داماوەی خوێندەوە، کاسەیەك شەرابی لەو شەرابە کە خۆی دەڵێ لەو میحرابەدا بخواردایە و ناوا نابڕووی ئیسلامی نەبردبا. دوور لە ناوی خوا و پێغەمبەر گووی خۆی بە ناو ئەو خوتبەیە کە خوێندیەوە و زۆر ناڕەحەتبوو. فەرمووی: ئەم خەڵکە کۆ دەبنەوە شتێك ببیسن و فێر بن، دەبێ بۆ وایان لێ بکرێت؟ من دەعوەتم کرد بۆ حوجرە و پێکەوە هاتین. من لە حوجرەکەدا دوو هاوڕێم هەبوون مەلا... و مەلا... خۆشیان لە مامۆستا نەدەهات و دەیان وت شیوعیە، دەیانوت مامۆستا دژی خان و شێخە و هەرکەس دژی ئەوان بێت شیوعیە. هەڵبەت نە تەنیا رەفیقەکانی من، زۆری تریش هەبوون هەر وایان دەزانی. من داوامکرد لە مامۆستا شەو دانیشێ. ئەویش داواکەی وەرگرتم و شەو مایەوە. هاوڕێکانم حوجرەکەیان بە جێ هێشت تا بەیانی. کە هاتنەوە سەریان کێشایە ژوورەوە هێشتا مامۆستا نەڕۆیشتبووە، منیان بانگکردە دەرەوە. وتیان: بۆچی ئەم شیوعیە ناڕوا؟ مەلا... ولی هەتیو تۆ کەری. تۆ نازانی ئێستا پێنجوێن بزانن ئەم شیوعیە وا لێرە دەرتدەکەن؟ منیش وتم تۆ

نافامی ئاخر چۆن شیووعی لەو دێیە دوورەوە بە پێ، بەم گەرمایە هەرچی جومعەیە دێت بۆ نوێژی جومعە؟ ئاخر کام شیووعی پێشنوێژی مزگەوتە و جومعەیەکی نافەوتی؟ تۆ نابێ بیر بکەیتەوە؟ بۆ گوێ لە ناحەزان دەگری؟ ئەو شاعیرێکی گەورەی کوردە. تۆ چۆن وا دەڵێی. لێی شێواوە و دەر بە دەر کراوە؟ لەگەڵم بە شەڕ هات. دەستمانکرد بە لێدانی یەك. مەلا... هەموماڵ هات بۆ ناوبژیکردن، پاشان ئەویش بوو بە کۆمەکی ئەو. شەڕێکی چاکمان کرد. مامۆستا لە حوجرەکەوە گوێی لێبوو بانگیکرد فەرمووی: من نابم بە هۆی زەحمەتی تۆ. لێیان گەڕێ هەر ئەوەندە دەزانن. توانای بیرکردنەوەیان نییە. ئاخر وەك خۆت وتت کام شیووعی دەتوانێ بەم گەرمایە بێت بۆ پێنجوێن بۆ جومعە؟ ئەویش ئەو جومعەیە کە دیمان. خۆی حازر کرد و ڕۆیشت. بەڵام لە دواییدا لەگەڵ مەلا... بوو بە شەڕمان تا ئەو نامەیەکی بۆ هات، حوجرەی بەجێهێشت. من بە سەر مەلا... شێر بووم و ئیتر نەیدەتوانی شەڕم پێ بفرۆشێ. فزەم لێ چنیبوو. هەر ئەوەندەی دەتوانی حوجرەکەی بەجێدەهێشت تا مامۆستا دەڕۆیشتەوە. چونکە هەر چی جومعەیە مامۆستا دوای جومعە دەهاتە حوجرە و بە نانە رەق و تەماتەیەك قانع بوو. بە خوا قانع بوو. جوانترین وشە ئەوەیە بڵێن: بە خوا قانع بوو. هەر خۆی

قـانع بـوو. مامۆسـتا هـەموو کـاتێ، هـەموو رەفتـاری، هـەموو ژیـانی دەرسبوو، ئامۆژگارییوو.

## قانع و پرچی درێژ

مامۆستا بە پەیڕەوی لە ئایەتی: اُدعُ الی سبیل ربک بالحکمة الموعظة الحسنة، بۆ راگەیاندنی پەیامێك بۆ راست رۆیشتن، باشترین رێگای هەڵبژاردووە. هیچ کات جگە لە زمانی تێگەیین بە زمانێکیتر لەگەڵ کەسدا نەدواوە. خەڵکی ساویلکە و نەخوێندەواری بێلقەدر و قیمەت تەماشا نەکردووە. واتە هیچکەسی لە بەر نەزانین بە بچووك تەماشا نەکردووە. کاك سەیید حەسەن حسەینی مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا ماڵی لە «بناوەسووتە» دەبێ. کابرایەکی زۆر زەحمەتکێشی خەڵکی بناوەسووتە کە خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوو، پرچێکی زۆر درێژی هەبووە. مامۆستا تەماشا دەکا ئەم هەژارە زۆربەی وەخت سەری دەخورێنێ و دیارە زۆر بە دەست ئەم پرچەوە نارەحەتە، چونکە هێندە تۆزی کای تێچووە، ئارەقکردن و نەبوونی حەمامیش بووەتە هۆیەکیتر بۆ ئازاردانی کابرا. مامۆستا دەزانێ لەگەر بڵێ ئەم پرچەت بتاشە وەکو خێرۆمەنێکی بە متمانە ناتوانێ ئازار و نارەحەتی کەسێك ببینێ و هیچ نەکا. ناچار چەند مانگ سەری ناتاشێ، تا سەری

وەك سەری کابرای لێدێ. جا ڕۆژێك مامۆستا سەری پڕ دەکا لە خۆڵ و تۆز و دەچێ بۆ سەر مەزراکەی. ئاوێنەیەك و چەقۆیەکی تیژ لەگەڵ خۆی دەبا. لەگەڵ کابرا دادەنیشێ و باسی پرچ و ریشی بۆ دەکا و دەڵێ: پرچ و ریش هەر دووکیان سوننەتن. ئێستا من و تۆ پرچمان هەیە. تاشینی پرچیش هەر سوننەتە. چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێ) مووی سەری درێژ بووە و هەم تاشیویە. جا ئاوێنەکە دەردێنێ و دەڵێ بە کابرا تەماشای خۆت بکە. مامۆستاش تەماشای خۆی دەکا و دەڵێ: ئەرێ کاکە دەزانی ئەم پرچەی من چەندە بۆتە هۆی نارەحەتیم؟ بێجگە لەوەش شەرع دەفەرمێ ئەگەر رشك بە سەرەوە بێ غوسڵ دەر ناچێ و نوێژەکانمان بەتاڵن؟ کابرا تەماشای خۆی دەکات و بە مامۆستا دەڵێ: دە باشە من و تۆ چی بکەین؟ مامۆستاش دەڵێ: بە خوا کاکە من دەیتاشم و هەرگیز ئیتر پرچی وا کە نەتوانم خزمەتیکەم نایێڵم بە سەرەوە. کابراش دەڵێ: ئەگەر تۆ بیتاشی منیش دەیتاشم. مامۆستا دەڵێ: دەی تۆ هەڵسە هینەکەی من بتاشە و منیش هی تۆ دەتاشم. کابرا ڕازیدەبێ و هەر دووکیان پرچەکەیان دەتاشن. جا دەڵێ پاش ماوەیەك کابرا هەر چی چاوی بە مامۆستا دەکەوت دەیوت: مامۆستا خوا خێرت بنووسێ لەجاڵمبوو.

## قانع و گۆشتفرۆشتن

لە زەمانی ژیانی مامۆستادا زەویوزار هی خاوەن موڵکبوو. بە جوتیاریان دەوت «رەعیەت». دەبوا جوتیار خەرمانی ئامادە بکردبا و مالیك دەچوو بەشی خۆی جیا دەکردەوە و جوتیاریش بەشی خۆی دەبرد. ئەگەر چەند رۆژیش مالیك نەچوایە بۆ بەشکردن، دەبوا خەرمانەکە هەر وا بە سووری و ئامادە بمایەتەوە. لە کاتی خەرمان هەڵگرتندا رەعیەت بۆ خزمەت ئامادە دەبوو. کەڵەشێری سەر دەبڕی بۆ «زلوت» (نوێنەری مالیك) یا هەر خاوەن موڵك خۆی دەچووە سەر خەرمان. بەشی خاوەن موڵك ١/٢ یا ١/٣ یا ١/١٠ بوو. ئەگەر چەند خەرمانێك بە دەوری یەکدا بوونایە بزنێك، یا گیسکێك سەر دەبڕا و خاوەن خەرمانەکان گۆشتیان دەکڕی. شەو لە سەر خەرمان دەبووە رابواردن و گۆشتخواردن. بەڵام خاوەن موڵك پێویستنەبوو پارە بدا. تەنانەت فتوا درا بوو فەلا لەو خەرمانە لە بەشی خۆی زەکاتی شەرعیش بدا. یانی فەلا زەکاتی ئەو دەخڵودانەی کە خاوەن موڵك دەیبرد، بیدایە. جا سەیرتر لە هەموو شت ئەوە بوو کە بە بەشی خاوەن موڵکیان دەوت «زەکات». خاوەن موڵك لەو کاتە کە موڵکی بە کەلەپووری پێشوو بۆ بە جێمابوو و فتوای شەرعی بۆ دەدرا. کە خاوەنی موڵك هەقی زەکات و بێگاری و دەیان جۆری تریشی هەیە و کەسێ نەبووە بڵێ وا نییە، جگە لە قانع و قانعەکان. ئەویش لە هەر زەمانێکدا بۆ ناوچەیەك یەك کەس، کە ئەویش ئاوایان بە سەر هاتووە. خاوەن موڵك تاوانبار

ناکرێ. نازانم فتواەران تاوانبارن، یا دەسەڵاتدارانی بە ناو دەوڵەت یا خودی خاوەن موڵك، یا هەر هەق بووە، کێ بەرپرس بووە، کێ وەڵام دەداتەوە؟ کاك شێخ محەممەدی حسەینی سەئاوا گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا ماڵی لە «سەئاوا» بوو، باوکم و مامەی رەحمەتیم ئێوارەیەك دەیانویست بچن بۆ سەر خەرمان، بە مامۆستا دەڵێن: تۆش وەرە با بچین. مامۆستاش دەڵێ: نە جووتیارم و نە خاوەن موڵك. ئەوانیش دەڵێن: عادەتە شەوانە بزن سەر دەبڕن خاوەن خەرمانەکان چەلتووك دەدەن و گۆشت دەکڕن، تۆش بزنێك بێنە سەری بڕە و لە جیاتی گۆشتەکە چەلتووك وەر گرە. ئەویش دەڵێ: باشە. مامۆستا بزنێك دەبا بۆ سەر خەرمانەکان و سەری دەبڕن و مامۆستاش لە ڕێگەدا بەردێك هەڵدەگرێ بۆ سەنگ دوایی تا دەوری بڵێین ٤٥ کیلۆ گۆشت دەفرۆشێ. باوکم و مامم دەپرسن: مامۆستا ئەمە چ جۆرە بزنێکە کە تۆ ٤٥ کیلۆت لێ فرۆشتووە؟ بزن ناگاتە ٢٥ کیلۆ. چۆن خەرمانی چەلتووکت هەڵداوەتەوە؟ ئەویش دەفەرمێ: برا من و ئێوە فەرقمان چییە؟ تازە من تۆزێ گۆشتیشم داونەتێ، ئێوە چی؟ دەڵێن: باشە. چۆن ئەم بزنە هێندە قورسبوو؟ دەڵێ: کاکە لە ڕێگەدا بەردێکم هەڵگرت، ئیتر نەمزانی چەندە «بەختم» هێنابوو، ئەوەندە دەر چوو. جا دەستەکات بە پێکەنین و دەڵێ:

ئەوە چەڵتووکەکەتان، من مەبەستم هەر ئەمە بوو. خاوەن خەرمانەکانیش هەموو دێن و داوای لێدەکەن چەڵتووکەکە بیانەوە و نۆشی گیانی بێت.

## قانع و رۆمان

مامۆستا قەڵەمێکی رەوان و بیرێکی تیژی هەبووە. ئەگەر بیویستبایە رۆمان بنووسێ، رەنگبێ زۆر لە رۆماننووسە بیانییەکان لێهاتووتر بووبا. زۆرجار «راز» (حیکایەتی) گێڕاوەتەوە کە کاریگەریی لە سەر دانیشتوان زۆر بووە. شێخ محەممەدی کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ ئەوڕەحمانی سەئاوا لە زمانی باوکیەوە گێڕایەوە و فەرمووی:

لە «بەردەرەشە»وە پێکەوە دەهاتینەوە بۆ سەئاوا. مامۆستا دەستیکرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتێك کە خۆی و هەواڵێکی لە کێشەیەکدا بە دیل گیراون، چەند رۆژێ بە دەست دوژمن ئازار دراون و زۆر بێڕەحمانە لە گەڵیاندا جووڵاونەتەوە. هاوەڵەکەیان بێڕەحمانە کوشتووە و بەمیان وتوە دەبێ بیگری بە کۆڵتەوە. ئەمیش بەو خوێنەوە هاوەڵەکەی هەڵگرتووە و خوێن بە سەر و چاویدا هاتۆتە خوارەوە و تەنانەت بەو خوێنە و بەو بارە قورسەوە ئەشکەنجەی زۆریان داوە. دەڵێ، باوکم فەرمووی: گەیشتینە پاڵ ئاوایی، من کە لە سەرەتای بەسەرهاتەکەوە گریا بووم ئیتر وام لێهاتبوو خەریکبوو ملم دەپەڕی. مامۆستا

فەرمووی: ئیتر گەیشتینە ئاوایی، کاکە نارەحەت مەبە ئەمەم بە بیردا هات، بۆ ئەوەی ڕیگەکەمان لێ بڕوا، وەکو خەوێك گێڕامەوە بۆ تۆ. هەر خۆم سازمکرد بۆ ئەوەی یێتاقەت نەبین.

## تەلزیماتەکەی قانع

مامۆستا جگە لەوەی کە بە دەستی ناحەزانی خۆیەوە بە گیر بووە، دایم لە ڕاکردندا بووە. حکوومەتەکانیش لێی نەگەڕاون و هەر جارە بە تۆمەتێك گرتوویانە و بەندیان کردووە و ئازاریانداوە و ناچاریانکردووە بە هەڵهاتن و خۆشاردنەوە. بەڵام مامۆستا کۆڵینەداوە و هەموویانی بە گاڵتە گرتوون. مامۆستا دوکتۆر سەباحی بەرزنجی گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان بە تۆمەتی شیوعیگەری دەیگرن و دەیخەنە ژێر پرسیار. داوای لێدەکەن ئەو تەلزیمانە بڵێت کە تێیدا نیشدەکات. کێن و ناویان چییە و لە کوێن؟ مامۆستاش دەست بە نووسین دەکات و دەنووسێت.

یەکەم: خێزانم. ناوی ئەوە، کچی ئەوەیە، ئێستە لە فلان جێیە، بەم ناو نیشانە. دووەم: کوڕەکەم ناوی ئەوەیە و لە ماڵی خۆماندایە. هەر وەها کوڕ و کچ هەمووی دەنووسێ و دەیداتە دەستی بەرپرسەکە. کە

ئـــەویش چـــاوی پێدەکـــەوێ دەســـــتدەکات بـــــە پێکـــــەنین و دەزانێت مامۆستا هەمووی بە گاڵتە گرتووە.

## قانع و سیرێژ و کەرە

دیسان کاک سەباحی بەرزنجی گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیـــان مامۆســـتا دەبێتـــە مـــیوانی مـــاڵی حـــاجی تایـــەر بـــەگی «تووتـــەقاچ» بـــۆ نـــانی نـــیوەڕۆ «ســـیرێژ و کـــەرە»ی بـــۆ دادەنـــێن. تەماشـــا دەکـــات کەرەکـــەی زۆر کەمـــە، دراوە بـــە ســـەر ســـیرێژێکی زۆردا. مامۆســـتاش دەفـــەرمێ: حـــاجی ئەگـــەر حکوومـــەت بـــزانێ بـــەم ژنـــەی تـــۆ قونتـــەراتی قیرتـــاوی جـــادەی پێـــنجوێنی دەداتـــێ. دەڵـــێ: چـــۆن؟ مامۆســـتاش دەڵـــێ بە بەرمیلێ[1] قیر بەینی سلێمانی و پێنجوێن قیرتاو دەکا.

## قانع و لیستەی خواردنی حەفتە

مامۆستا شێخ عوسمانی هەڵەبجەیی

مامۆســـتا بـــۆ ئـــەوە خـــەڵکی ئـــاوایی لـــە بەژارەوخەفـــــەت دەر بـــــێنێ و زەردەخەنـــــە بخاتـــــە ســـــەر لـــــێوان، جـــــارجار بـــــەزمێکی دروســـــتکردووە و خەڵکـــــی هێناوەتـــــــــە پێکـــــەنین و پـــــەیامێکی پێراگـــــەیاندوون. مامۆســـــتا ســـــەیید حەســـــەنی حـــــــسەینی

[1] ـ بەرمیل: بۆشکە

سەلنــاوا گێڕایەوە و فەرمووی:

خوالیخۆشــبوو مامۆســتای پایەبەــرز شــێخ عوسمــانی مــەردۆخی فــەرمووی: مــاڵی مامۆســتا لــە ســەرکان بــوو، لەگــەڵ هــاواڵێکمدا چــووینە خزمــەتی، لـــە نـــزیك مزگــەوتبوو، فــەرمووی: مــیوانی ئێمــە دەبــن، یــا مــیوانی شــێخ عــەبدولی ســەرکان؟ ئێمــەش وتمــان: چــۆن؟ فــەرمووی: ئــاخر ئــەو دیوەخــانی هەیــە، خواردنــی چــاکتری هەیــە. جــا بچــنە مــاڵی ئێمــە و لــە هەیوانەکــەدا لیســتەی خواردنــی حەفتــەم داکوتــاوە بــزانن ئــەم ئێوارەیــە چــیمان هەیــە. ئێمــەش ڕۆیشــتین تەماشــای لیســتەمان کــرد، ئــێوارە دۆینــە بــوو. ئێمــەش هاتینــەوە خزمــەتی و عــەرزمانکرد دۆیینــەی تــۆ ناگۆڕینــەوە بــە بــرنج و گۆشــتی تــر، شــەو لــە خزمــەتیدا بووین. دەفــێکی کــردبوو بــە دار دا. هەڵیــا و هێنــای، وتــی: ئــێوە بکەونــە شــوێنم. ڕوو بــە شــێخ عــەبدول دەســتیکرد بــە دەفلــێدان. ئــەو شــیعرەی شــێخ ڕەزای تاڵــەبانی خوێنــدەوە کــە دەڵــێ: «مەزبووتــە حــەیاتم بــە ســولەیمانی و خــاکی» بــڕێ شــیعری خۆیشــی خوێنــدەوە. ئێمــەش لەگــەڵیا بۆمــان دەســەندەوە. خــەڵك هــەموو کــۆ بووبوونــەوە و گوێیــان لــە شــیعری

مامۆستا دەگرت و حەزیاندەکرد و بە جەنجاڵەوە چوونە ماڵی شێخ عەبدول

## قانع و دابەشکردنی زەوی

مامۆستا محەمەدی حەقدۆست

مامۆستا محەمەدی حەقدۆست سەردەفتەری ئیزدواج و تەڵاق، دانیشتووی شاری مەریوان گێڕایەوە و فەرمووی:

پێم خۆشە دەربارەی ئەوەی ئەیاران بە مامۆستایان دەوت، ئەم بەسەرهاتە بگێڕمەوە بۆ روونکردنەوەی ژیانی ئەم گەورە پیاوە، لە خورماڵ دەمخوێند. مەلا عەلی ناوێك خەڵکی «تووتە خاج»ی شارەزوور، کە ئەویش حەزی لە دابەشکردنی زەوی دەکرد و بە دەست نارەوایەوە دەیناڵاند. کەسانێ بوون پێیان دەوت شیوعی، ئەویش دەردی خەڵکە چەوساوەکەی دەزانی. تازە دابەشکردنی زەوی لە ئێراندا دەستی پێکرد بوو، وتی بە مامۆستا: ئێمە چی بکەین ئەم بار و دۆخەی ئێستا چۆن دەگۆڕێت؟ مامۆستا فەرمووی: دابەشکردنی زەوی (اصلاح زراعی) بەم جۆرە نابێ و زەمانە بەرە و پێش دەڕوا و رەنگە من و تۆ نەمێنین، بەڵام دەبێ...؟

دانیشتووان پاش قسەکانی مامۆستا، وتیان وا دیارە مامۆستا قانعیش وەکو مەلاعەلی وایە ئەویش دابەشکردنی زەوی پێخۆشە. بووەتە شیوعی.

## قانع و ڕەسمی خۆی

مامۆستا شێخ جەلال فاروقی مودەریس و پێشنوێژی مزگەوتی دێی نژماری مەریوان، گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان لە بەغدا دەچێتە چاخانەیەك. تەماشا دەکات، ڕەسمێکی گەورەی خۆی هەڵواسراوە. دەچێتە پێشەوە و دەڵێ: تف لەو سەر و هەیکەلەت. چایچییەکە دەچێ بۆی لێیدا و دەڵێ تۆ دەزانی ئەوە کێیە؟ دێتە پێشەوە بۆ لێدانی دەیناسێ و دەزانێ ئەمە خودی قانعە. دەستی ماچدەکا و دەیباتە جێگایەکی تایبەت.

## قانع و چێواری

مامۆستا وریا قانع گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان باوکم چێواری دەکات. دوو بزن دەکڕێ بە دینار و نیوێك، هەرچی دەکا نافرۆشرێت. کابرایەك دەڵێ ئەو بزنانە بە چەند؟ دەڵێ: دینار و نیوێکم پێداون بە پارەکەی خۆیان وەریانگرە. دەڵێ: بەوەندە نایەوێن. قانع دەڵێ: چاکە بە دینار و روبعێك بیانبە. کابرا دەڵێ: دەباشە ئەگەر بە دینار و نیوێکت

کریون، چۆن بە زەرەر دەیانفرۆشیتەوە؟ قانع دەڵێ: کاکە بە خوا ئەوە ویستم خوا تاقیکەمەوە، نە وەکو لە پاشە رۆژدا خوا بفەرمێ من رزقی تۆم لە چێواریدا دانابوو، بۆ نەبوویتە چێوار. ئەوەتە چێواریم کرد بۆ ئەوەی لەو دنیا رێگەی قسەم بێت.

## قانع و جێگە ماقووڵەکە

دیسان کاک وریا قانع گێڕایەوە و فەرمووی:

ماڵمان لە «کەوڵۆس» بوو. خۆمان خانوومان نەبوو، کابرایەك هەبوو، ناوی «فەتە کیچەڵە» بوو. لەوێ باریکردبوو، چووبووە «قاینەجە». ئێمە چووبووینە ماڵەکەی. خۆشتان دەزانن ماڵی دێی ئەو سەردەمە چۆنبوو، لە دەرگای ئەو ژوورەوە کە دائەنیشان حەیوان دەچووە ژوورەوە دەرگاکەشی چەپەرێکبوو بە شیاکە هەڵناویابوو. شیاکەکە کونکون بووبوو، چونکە باران لێیدا بوو. ئیتر کە با دەهاتە ژوورەوە یەکسەر دووکەڵی ناورەکەی دەبرد بۆ لای سەرەوە. باوکیشم لە لای سەرەوە دووکەڵەکەی بۆ دەچوو، ناوی نابوو جێگە ماقووڵەکە، هەر میوانێ بهاتایە دەچووە جێگە ماقووڵەکە، ئیتر ئەو داماوە دەبوایە سەری لار کردایەتەوە چاوی لە بەر ناو پیاهاتن نەیدەدی، هەتا دەچووەوە کوێر دەبوو. جارێك (حەمەی قەسەر) هات بۆ ماڵمان

هەر لە دەرگاکە وتی سێبەسێ تەڵاقم کەوتبێ ناچمە جێگە ماقوورڵەکە.

## قانع و تەسبیحفرۆش

دیسان کاک وریا قانع گێڕایەوە و فەرمووی:

باوکم نە پێنجوێن لە دوکانی حاجی عەلی زەڕنگەر دادەنیشێ، کابرایەکی تەسبیحفرۆش دێتە بەردەمی، دەڵێ تەسبیح بکڕە، باوکیشم دەفەرمێ: نامەوێ. کابرا دەڵێ: ۱۰۱ دانەیە و زۆر پێویستە بۆ تەهلیلە. باوکم دەفەرمێ: نامەوێ. کابرا دەڵێ: یا شێخ کاڵێ تەهلیلە دەکەی ئەگەر تەسبیح نەبێ لێت تێکدەچێ و نازانی چەندە. باوکیشم دەفەرمێ: جا بۆ خاڵۆ گوێز بە خوا دەفرۆشم کە دەبێ بیژمێرم تا لێم تێکنەچێ.

## قانع و قیافەناسی

دیسان کاک وریا قانع گێڕایەوە و فەرمووی:

باوکم لە قیافەناسیدا زۆر تەواو بوو. بۆ نموونە لە یاری کڵاوێن واتە (گۆزەوی بازی)دا زۆر شارەزا بووە. کەسێ گەراوە مازو، یا موور، یا فلسی شاردۆتەوە کە باوکم چاوی کەوتووە بە چاوی کابرا یەکسەر زانیویە لە

کـــوێ داینـــاوە. زۆر جـــار بـــاوکم چـــووەتە دەرەوە تـــا شـــاردوویانەتەوە وتوویـــە بـــە کـــابرا تماشـــای پشـــکیلەکان بکـــە، یـــا بیـــان ژمێـــرە. کـــە تماشـــایکردووە بـــاوکم یەکـــەر زانیویـــە و دۆزیویەتەوە.

## قانع و کەلب رەزاخان

ماموستا دوکتۆر سـەلاح سـۆران گێڕایـەوە و فەرمووی:

ماموســـتا لـــە مـــەهاباد بـــوو. ســـەردەمی کۆمـــاری مـــەهاباد بـــوو. لـــێ دەپرســـن لـــە کـــوێ خزمـــەت دەکـــەی؟ دەڵـــێ: لـــە «ســـەگی قـــازی»، ئـــەوانیش دەڵـــێن: تێناگـــەین. دەڵـــێ: لـــە دێـــەکدا کـــە پـــێی وتـــراوە «کـــەلب رەزاخـــان» ئێـــستە ئـــەو دێـــە لـــە ژێـــر دەســـەڵاتی کۆمـــاری مـــەهاباد دایـــە و دەبـــێ نـــاوی بگۆڕێـــت. کـــەلب دەبێتـــە ســـەگ و رەزا خـــانیش نـــەماوە دەبێتە قازی، کە وابوو لە سەگی قازی خزمەت دەکەم.

ماموستا دوکتۆر سەلاح سۆران

## قانع و رۆنی هەورامان

ماموستا عوسمان محەممەد هەورامی گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیـــان ماموســـتا قـــانع لـــە دێـــی نـــەوتی دەبـــێ لـــە قـــەرەداخ. بـــرنجی باشـــی دەبـــێ، بـــەڵام رۆنـــی چـــاکیان نـــابێت،

دەیەوێ بێ بۆ سلێمانی، مەلاژن دەڵێ بەڵکو رۆنی چاکی هەورامان بکڕێ. دەڵێ: باشە دەچم بۆ لای حاجی ناسراوم بزانم رۆنی هەورامانی هەیە. دەچێتە سلێمانی و دەچێتە لای حاجی، دەڵێ: رۆنی هەورامانت هەیە؟ دەڵێ: بەڵێ. مامۆستا دەفەرموێ چۆن بڕواکەم هی هەورامانە؟ حاجی دەڵێ: بەو قورئانەی خوا هی هەورامانە. مامۆستا رۆن دەکڕێ و دەیهێنێتەوە بۆ ماڵ و ئێوارە چێشت لێدەنێن. بۆنی پیسی رۆنەکە ئەو گەڕەکە دادەگرێ، مەلاژن دەڵێ ئەوە رۆنی هەورامانە تۆ هێناوتە، بۆنی پیسی بە هەموو لایەکدا بڵاو بۆتەوە! مامۆستا هەڵدەستێ و دەچێتە بەردەمی قورئانەکە کە لە سەر رەفەکە دانراوە و دەڵێ: قورئانەکە تۆ دەستی منت بڕی، لەگینا من حاجی دەناسم!

## قانع و ماڵە رووخاوەکەی

دیسان کاک عوسمان هەورامی گێڕایەوە و فەرمووی:

یەکێ لە بنەماڵەی قانع لە نزیکی پێنجوێن داوای لێدەکەن جێگە ماڵێکی قانع هەیە بیدا بە ماڵە فەقیرێك با بیکەنەوە بۆ خۆیان، ئەویش دەڵێ: دەباشە پێشکەشی بێت من لە جیاتی بنەماڵە دەیدەمێ. دەڵێن بە کابرای

هەزار ئەوەتە جێگە ماڵەکەی مامۆستا ئامادەیە، بیکەرەوە. کابرا دەڵێ: ئەوەڵڵا هەرگیز ماڵی قانعم ناوێ، وەکو ئەوم لێدێ، لەو ماڵەدا نە نانی هەبوو، نە ئاو.

## قانع و مانگرتن

**مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم[1] گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم

من قانعم زۆر خۆشدەویست. زۆرم بە گەورە دەزانی، دەچوورە ماڵی شێخ لەتیف من شێخ لەتیفم لە سەر حەقیقەتی خۆی نەدەناسی، رۆیشتنی قانع بۆ ماڵی شێخ لەتیف و عەلاقەی لەگەڵ شیعر و وتەکانیدا جیاوازە، تەنانەت جارێك پێم وت: باشە تۆ بۆچی دەچیتە ماڵی ئەم کابرایە. هەتا لە زیانی شێخ لەتیف تێگەیشتم کە چ پیاوێکە، چ کەسێتیەکە. تا کاك حەسەنی قزلجی بۆی گێرامەوە، شێخ لەتیف چ گەورە پیاوێك و چ نیشتمانپەروەرێك بووە، جا تێگەیشتم و زانیم قانع چاکی کردووە چووەتە لای شێخ لەتیف و بە حەقیقەت پیاوێکی گەورە و نیشتمانپەروەر

---

[1] ـ مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم گەورە پیاوێکی کوردە، جگە لەوەی هەلوکارێکی راست و خزمەتکارێکی ماندوونەناسی مامۆستا مەلا کەریمی مودەڕیسە، خۆشی نووسەر و ئەدیب و خزمەتکارێکی بێوێنەیە لە بواری ئەدەب و فەرهەنگ و کەلەپووری کوردیدا. کتێبخانەی کوردەواری بە نووسراو و لێکۆڵینەوە و چاپکردن دەوڵەمەند کردووە. خوا بیهێڵێ و سەرکەوتووی کا.

بوو. قانع زۆر قسەخۆشبوو، لە کەرکووك و لە بەغدا هاتووەتە ماڵمان، یەکێ لە قسەخۆشەکانی: بورهانی کوڕی لە بەغدا ڕۆژنامەنووسبوو. بە خۆڕایی سواری پاس دەبوو، چونکە ڕۆژنامەنووسبوو پارەی نەدەدا. ڕۆژێ لەگەڵ باوکی سواری پاس دەبێت، پارەی باوکی دەدا و پارەی خۆی نادا. باوکی دەپرسێ: چۆن پارەیان لێ وەرنەگرتی؟ دەڵێ: من ڕۆژنامەنووسم. مامۆستاش دەڵێ: دە کەوایە بۆچی ناچی هەر سوار بی و دانەبەزی، مادام خۆڕاییە.

قانع قسەی خۆشبوو، لەو کاتەدا کە عەبدولکەریم قاسم پەشیمان بۆوە لە بەڵێنەکانی و کۆمۆنیست و ناشتیخوازانیان سەرکوتکرد، قانعیشیان بە ناو ناشتیخوازەوە گرت و بردنیان بۆ عەمارە. کە حەپسەکان لە خواردن ماندەگرن، قانع مان ناگرێ و شت دەخوا. دەڵێن تۆ بۆ شت دەخۆی؟ وەکو ئێمە خۆت ناگری؟ دەڵێ: من لە هیچ دەستە و حیزبێك نیم کاکە، برسیم دەبێ و بۆچی برسی دانیشم.

## قانع و نوشتەنووسین

**کاك وریا گێڕایەوە و فەرمووی:**

ماڵمان لە دێی نەوتی دەبێ کە تابیعە بە ناحیەی قەرەداغ. باوکم مامۆستا دەبێ لە نەوتی، کابرایەکی کۆلکە شێخی

لێدەبێ، دەست بە نووشتە نووسین و کتێب گرتنەوە و ئەو جۆرە شتانە دەکا، بۆ خەڵك. دەستی عالەمی بڕیبوو. رۆژێکیان باوکم بە فەراشەکەی دەڵێ من دەچم لە مزگەوت دادەنیشم، تۆ وەرە بۆ مزگەوتەکە بڵێ مامۆستا کوڕەکەم نەخۆشە و فێی لێهاتووە و خەریکە دەمرێ، دوعایەکم بە پەلە بۆ بنووسە، ئەویش دەڵێ باشە. باوکم دەچێ لە مزگەوتەکە دادەنیشێ و لە دوای ماوەیەك فەراشەکە بە پەلە رادەکاتە ژوورەوە، دەڵێ: مامۆستا بۆ خاتری خوا فریامکەوە، کوڕەکەم خەریکە دەمرێ، دوعایەکم بۆ بنووسە. باوکیشم لەوێدا خێرا قەڵەم و کاغەز دەر دێنێ (پێی ئەبێ خۆی بۆ حازر کردووە) دوعاکەی بۆ دەنووسێ. کە دوعاکەی نووسی و فەراشەکە دەیەوێ بچێتە دەرەوە، بانگی دەکا دەڵێ: وەرە، وەرە. دەڵێ: چییە؟ دەڵێ: ئەوە پەنجا فلس بیدە بە مێو و بەرگ و شت بۆ دوعاکە و ئەمانە چونکە دوعا نابێ سەرقەڵەمانەی لێوەربگیرێ، چونکە ئەگەر سەرقەڵەمانەی لێوەربگیرێ برای نامێنێ.

لە بەر ئەوەی بەبەر پێش چاوی خەڵکەکەوە پارەکەی دایە، تاکو هەموویان تێبگەن، ئیتر نە ئەچوون بۆ لای کابرا و سەرقەڵەمانەیان لەئەدا. لە فێڵ و کەڵەکەی ئەو کابرایە رزگار بوون.

## قانع و نەورۆز

ـ کاک وریا تکایە بفەرموو لە نەوێ باوکت بۆچی گیرا و لە سەر چی بوو؟

ـ قوربان ئەم مەسەلەی پۆلیس و کەر سواریەی خالۆ شێخ مەحموود، کە لە دێی نەوێ بووین و باوکم گیرا و لە سەرچی گیرا با عەرزتبکەم. نەورۆز بوو، ئێوارەی نەورۆز بوو، ئێمە سێ برا بووین، باوکم هەر لە نیوەڕۆوە بە ئێمەی وت: هەڵسن شت کۆ بکەنەوە، پووش و دار و تەختە و چیلکە و پێڵاوە کۆنی دڕاو و ئەم جۆرە شتانە. لە دامێنی ئاوایەکەدا شەخسێك هەبوو، دەوروبەری شەخسەکە داری زۆری لێبوو، زۆرمان کۆ کردەوە بوو بە کۆمەڵێکی گەورە، کاتێ رۆژئاوابوون رۆیشتین، ئاگرمان کردەوە. پیاوانی ئاوایی نەهاتن، بەڵام مندالی ورد و لاو زۆر هاتن و لە دەورمان کۆ بوونەوە. باوکم لەوێدا شیعرێکی فارسی دەخوێندەوە.

نوروز شد نوروز شد    گل در چمن افروز شد

شادی مرا امروز شد

نوروز نو باز آمده    کار جهان ساز آمده

بلبل به پرواز آمده    قمری به آواز آمده

بابا بده نوروزیم    تا بر خوری از روزیم

بابا سلامت میکنم    خود را غلامت میکنم

وصف و ثنـــــــایت میکنم

ای خانم حوری سرشت       جـای تو باشد در بهشت

دستی بزن صندوقچه را       چیزی بده ایـــن بچه را

ایـــــن بچەی خوش لهجه را

ـ ئەم شیعرە هی کێیە، کاك وریا؟

ــ نـازانم ئـەم شـیعرە هـی کێـیە، بـەڵام ئـەوە دەزانم بـاوکم ئـەم شیعرەی لە بەر بوو دەیوت و ئێمەش لە بەرمان کردبوو.

جـا ئـا لـەو کاتـەدا کـە ئێمـە ئاوامـان دەکـرد، مـەلای دێ، کـە «مەلاحەمەکـەریم»ی نـاو بـوو، لام وایـە لــە هـەیوانی مزگەوتەکـەدا کۆمـەڵێ پیـاوی ئـاوایی دەوریـان دابـوو، لێیـان پرسـیبوو: ئـەرێ ماموسـتا ئـەوە ئـەو ئـاگرەی ماموسـتا قـانع دەیکاتـەوە حەرامـە، یـا حەڵاڵـە؟ ئـەویش پشـتیکردبووە بـاوکم، وتـبووی: وەڵڵاهـی ئـەوەی لە دووریشـەوە بـۆی بـڕوانێ تـەڵاقی دەکـەوێ، ئـەوە حەرامـە. هـەر ئەم مەلایـە لـە سـەر بـاوکمی نووسـیبوو بـۆ مودیـر ناحیـەی خورمـاڵ نـەك بـۆ هەڵەبجـە، چـونکە دێکـەمان تـابیعی ئـەوێ بـوو. بـۆ ڕۆژی دوایـی پۆلـیس هـات باوکمیـان گـرت. بەریشـیان نـەدا. نزیکـەی یەك دانە مانگ باوکم حەپسبوو.

ــ بـۆ سـاڵی دوایـی لـەو دێیـە بارمـان کـرد. چـووینە دێـی قەڵبـەزە. بەرانبـەر ئـەوێ، نزیکـەی چـارەکە سـەعاتێ لـە یەکـەوە

دوورن، بەرانبەر یەکن. لە قەڵبەزە کە نەورۆز هات باوکم نەیوێرا ئاگر بکاتەوە لۆکزێکمان هەبوو بە ئێمەی وت لۆکزەکە بەرن لە سەربان دایگرسێنن. لۆکزەکەمان بردو لە سەربان دامانگیرساند، جا خەڵکی ئاواییەکە بانگیاندەکرد: ئەو لۆکزەتان بۆ داگیرساندووە لەو سەربانە؟ بورهانی برام وتی: شتمان لێ ونبووە، بۆی دەگەڕێین بیدۆزینەوە.

## بنەماڵەی قانع

**کاک وریا گێڕایەوە و فەرمووی:**

لە بنەماڵەی ئێمەدا ژن و پیاوی زۆر بوون کە ئەدیب و زانا بوون، نموونەیەك لە خاتوو عادڵە، باوکم ماڵی لە کانی‌سانان دەبێ و خاتوو عادڵەی خوشکی بنەوانی دەبێ، هێشتا ژنی نەهێنابوو. لە کانی‌سانان لە پاڵ ئاواییدا کە دەچێ بۆ دەرەتفێ کانییەك هەیە، کانی کانی‌سانانی پێدەڵێن، لەوێدا چاخانەیەکی دانابوو.

ــ جا ئێواران ئەسبابی چاخانەکەی قۆری و پیاڵە و شتەکانی دەخستە ناو سندووقێکەوە، وەکو جانتایەك دەیبردەوە بۆ ماڵ. رۆژێکیان کە دیبەرەکەی تازە پێگەیبوو، لە پاڵ چاخانەکەیدا سێ چوار تروزی و خەیاری لێدەکاتەوە و دەیخاتە ناو سندووقەکە و دەیباتەوە. کە دەڕواتەوە ماڵەوە میوانیان دەبێ.

خاتوو عادلەیش دێ بە دەمیەوە، لەو کاتەدا باوکم سندووقەکە دەدا بە دەست خاتوو عادلەی خوشکی. خاتوو عادلەیش لەگەڵ وەریدەگرێ ھەستدەکا لە جاران قورسترە، شیعرێك ھەیە لە یوسف و زلێخادا دەڵێ:

بگفتا دلو ما امروز گران است
یقین چیزی به جز آب اندر آن است

ئەوە زیرەکی خاتوو عادلە پیشاندەدا لەوێدا پێی زانیوە ئەو شیعرەی یوسف و زلێخای خوێندۆتەوە.

## قانع و خاوەن موڵکێك

دیسان کاك وریا گێڕایەوە و فەرمووی:

ماڵمان لە دێی قەڵبەزە بوو، شێخ مەحموودی بەردەبەڵ، شێخ مەحموودی شێخ فەرەج و خاوەن دێ و موڵکەکان، ماڵی لەوێ بوو. کابرایەکی کوردی ئێرانیش ھاتبوو لەوێ کرێکاریدەکرد. ھەر ڕۆژێك ئیشی ھەبوایە ئیشی بۆ خەڵك دەکرد. ھەر ڕۆژێك ئیش نەبوایە لە ماڵی ئێمە نانی دەخوارد و شەویش لەوێ دەخەوت لەوێ. ڕۆژێکیان لە کاتی عەسردا باوکم پێی دەڵێ: عەبدولواحید گیان بەیانی بۆ ھیچ کەسێك ئیش مەکە.

ئێمە لیشمان هەیە، بەرد هەڵدەکەنین بۆ خانوو. ئەویش دەڵێ: باشە. لە دەوری بانگی شێوان شێخ مەحموود پێی دەڵێ عەبدولواحید بەیانی وەرە بۆ ئیش بۆ ئێمە. ئەویش دەڵێ: وەڵڵاهی مامۆستا قانع پێی وتووم، دەچم بۆ ئەو ئیش دەکەم. ئەویش تووڕە دەبێ. کچێکی هەبوو ناوی درەخشان بوو، لە بانگی شێواندا درەخشانی نارد بۆ لای باوکم، درەخشان وتی: مامە قانع؟ باوکیشم وتی: مامە گیان، وتی: باوکم دەڵێ رازی نیم عەبدولواحید ئەمشەو لەم دێیە بێ. ئەمە گوایە خاوەن دێیە و خاوەن مڵک. باوکیشم پێکەنی و وتی: دەی مامە گیان بە باوکت بڵێ عەبدولواحید دەیوت رازی نیم شێخ مەحموود ئەمشەو لەم دێیەدا بێت.

## قانع و ‹ لە هەزار کەمتر نابێ ›

کاک وریا گێڕایەوە و فەرمووی:

لە پێنجوێن فارسی محەممەد هەبوو لەگەڵ باوکمدا رەفیقەفەڵی دەبن. لە ناوچەی مەریوانەوە دەچن بۆ سنە. لە ڕێگا دەگەنە ئاواییەك، دەڕوانن کابرایەك کە فەیزوڵڵای ناوە لە سەر دار گوێزێك خەریکە دەبێ گوێز دەتەکێنێ. خەڵکەکەیش لە خوارەوە کۆیدەکەنەوە. وتی

ئێمەش حەزمان لە گوێز دەکرد و تازە پێگەیشتبوو، فەقێ بووین بە ناوی پارەوە وتمان: کاکە دە گوێزمان بە چەنێ پێدەفرۆشن. فەیزوڵڵا لە سەر گوێزەکە وتی: «وە گیان پەیغەمبەر وە هەزار نەوێ نایفرۆشم». هەر چەندە هەوڵماندا بابە ئێمە هەزارمان بۆ چییە، یەکی دە گوێز دەخۆین، دەستەیەك دوو دەستە گوێزمان بەنێ بە پارە، چەنێ دەڵێن دەتاندەینێ. وتی قەیەك لە ئێمە و قەیەك لەو، لە سەر دارەکەوە بە توورەییەوە وتی: وە گیان پەیغەمبەر وە هەزار نەبێ نافرۆشم. لەگەڵ تەواو بوونی قسەکەی لقەکە لە ژێر قاچی کابرا شکا و کەوتە خوارەوە. کەوتە حاڵەتی بێهۆشی و خەڵك دەورەمانیان دا و مەلا گیان بە قوربانتبم یاسینی بخوێنە ئێمەیش وتمان: وە گیان پەیغەمبەر وە هەزار نەبێ نایخوێنم! بڕێ تماشایانکردین و وتیان: کابرا هیلاکە. دەی باشە، باشە هەزار گوێزتان دەدەینێ. وتی: دەی بێنە پێشەوە. کۆمەڵێك گوێزیان هێنایە پێشەوە. باوکم وتی من دەستمکرد بە یاسینخوێندن و هاوەڵەکەیشم دەستیکرد بە گوێز ژماردن. وتی: هیچمان پێنەبوو. جا بۆ فەقێ عادەتبوو بە سەر دەرپێدا شەرواڵێکیشیان لە پێدەکرد.

باوکم وتی: هاوەڵەکەم شەرواڵەکەی داکەند و دەرەڵنگەکانی گرێدان و دەستیکرد بە ژماردن، وتی من یاسینەکەم دەخوێند، ئەو وتی ٢٨، ٢٨ لەمە حەقدە، شازە پازە! دەیوت ئەوان لە ناو حەیەتی کابرا ئاگایان لێبوو، وتی شەرواڵەکە هەڵاکو گرتی، تێکرد. ئیشارەتێکی بۆ من کرد و وتی: ئەوە تەواو بوو. ئیتر منیش کۆتاییم بە یاسینەکە هێنا و گوێزەکانمان برد بۆ سنە، لەوێ لە مزگەوتێکدا دامان بە فەقێکان، خۆمان و ئەوانیش تێرمان خوارد.

## قانع و فێرکردنی پیتەکان

مامۆستا بۆ فێر کردنی منداڵ بۆ خوێندن رەوشێکی تایبەتی بە کار دەهێنا. دیسان کاک وریا گێڕایەوە و فەرمووی:

لە کاتێکدا هێشتا من لەدایکنەبووم و سەلاحی برام تازە خەریکبووە زمان بگرێت، باوکم هەر ٢٩ حەرفەکەی بە هەویر بۆ دروست کردووە. بە ساج برژاندوونی بە دایکمی وتبوو: نانی مەدەرێ هەتا برسی دەبێ. کە برسیبوو پێیان داوە، وتوویانە ئەمە ئەلفە، ئەمە بێیە، ئەمە تێیە، ئەمە لامە و ... هەموو پیتەکانیان بە جۆرێ پیشاندابوو ناسیوونیەوە، ئەمجارە کە لێیان

پرسیوە کام حەرف دەخۆی، ئەوەندە زۆرزانبووە وتوویەتی لام لەلفەلا دەخۆم، چونکە لە هەموویان گەورەتر بووە.

## قانع و نادرەسی تاران

دیسان کاک وریا گێڕایەوە و فەرمووی:

باوکم لە سلێمانی دەبێ و شێخ ... لە سلێمانی دەبێ. ئێوارەیەك پێکەوە دەچن بۆ دیوەخانەکەی شێخ لەتیف. لە کاتی قسە کردندا شێخ ... خۆی هەڵدەکێشێ، دەڵێ من ساڵێکیان لە تاران وەزیر بووم، وام کرد و وام کرد، کە وا دەڵێ شێخ لەتیف چاوێك دادەگرێ لە باوکم و لە پاشان دەڵێ: باشە قانع ئەوە بۆ نەچووی بۆ تاران بۆ لای، ئیشێکت بۆ بدۆزێتەوە. باوکیشم دەڵێ: ئاخر قوربان رێگەم نەدەزانی. من چووزانم تاران لە کوێیە.

## قانع و تازە موسوڵمان

دیسان کاک وریا گێڕایەوە و فەرمووی:

ماڵمان لە سەرکان بوو، کابرایەکی نۆموسڵمان ماڵی هاڵە سەرکان ناوی میرزا عەلی بوو. هەموو رۆژێك لە

بەر مزگەوتەکەدا لە سەر حەوزەکە، خەڵکەکەی بەگێر دەهێنا: من دینی محەممەدم زیاد کردووە و پێویستە خزمەتم بکرێ و من دینی ئیسلامم سەرخستووە و دینی مووسام شکاندووە.

ئەوەندە لەم بابەتە دوا، ڕۆژێکیان باوکم پێی وت: میرزا عەلی، وەڵلاهی چ خێرێکت داوەتەوە بۆ مووسا، هەر ئەو خێرەیش دەدەیتەوە بۆ محەممەد، دە واز بێنە!

## قانع و کلاشینکۆف

دیسان کاک وریا گێڕایەوە و فەرمووی:

شۆڕشی ئەیلول دەستی پێکردبوو، کلاشینکۆف کەوتبووە نێو کوردستانەوە و ئێمەش ماڵمان لە (لزارە) بوو. ڕۆژێکیان دەستەیەك پێشمەرگە هاتنە ئەوێ، یەك دوویەکیان کلاشینکۆفیان هەبوو. باوکیشم تەماشایکرد، یەکەم جار بوو دەیبینی، سەری سوڕما. وتی: ئەرێ ئەم چەکە ناوی چییە؟ وتیان: ناوی کلاشینکۆفە. باوکیشم وتی: وەڵڵا سا منیش ساچمەزەنێکم هەیە سوکانی سەیارەیە کردوومە بە ساچمەزەن، لێرە ئاسنگەرێك لە نزارە بوو ئەو کردبووی، ناوی حاجی عەلی بوو، وتی: منیش ساچمەزەنەکەم ناوێ حاجی عەلی ئۆفە.

## قانع و ماشێن

**دیسان کاک وریا گێڕایەوە و فەرمووی:**

باوکم لە سنە قەقێ دەبێ، بۆ یەکەم جار دەبێ سەیارە دێتە سنە. کە هاتبووە ئەوێ ئەویش پێنج قەرانی دەبێ، دەچێتە لای شۆفێرەکە، دەڵێ بایی ئەم پێنج قەرانە سوارمکە. دەڵێ: بۆ کوێ؟ دەڵێ: بۆ هەر کوێیەك دەڕۆی. دەڵێ: وەڵڵاهی ئەوەندەت دوور دەخەمەوە هەتا دێتەوە سەگ بتخوا.

## قانع و گۆرانی

**دیسان کاک وریا گێڕایەوە و فەرمووی:**

باوکم جارجارە بۆ خاڵیکردنەوەی دەروونی، گۆرانی و حەیرانی دەوت و جارجارە لەگەڵ دایکم دادەنیشتن بە جووتە گۆرانی حەیرانیان دەوت، جا من کەمێکم لە بیرماوە. باوکم دەیوت:

ئەمن و سەگ بازو لە خێڵ جێماوین

لە بەفراو خواردن کوێستان بڕیاوین

به زمانی جاڵەکانەوە دەیوت:

ئەمن و قەلەرەش (هەیلانێ) کوردمانە گرەو (هەیلانێ)

ناو سك من رەشتر (هەیلانێ) لە سەر باڵی ئەو (هەیلانێ)

ئەمانـــە كۆمەڵـــە شـــتێك بـــوون كـــە دایكیشـــم دەیـــزانین. جـــارێك دایكـــم دەیـــوت، جـــارێكیش بـــاوكم دەیـــوت. لـــە یـــەكتریان دەســـەندەوە. ئـــەم حەیرانـــەی ئـــەوانم هـــەر لـــە یـــاد ماوە.

## قانع و كاكە حەمەی ناری

دیسان كاك وریا گێڕایەوە و فەرمووی:

كاكـــە حەمـــەی نـــاری لـــە بـــێلووەوە دەچـــێ بـــۆ «كـــاڵ». ئـــەو زەمانـــە مـــاڵی بـــاوكم لـــە كـــاڵ دەبـــێ. كـــە دەچـــێت، پـــاش دانیشـــتن و ئیســـراحەت روو دەكاتـــە بـــاوكم دەڵـــێ: قـــانع. دەڵـــێ: بـــەڵێ. دەڵـــێ: بـــەم هاتـــەم بـــۆ ئێـــرە دڵـــی دۆســـت و دوژمـــنم خۆشـــكردووە. ئـــەویش دەڵـــێ: قوربـــان، چـــۆن دڵـــی دۆســـت و دوژمنـــت خۆشـــكردووە؟ دەڵـــێ: ئـــەوەی كـــە دۆســـتێك دیومـــی بـــە پێـــان دەڕۆم وتوویـــەڵی ئۆخـــەی هێشـــتا كاكـــە حەمـــە هێـــز و گوڕێكـــی تـــێدا مـــاوە، دەتوانـــێ بـــە پـــا بـــڕوات، شـــوكور هێشـــتا گەنجـــە، دڵـــی بـــەوە خۆشـــبووە. ئەوەشـــی كـــە قینیـــەتی لـــێم دوژمنمـــە وتوویـــەتی ئۆخـــەی كابراكـــە نـــاوا بـــەو پیریـــە چـــەكە چـــەك كەوتوویتـــە ئـــەم ڕێگەیـــە و كەرێكت نییە سوارببێت.

## قانع و قەرز

**دیسان مامۆستا وریا قانع گێڕایەوە و فەرمووی:**

لە ساڵەکانی سەرەتای پەنجاکان و کۆتایی چلەکاندا، ماڵمان لە سەرکان بوو. زۆر هەژار و دەستکورت بووین. ڕۆژێکیان چامان نەمابوو. کابرایەکیش کە ناوی ئەحمەدی عادڵەکافیە بوو، لە ئاوایی سەرکان نیمچە دوکانێکی بوو، چای دەفرۆشت. باوکم بە منی وت: «وریا بڕۆ بڵێ باوکم وتی ئەللی درەم[1] چام بۆ بنێری، جا کە پارەکەم دەستکەوت بۆی دەنێرم، بڵێ بە قەرز، بزانە دەتداتێ؟» منیش ڕۆیشتم وتم: «کاك ئەحمەد، باوکم ناردوومی، وتی ئەللی درەم چامان بۆ بنێرێ» کابرا چاییەکەی پێدام. کە بەرەو ماڵ بوومەوە و لە دەشتەکەوە دەرکەوتم، باوکم بانگیکردم وتی: شێری، یا ڕێوی؟ منیش وتم: شێرم. کە وتم شێرم ئاوا دانیشت و کڵاو و مێزەرەکەی هێنایە پێشەوە و دەستیکرد بە سیاچەمانە وتن، سیا چەمانەیەکی باشی دەزانی. یانی بەو ئەللی درەم چاییە، ئەویش بە قەرز، ئەوەندە خۆشحاڵبوو، هەر وەك سۆپەرێکت[2] پێدابێ.

---

١ـ لەو کاتە چایی بە کیلۆ نەبوو، بە هۆقە بوو. هۆقەیەك سێ کیلۆ بوو. لیزدرەمێکیش کیلۆ و نیوێك بوو ئەللی درەم چوارەکی کیلۆیەك بوو. ئەللی درەم چا بەسێ پەنجایی بوو. گلەیی لە کوردی عێراق لەکا بۆچی ناوی سەنگەکانیان ئاڵوێرن و نایکەن بە کوردی. وەکو ئەی لێمە سیە و پاڵزەیی و ...

٢ـ جۆرە ماشێنێکی ژاپۆنی

## قانع و خورافات

**دیسان مامۆستا وریا قانع گێڕایەوە و فەرمووی:**

ساڵێکیان قانع لە مەریوان فەقێ دەبێ، کتێبێك دەخوێنێ، وا بزانم «ارشادالعباد»ە، حیکایەتێکی تێدایە دەڵێ: «*عابیدێك لە چیایەك نوێژیدەکرد، عیبادەتی خوای دەکرد. ڕۆژ گەیشتە دەمی عەسرێکی درەنگ و خەریکبوو خۆر ئاوا دەبوو، عابیدەکە دەستنوێژی نەبوو، کانیەکەش دوور بوو. خوا ورچێکی نارد، ورچەکە گۆزەکەی برد لە کانی پڕ گۆزەیەك ئاوی بۆ هێنا و عابیدەکە دەستنوێژی گرت و نوێژیکرد و نوێژەکەی نەچوو.*»

کە قانع ئەمە دەخوێنێتەوە بە مامۆستا دەڵێ: مامۆستا وەڵڵا ئەمە ڕاست نیە. ئەویش پێی دەڵێ: مەلعوون چۆن ئەمە ڕاست نیە؟ ئەوە نیە کتێبەکە نووسیویەتی؟ دەڵێ: ئاخر مامۆستا با ئێمە بە واقعی قسە بکەین. ئەگەر ورچەکە بە دوو پا بڕوا و گۆزەکە هەڵگرێ. دارە دارە دەتوانێ بڕوا، کابرا خۆی دە لەوەندەی ئەو خێراتر دەتوانێ بڕوا بۆ سەرکانیەکە. ئەگەر بە چوار چەمۆڵەش رابکا، گۆزەکە لە بەرد دەدا و تەواو دەشکێ. خۆ ئەگەر ئەشدا لە بەرد و گۆزەکەش نەشکێ، ئاوەکەی تیا ناوەستێ و دەڕژێ.

لە سەر ئەمە لە شاری مەریوان شار بە دەریدەکەن. هەتا وەکو دەچێ لە سنە مەلایەك دەدۆزێتەوە کە بۆنی

خزمایەتی دەبێ لەگەڵیدا. ئەو لەوێ گلیدەداتەوە. چونکە پاییز بووە و لە پاییزانیشدا مزگەوتەکان فەقێ وەر ناگرن. بۆ ئەوەی لەو زەخیرەیەی خۆرۆژانە بۆ زستان یەکێکی تر لەگەڵ هاوبەش و هی خۆیانی.

## قانع و ئێران

قانع وەکو کوردێکی ئێران ماوەی ئەداوە ئێران ئیهانە بکرێت و هەر کەسێ شتێکی ناشیرینی وتبێ خێرا وەلامیداوەتەوە.

دیسان کاک وریا گێڕایەوە و فەرمووی:

قانع لە بەغدا دەورەی مامۆستایی دەبینێ. رۆژێکیان مامۆستاکەیان باسی بازرگانی نێوان عیراق و ئێران دەکا. باسی ئەوە دەکا کە لە عێراقەوە شتی باش دەچێ بۆ ئێران. بەلام لە ئێرانەوە هیچ نایە بۆ عیراق. لە ناو مامۆستاکاندا قانع دەست بەرز دەکاتەوە دەڵێ: مامۆستا منیش تێبینییەکم هەیە. ئەویش دەڵێ: فەرموو. مامۆستا قانع هەڵدەستێ و دەڵێ: مامۆستا راستدەکا. دەڵێ: ئەو شتانە لە عیراقەوە دەچن بۆ ئێران. بەلام لە عێراقەوە کۆمەڵێ شتی لە بیر چووە. لە عیراقەوە سوون دەچێ بۆ ئێران، کوللە دەچێ بۆ ئێران. حاجی لەقلەق دەچێ بۆ ئێران. تەیرەن ئەبابیلە و پەرەسێلکە و تا ئەم جۆرە شتانە هەموو دەچن بۆ ئێران، بەلام لە ئێرانیشەوە فەرشی کاشان و برنجی سەدری و قەیسی و کشمیش و گوێز و لەم جۆرە شتانە، خەنە و بابەتی هەورێشمی ئیرانی و ئەمانە هەموو دێن بۆ عێراق.

مامۆستا محەممەد سالح عابدی

## قانع و میوانی

مامۆستا محەممەد سالح عەبدی دانیشتووی شاری سنە گێڕایەوە و فەرمووی:

ناوی مامۆستا قانعم بیستبوو، کاتێك کە چاوم پێکەوت، وەکو دەڵێن دەنگی دەهۆڵ لە دوورەوە خۆشە، بە دوور کوڕی نزیك خەسار هاتە بەر چاوم. یەکێك لە هاورێکانم مامۆستا قانعی بە من ناساند. وتی ئەمە قانعە. دوای چاك و چۆنی و هەواڵپرسی مامۆستا قانع ئەوەندە بە وتە شیرینەکانی لەگەڵ مندا دوا، وام دەزانی ناشنای کۆن و دێرینەمە و ساڵەهایە کە دەیناسم. شێوەی مامۆستا قانع بالآبەرزێك، چاقڵ و درێژ، مێزەرە بە سەر، رەفوتەقێکی ئێسقان قەوی، چەوت و چێڵێکی خوار و لار، چاو کزێکی مڕ و مۆر، هەنگاوی بچووکی دەنا و دایم رووخۆش و پڕ لە هیوا و لەگەڵ هەر کەسێکدا بدوایە دەیکێشا بۆ لای خۆی، کەس حەزینەدەکرد بە جێی بێڵێ. بە بۆنەی وتە شیرینەکانیەوە بوو دایم گەدا و دەوڵەمەند و گەورە و بچووك، ئاواتەخواز بوون کە دەعوەتی بکەن بۆ ماڵ خزیان و شەوێك لە شەوان بە دیار وتە بە نرخەکانیەوە دانیشن، کە پڕ بوون لە رابوردووی کۆنی کوردەواری، پەند و ئامۆژگاریان بە گشت کەسێك دەبەخشی. ئاشنا بوو لەگەڵ هەر کەسێك کە

نەیدەناسی. چونکە گشت خەڵکی ئەویان دەویست و هەموو کەسێ بە کەسی خۆی دەزانی، حەزیدەکرد گشتی سەربەرز بێت. کاتێ قسەی دەست پێدەکرد، وات دەزانی ساڵەهای ساڵە دەیناسی. بۆیە منیش چەند شەوێك لە ماڵی خۆمان کردم بە میوان و شەو و رۆژمان لەگەڵ یەك کردەوە.

شایانی وتنە کە خۆی و کاك بورهان و کاك وریا و یەك دوو کەسیتر لە خزمەکانی و هاورێکانی هەرکامیان خاوەن قسە و وتەی شیرین و بە نرخ بوون. گشتیان بە وتەی شیرین و قسەی بەنرخ رازاوە بوون. قسەزان و قسەخۆشبوون و کۆڕیان دەڕازاندەوە.

هاوینی ساڵی ١٩٦٣ بوو، لە گاراجی سلێمانی دووبارە چاوم پێی کەوت، تکام لێی کرد ئێوارە میوانی من بێت. دوای ئەوەی کە تەشریفی هێنا دوای خواردنی نانی ئێوارە وتی: نە بە دوێنێشەوم و نە بە ئەمشەوم. وتم: چۆن؟ وتی: دوێنێ شەو لە ماڵی «شێخ قادری حەفید»[1] بووم، باوەڕ بکە لێفە و دۆشەکەی ئەوەندە نەرم و خزیان بۆ راخستبووم ــ چونکە فێر نەبوبووم ــ هەتا بەیانی نەمتوانی بخەوم و خەو نەچووە چاوم، بەڵکو ئەمشەو لە بان ئەم حسیرە رەقەی ئێوە تێر بخەوم و ئیسراحەتبکەم. هەر لەو شەوەدا دەستیکردە گێڕانەوەی داستانێك کە

1ــ برای شێخ مەحموودی نەمر.

نیشاندەری زانستی ئەو بوو لە بواری مێژوو و فەرهەنگی کۆندا. وتی: دەزانی بۆچی هەر کاتێك مانگ بگیرێ، خەڵکی دەستەکەنە تەقە کردن و تەنەکە[1] لێدان؟ ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یەکێك لە پادشاکانی ئێران، کە ئەستێرەناس و زانایەکی دەرباری، لەگەڵیدا گرەو دەکا، کە گوایە لە فلان شەودا مانگ دەگیرێ، بەڵام پاشا باوەڕ ناکات و دەڵێ: شەرتبێ ئەگەر مانگ بگیرێ، من کچەکەمت دەدەمێ. ئەویش کە دڵنیا دەبێ لە وتنی ئەم پێشگۆییەی خۆی، بە گشت شاگرد و موریدەکانی دەسپێرێ کە بۆ ئەو شەوە هەر کامیان تەنەکەیەك و دارێ بگرنە دەستیان و دەستبکەنە تەقە تەق کە گوایا بەو تەقە تەقە، مانگ کە بە دەستی جنۆکەکان گیراوە بەر دەبێ و رزگاری دەبێت، چونکە جنۆکەکان لە تەقە تەق دەترسن. ئەم پێشبینییە لە هەمان کاتدا، کە ئەستێرەناسەکە وتبووی روو دەدات و لە کاتێکدا کە شا نووستووە، بڕیار وایە هیچکەس شا هەڵنەسێنێ و خەبەرینەکاتەوە، لەو کاتەدا دەستەدەکەنە تەنەکە لێدان و تەقەتەق، پادشا بەم دەنگە دەنگە هەڵدەستێت و وەختێ پرسیار دەکات کە چی بووە؟ دەڵێن: مانگ گیراوە و دنیا خرۆشاوە، ئەم تەقە تەقە بۆ ئەوەیە کە مانگ لە دەست جنۆکەکان رزگار بکەن. ئەوسا دەزانێ کە چ خەبەرە و چی قەوماوە، قسەی زاناکە دروستبووە. لەو کاتەوە تا ئێستا

---

[1]ــ حەلەبی.

باوە کە لە کاتێکدا کە مانگ دەگیرێ، تەقە تەق دەکەن و لــە تەنەکــە دەدەن.

## قانع و خواردنی نیوەڕۆ

دیســان مامۆســتا محەممــەد ســاڵح عــەبدی لــە ســنە گێڕایــەوە و فەرمووی:

نیوەڕۆی یەکێك لە ڕۆژەکانی هاوینی ۱۹۶۳ بوو. مامۆستا قانع لە چایخانەی ئەسحابەسپی دانیشتبوو. منــیش بــە ویــدا تێدەپــەڕیم، چــوومە خزمەتی، دوای چاك و چۆنی و هەواڵپرسی، بینیم خەریکی نانخواردنە و نان و کەوەر دەخوات. وتم: باشە مامۆستا بۆچــی ناچــیتە کەبابخانــە، یــا چێشتخانە بە تێری نان بخۆی؟ وتی: برا گیان تــۆش ســەیرت هەیــە. لــە بێخەبەران کەشــکەك ســەڵەوات. مــن هــەمووی خــاوەنی ۲۰ فلســم. عانەیــەکم داوە بــە ئیســتکانێ چــا، عانەیەکیشــم داوە بــە نــانێك و عانەیەکیشم داوە بە دەسکێ کەوەر و ئەو دەسکە کەوەرە گشتی ناخۆم و بەشی دوو ڕۆژم دەکات. ئەوا ئــەمڕۆ خــۆم تێــر دەکــەم. بــۆ بــەیانی ئەگەر خوا بیکات عانەیەکم دەستکەوێ نانێکی تری پێدەکڕم و بەیانیش تێر دەبم و دەیبەمە سەر، چاش نەبێت زۆر گرینگ نییە. ئەمە دەچــێتەوە سەر ئەو داستانە، جارێکی خێڵــێك دەیانــەوێ بــەرەو کوێســتان بچــن، کاتێ کە دەبیــن چەتە لە ڕێگایاندایە، گەورەکانیان دەڵێن: لــە چــەمی چەقانەوە مەڕۆن، سەگاتان دەســوێ، لــە چــەمی شــارەزوورەوە بــڕۆن. مەبەســتی ئەوەیە کە چــەمی چــەقان دزی لێیــە و خۆتــان لــەوێ لادەن.

منیش دەمەوێ خۆم لە خەرجی گران لادەم. بۆیە روو ناکەمە کەبابخانە و چێشتخانە و دەمەوێ بە کەم قەناعەت بکەم.

## قانع و سینەما

دیسان مامۆستا محەممەد ساڵح عەبدی گێڕایەوە و فەرمووی:

ڕۆژێک چووم بۆ سینەما سەیروان، چاوم کەوت بە مامۆستا قانع، مامۆستاژنیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆ سینەما، دەگەڕان بە ناو ساڵۆنی سینەمادا و وێنەی ناو ساڵۆنی سینەمایان تەماشا دەکرد، وتم: مامۆستا، لێرە چی دەکەی؟ وتی: هاتووم ئابڕووی بەعزێک بەم. وتم: چۆن؟ وتی: ئەو کەسانەی وا دەڵێن سینەما حەرامە. منیش ئاوا بە جلی مەلاییەوە، بە شاڤڵی درێژ و مێزەرەی سپی، دەستی مەلا ژنم گرتووە و هاتووین بۆ سینەما.

## قانع و فرۆشتنی کتێب

دیسان مامۆستا محەممەد ساڵح عەبدی گێڕایەوە و فەرمووی:

ڕۆژێک لە سلێمانی لە شەقامی مەولەوی بە مامۆستا قانع گەیشتم، کتێبێکی خۆی بە دەستەوە بوو. دوای هەواڵپرسی لە بارەی ئەو کتێبەوە پرسیارمکرد. وتی: دەستم لێ مەدە، سێ ڕۆژە ئەم کتێبەم بە دەستەوەیە، دەمەوێ بیفرۆشم، بەڵام ناتوانم،

ئەمە لە حاڵێکدایە کە خەڵکی بە ئاواتی کتێبەکەی من دەستیان کەوێت و لە کتێب فرۆشیەکاندا نایابە.

## قانع و چادرنشینەکان

دیسان مامۆستا محەممەد ساڵح عەبدی گێڕایەوە فەرمووی:

مامۆستا خۆی ئەم رووداوەی بۆ من گێڕاوەتەوە: رۆیشتبوومە ناوچەی گەرمیان، چووم نەوە ناو خێڵێك و لە ژێر چادردا دانیشتین. دەستمانکرد بە قسە و گفتوگۆ، دوای ئەوەی نان و چامان خوارد. قسە هاتە سەر قسە و باسی شیعر و قانع و کورد کرا. پیاوێك وتی: ئێژن کەسێك پەیدا بووە ناوی قانعە و بن و بنەچەی کورد دەزانێت، وەك غەییزالەکان ئێژن ئەمە نیشانەی دنیا ئاخرە. منیش وتم: بەڵێ وایە و من خۆمم. ئەوەش راستە کە دەڵێن دنیا ئاخر دەبێ. ئێوەش پێش ئەوەی دنیا ئاخر بێت، هەستن کاورێك سەر ببڕن با لە ناو خێڵدا دەستە جەمعی بیخۆین. کابرا رایکرد و کردیە هەرا: خەڵکینە بێن فریا کەون، ئەوە ئەو رۆژەیە وا لێی دەترساین. ئەوەتا خۆی هاتووە. خەڵك کۆبوونەوە و قسەی زۆرم بۆیان کرد و شیعری زۆرم بۆیان خوێندەوە و ئەوانیش کاوریان سەر بڕی و گۆشتاوێکی خۆشیان دروستکرد و پێکۆ ناخۆش خواردمان.

## بیرەوەرییەك لە كاك بورهان

دیسان مامۆستا محەممەد سالح عەبدی فەرمووی ئەم بیرەوەریەشی لەگەڵ كاك بورهاندا هەیە كە جێگای خۆیەتی باسبكرێ:

لە سلێمانی تووشی كاك بورهان بووم و دوای چاك و چۆنی و هەواڵپرسی وتم: چییە، ناسازی؟ وتی: مەپرسە، زۆر حاڵم ناخۆشە، دەمەوێ سەری خۆم هەڵگرم و بچم بۆ جێگەیەك كە هیچكەس نەزانێت. وتم: ئاخر بۆ. وتی: من دەمەوێ لە دەست ژنەكەم راكەم. منی شێتكردووە، گیرم خواردووە بە دەستیەوە، جارێ كە مان دەگرێ بە دوو هەفتە جارێ قسەیەكم لەگەڵ ناكات.

منیش زانیم دڵی پڕە، بۆیە بۆ دڵنەوایی ئەو وتم: جا كاكە ئەمە خۆ هیچ نییە، من ژنێكم هەیە ئەگەر ئێستا بچین بۆ ماڵی ئێمە دەبینی سەرین و دۆشەكەكان هەموویان بۆگەنیان لێدێ، هاتم زۆر لە بارەی وەزع و چۆنیەتی ماڵی خۆمانم بۆ باسكرد. ـــ ئەمە لە حاڵێكدابوو كە ئەو دەیزانی من ژنم نییە ـــ وتی: وەڵڵا هی من ئاواش نییە، بەڵام چونكە منت پەشیمانكردۆتەوە و نەتهێشتووە بڕۆم، دەعوەتتدەكەم بێیتە ماڵمان. «چونكە مریشكمان هەیە» من وتم: ناتوانم بێم. وتی: ئاخر من بۆلە شەرم و رووم نییە برۆمەوە، بە بۆنەی تۆوە هەم من دەڕۆمەوە و هەم

تۆش دەعوەتبە. کاتێ چووینە ماڵ نانیان هێنا، نیسکیان هەبوو. وتی جارێ با ئەمە بخۆین جا مریشکیش دێنین. بە دەم خواردنەوە من مریشکم لە بیر چووەوە و بە تێر و تەسەلی نیسکمان خوارد. دوایی کە لە نیسك تێر بووین، بە دایکی وت: دایکە ئەو مریشکەش بێنن. منیش وتم: تازە تێر بووین، ئیتر چی بێنێت. دایکیشی نەیهێشت قسەکەی من تەواو بێت بە پەلە چوو مریشکێکی زیندووی هێنا و کاك وریا وتی: ئەها مریشکمان هەیە. شایانی باسە کە لە هەیواندا لیقی خواردنیان هەڵواسیبوو کە لە حەفتەدا تەنیا یەك رۆژ برنج و گۆشتیان هەبوو.

## قانع و خەستەخانەی سلێمانی

خاتووخەرامان ئیبراهیم عەزیز خێزانی مامۆستا محەممەد ساڵح کە پەرستارە لە شاری سنە، گێڕایەوە و فەرمووی:

یەکێك لە رۆژەکانی مانگی دووەمی (١٩٦٥) لە دەورەی پەرەستاری لە خەستەخانەی سلێمانی دەمخوێند. ساڵی دووەمی پەرستاری بووم، لە قاوشی[1] داخلی پیاوان کارئامووز بووم، مامۆستا قانع بە بۆنەی نەخۆشییەوە بەستەری بوو، دوای ئەوەی کە لە بەخش پەروەندەم بۆی دروستکرد و بۆم دەرکەوت کە مامۆستا

---

[1] ـ بەخش.

قانعە، بە راستی زۆر خۆشحاڵ بووم، چونکە من هەمیشە شیعرەکانیم دەخویندنەوە و لەبەرمبوون، بەڵام خۆیم نەدیبوو، منیش دوای ناسینی خزمەتی زۆرم کرد و بە جوانی حەب و دەرمانەکانیم دەدایە و پارمەتیمدەدا و دەستم دەخستە پشت سەری و دوای خواردنی حەب و دەرمانەکان اعلام حەیاتیم دەکرد و ئەویش زۆر سوپاسیدەکردم و شیعری بۆ دەخوێندم. لە بیرمە لە یەکێك لە رۆژەکان کە سەرۆکی خەستەخانە، کە خەڵکی میسر بوو، لەگەڵ چەند کەسێ لە بریکار و دەور و بەری هاتن بۆ سەردان و چاو پێکەوتنی. دوای بە خێر هاتن و رێز گرتن لە مامۆستا و تۆزێ قسەی خۆش و بە عەرەبییەکی پەتی وتی: «انتم عرب لماذا لا تتکلمون باللغة الفصحی؟»، ئەوانیش هیچ قسەیەکیان نەکرد. وەختێك کە لە خەستەخانە دەرچوو ماوەیەکی زۆری پێنەچوو ئەمری خوای کرد. روحی شاد بێت.

## قانع و مەلایەتی

دیسان کاك وریا گێڕایەوە و فەرمووی:

رەمەزان دەبێ. قانع فەقێ دەبێت و لە سەردەمی فەقێیەتیدا دەگەڕێ بۆ دێیەك کە بێ بە مەلای رەمەزانی ئەو دێیە و

شتێکی دەستکەوێ، سەرلێوە و شت و ئەمانەی بدەنێ. ڕۆژی جومعە دەبێ دەگاتە دێیەك، دەستوێژ دەگرێ و لە ڕیزی جەماعەتدا دادەنیشێ. مەلاکە خوتبە دەخوێنێتەوە باسەکا دەڵێ: لە بەهەشتدا هەنار هەیە بە قەد وشترێك دەبێ. باوکم دەنگناکا. دوای نوێژەکە دێنە دەرەوە، مەلا دەیباتەوە بۆ ماڵی خۆیان. کە دەچێتەوە بۆ ماڵ، بە مامۆستا دەڵێ: مامۆستا تەشبیهاتەکانت زۆر دوورن لە واقیع. دەڵێ: چۆن؟ دەڵێ: تۆ دەڵێی لە بەهەشتا هەنار هەیە بە قەد وشترێکە، هەنار بە وشتر ناچوێنرێ. وشتر ملێکی درێژ و چوار قاچی درێژ و دووگێکی بەرزی هەیە. هەنار بەم شێوە نییە. ئەگەر بتوتایە وەکو مەنجەڵێك، وەکو توێێك، یا شتێکی وا، دەگونجا. سەرەڕای ئەوە وشترێك دەوری ۲۵۰ کیلۆ و زیاتر، دەبێ مەعقوول نییە هەنارێك ۲۵۰ کیلۆ بێ، زەلامێك بیکاتەوە بیخوا. هەناری وا قونچکەکەی دەبێ بە تەور ببڕێتەوە. بە دەست ناکرێتەوە. ئەویش توورە دەبێ دەڵێ: ــ ئەو کتێبە بێنە ــ مامۆستاش دەڵێ: ئاخر مامۆستا ئەو کتێبە کە ئەمەی نووسیوە بۆ خەڵکی ۷۰۰، ۸۰۰ ساڵی لەمەوپێشی نووسیوە کە ئەو عەقڵییەتەی نەبووە. بەڵام ئێستا خەڵك عەقڵییەتێکی تری هەیە و پێویستە ئەو وتارانە بگۆڕدرێن. چونکە ئەو جۆرە شتانە نە خوا فەرموویەتی و نە پێغەمبەر (د.ع).

## قانع و پۆلیسی

**دوکتۆر عیززەدین مستەفا رەسووڵ گێڕایەوە و فەرمووی:**

ماوەیەك قانع موعەلیم دەبێ. دەریدەکەن، ئیتر ئیشی نابێ، رەنگە بیبەن بۆ عەسکەری. ئەو وەختە ئەو کەسە کە دەبرا بۆ عەسکەری، لە پێشدا دەچوو دەبوو بە پۆلیس. پۆلیس مەعاشی زیاتر بوو، قانعیش دەچێ دەبێ بە پۆلیس، چونکە خوێندەوار بوو دەینێرن بۆ بەغدا دەورەیەك ببینێ. رەنگبوو دەربچێ ببێ بە قومیسێر. قانع کە دەچێ کابرایەك دێ. خوێندن لە ئەلف و بێوە دەست پێدەکا. ئەلف، بێ، تێ، سین، جیم تا دەگاتە لام ئەلفەلا. ئەویش دەست هەڵدەبڕێ دەڵێ: مامۆستا ئەوە ئێمە ئەلفمان خوێند ئەلف، بێ، تێ، لامیشمان خوێند. ئەم «لا»یە چییە؟ کابرای موعەلیم نایزانێ دەڵێ: «وەڵلا ئەوە لام ئەلفەلایە» دەڵێ: «ئەوە لامیشە و ئەلفیشە. لامەکەی تر ئەلفی بخەیتە سەر، هەر دەبێ بە مە. بۆچی کراوە بە حەرفێك؟» دەڵێ: «تۆ دیارە شەیتانی و لێی دەزانی پێم بڵێ» دەڵێ: «ئەوەیان هەمزەیە، ئەمەیان ئەلفە مەددی تێدایە. بۆیە خراوەتە سەر لامەکە بەلامەوە زیاتر دێت. هەمزەکە جیایە و ئەلف جیایە.» دەڵێ: «تۆ چیت؟»

دەڵێ: «من پۆلیسی ئیجباریم[1]» دەڵێ: «یانێ چی؟» دەڵێ: «من فلان مسلمم لە سەر بووە و وابووە و وابووە ناچار خۆم کردووە بە پۆلیس.» دەڵێ: «دەباشە شەرتە من نەجاتت بدەم.» و نەجاتیدەدا.

## قانع و دەهۆڵ و زوڕنا

**کاک ئەیوب محەممەدزادە گێڕایەوە و فەرمووی:**

هاوین بوو، لە لای دایرەی کشتوکاڵ لە مەریوان، بۆ ئیشێك چووین بۆ دێی سێف. خەڵکی دێ هەموو لە دەشت و دەر بوون. دەنگی ساز و دەهۆڵ دەهات، ئێمە پێمان وابوو شایی و زەماوەندە، چووین بە دەنگی ساز و دەهۆڵەوە، کە دیمان مامۆستا لە ناو میحرابی مزگەوتەکە دانیشتووە دەستی ناوەتە ژێر چەناگەی، چووەتە ناو فکر و هێندە دەنگی ساز و دەهۆڵەکە کاری کردووەتە سەری کە ئاگای لە ڕۆیشتنی ئێمە نەبوو، تەنیا هەر مامۆستا بوو، کەسیتری لێنەبوو. دانیشتین تا سازەکە تەواو بوو، چوومە خزمەتی مامۆستاو عەرزمکرد: قوربان چۆن ئیجازەت داوە لە ناو مزگەوتدا ساز و دەهۆڵ لێدەن؟

---

[1]ـ عەسکەری ئیجباری و عەسکەری ئیختیاری هەبوو. عەسکەری ئیجباری کە لەبوو بە زۆر خزمەتیکا. وەکە دەورەی ڕەزازشا. عەسکەری ئیختیاری خۆیان لەچوون. مەعاشیان تۆزێک زیاتر بوو. بەڵام پۆلیس کە بۆ خۆی دەبوو بە پۆلیس.

فەرمووی: ئەمە کەلەپووری ئێمەیە و زۆر پیرۆزە، وەکو ئەو مزگەوتە پێویست و موقەددەسە. دەبێ ڕێزی بۆ دانێین و نەهێڵین بفەوتێ. پاشان عەرزمکرد: قوربان تۆ ملت باریکە و ڕەشق و جامانەت تێکەڵکردووە، بۆ سەرت قورس نییە؟ فەرمووی: جامانەکەم هی سۆرانە و ڕەشتیەکە هی گۆران، تێکەڵمکردوون، دەبێ سۆران و گۆران وەك جامانە و ڕەشتیەکەی من بە یەکدا بئالێن و لە یەك جیا نەبنەوە.

## قانع و کەپری ٢٠٠ کۆڵەکەیی

حاجی حەمە عەلی (لامەرکەزی) گێڕایەوە فەرمووی:

خوالێخۆشبوو «شێخ قادری شێخ کەریم» لە «راوگان» کەپرێ دەبەستێ لە سەر (٣٠٠) کۆڵەکە، زۆر کەس بانگدەکا بۆ دەعوەتێك، یەکێ لەوانە مامۆستا قانع دەبێ، کە دێتە کەپرەکە و تماشای بەر بڵاوی و جوانی کەپرەکە دەکا و پاڵدەدا بە کۆڵەکەیەکەوە. شێخ دەچێ بۆ لای و دەڵێ: قانع بۆ خاتری خوا وازم لێ بێنە. ئەویش دەفەرمێ: زۆر چاکە بەڵام ئەم هەموو مەسرەفە ئەگەر بتاردبایە بۆ خەڵکی هەژاری ئەم دێیانە چاکتر نەبوو؟ ئەویش دەفەرمێ: چاکتر بوو، بەڵام تۆ واز بێنە. مامۆستا

پارچە شیعرێك دەنووسیّ کە بە داخەوە لە بەر پیری لە بیرم چووەتەوە.

## قانع و سۆفی و دەروێش

مامۆستا لەگەڵ خەڵکی سادە و ساکاردا کە پێیان دەوتن سۆفی و دەروێش و زۆر لە خوا ترس و کردەوە چاکبوون بە دڵێکی ئاوەڵاوە دەژیان. نە پێی دەوتن کافر و نە بە خراپی دەزانین و بۆ تێگەیاندنیان لەو شتانە کە بە ناوی دینەوە هاتوونەتە ئاراوە و دژی بەرژەوەندی هەژاران بوون زۆر بە ئارامی خەریکبوو. لە کاتێکدا لە دێی «کاڵ»[1] بوو دەڵێك دەدڕێت و دەڵێن شەهید بوو. مامۆستا بە دەفژەنەکە دەفەرموێ: تۆ خەلیفەی، یا دێوانە؟ دەڵێ: دێوانە. دەڵێ: دە باشە موسڵمانیشی. دەڵێ: بەڵێ. دەڵێ: دەی تۆ ئەو دەفەت دڕاند و کافر نیت. چونکە کەسیّ شەهید بکرێت دەبیّ کافر شەهیدیکردبێ. جا بۆ خەڵکی شێدەکاتەوە پلە و پایەی شەهید چییە و ئەمجا کیّ شەهیدە و پاشان دەڵیّ ئەو دەفە پێستی بزنە. بدڕیّ، یا نەدڕیّ خێر و شەڕی بۆ دین نییە.

---

١ـ کاڵ دێیەکی خاجیلانەیە لە بەینی کەلی سەمر و ڕیخەڵاندا، ٨٠ ماڵە و سەر بە ناوچەی مەریوانە.

## قانع و دایرەی تەموین

ئوسا ئەحمەدی خەیات (لە هەڵەبجە) گێڕایەوە و فەرمووی:

لە خوار قەیسەریەکەی حامی بەگەوە قەیسەریەك هەبوو، کرابوو بە دایرەی (تەموین)، لە لایەن حکومەتەوە جۆرەکی کۆنی ئەسپێ تێدراوی تێدا دابەشدەکرا. مامۆستا کرابوو بە کاتب لەو دایرەیەدا، چونکە ژن و مندالەکەی نەهێنا بوو، بە شەوان لە مالی (حلمی) دەنووست. منیش هاتوچۆی مالی حلمیم دەکرد و بەم بۆنەیەوە لەگەلْ مامۆستادا دۆستایەتیم هەبوو. رۆژێك چوومە خزمەتی، مێزێك لە بەر دەمیا دابوو، لە پشتی مێزەکەوە دانیشتبوو کاغەزێکی بەدەستەوە بوو فەرمووی: ئەم کاغەزە شیعرێکم لە سەر نووسیوە، ها بیدەم بە تۆ. منیش وتم: مـن خوێندەوار نیم، فەرمووی: بیدە بە کەسێکی خوێندەوار با بیخوێنێتەوە بۆتو لە بەریکە. منیش دام بە کاکم، خوێندەوار بوو، شیعرەکەی بۆ خوێندمەوە.

## قانع و دیواخان

بەرێز کاك شێخ مەحموود برای (حلمی) گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان لە کەولێس کابرایەکی سوار بە جلوبەرگێکی جوان و رێکوپێك دێ و لە مامۆستا دەپرسێ، دەڵێن لەو ئاشەدا ئاشەوانە. ئەویش دەڕوا بۆ لای، کە چاوی پێ دەکەوێ هەموو گیانی تۆزاوییە دەڵێ: تۆ قانعی؟ دەڵێ: بەڵێ. دەڵێ: مـن لە

کەرکووکەوە بۆ لای تۆ ھاتووم. قانع دەڵێ: بەخێر بێت، ئێستە ئاشەکە دەوەستێنم و دەچینەوە بۆ دیوەخان. ئاش دەوەستێنێ، دەچنەوە بۆ ماڵ کابرا تەماشا دەکا چوار دیوارییەك بە کەڵەك ھەڵچنراوە و لەوحێ تەنەکەی بە سەردا دراوە، لە جیاتی دەرگا دەر مەنجەڵیەکی پێوەیە. لیستەی خواردنی حەفتەی بە دەر مەنجەڵەکەدا ھەڵواسیووە، تماشا دەکا نانی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە (٢) ھێلکە و نانێکە. کە کابرا تماشا دەکا دەڵێ: ئەمەیە دیوەخان و ئەمەیە خواردنی نیوەڕۆ؟ مامۆستاش دەڵێ: کاکە تۆ بۆ ناڕەحەتی؟ من دەبێ ناڕەحەتبم. یەکێ لە ھێلکەکان دەبێ بدەم بە تۆ.

## قانع و ئەفەندی

مامۆستا ھەر کات شتێکی ناشیرینی دیبێ، خیرا بۆ پیشاندانی ئەو ناشیرینییە بە خەڵك، ھاواری لێ بەرز بووەتەوە. ئەفەندی بە لەبەر کردنی چاکەت و پانتۆڵ بە سەر خەڵکی ھەژاردا فیزیانکردووە و جلە کوردییەکانیان لە بیر چوەتەوە، تەنانەت زۆریان داب و نەریتی عەرەبەکانیان گرتووە، یا وەکو غەربییەکان خۆیان نیشانداوە. ناشوکری نەبێ ئەوەتە ئێستاش بە جلی غەیرە کوردییەوە فیز دەکرێ و پێی دەڵێن جلی (ڕەسمی) و تەنانەت ئەگەر فلیمێك دروستبکرێت جلی کوردی دەکرێتە بەر چایچی و دەرگاوان و نۆکەر عەرەبانەچی و ... بە

داخەوە بە ناوی سەقافەت و ڕۆشنبیرییەوە داب و نەریتە ڕەسەنەکان لە بیر بچنەوە و کەسێك نیە هاوارێکی لێ بەرز بێتەوە. ئەوەتە لە کوردستانی ئەودیودا حکوومەتێکی کوردی چەند ساڵە لە سەر دەورە. کە زۆر بە داخەوە بەرنامەیەکی ئەوتۆی بۆ هێشتنەوەی فەرهەنگی کورد نییە، کچ و کوڕ شانازی بە جلوبەرگی جۆراوجۆر و تەسك و تروسك و ناشیرینی ڕۆژئاواوە دەکەن، پاش ماوەیەکیتر زمانەکەشمان لێ نامۆ دەبێت، تەنانەت لە سایەی دەسەڵاتدارە کوردەکاندا ناوی کوردیش نامێنن، ژیانی کوردانە عەیب دەبێ، چێشتی کوردی عەیب دەبێ و ... هتد. دەبوایە ئەم دەسەڵاتدارانە بیریان کردایەتەوە بۆ بەدەستهێنانی ئازادی بۆ هێشتنەوەی ژیار و کەلەپوور و ئەو هەموو بایەخە کە کورد بوویەتی و هەیەتی، سەنعەت و زانست و تەجروبە فێر ببن. جا سەیرتر لەوە ئەوەیە کەسێ هاوار بەرز کاتەوە کاکە ئێمە لە هەموو بوارێکدا دەوڵەمەندین. ئێمە پێشینەمان پرشنگدارە، ئێمە ئەمە بووین و ئەوە بووین، خێرا دەڵێن بیری کۆنە، کۆنە پەرستییە. لە دڵسۆزان داواکارم ئەو خێر و بەرەکەتەی کە بە بۆنەی زانستەوە دنیای گرتووەتەوە، ئێمەش فێری ئەو زانستە بین، ئێمە خۆمان لەگەڵ بایەخەکاندا بگونجێنین نەك لەگەڵ بێبایەخیدا. کاك شێخ مەحموود گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان قانع پانتۆڵێك لە پێدەکاو لە سەر کەوشەکانی کە پێیان دەگوت جاش کەوشو لە لاستیك دروستکرابوو، بە

تەماشــــیر نووســــیبووی قــــانع (ئەفــەندی). ئەفەندیــــەکان زۆریــــان پێناخۆشــبوو، شــکاتیان لێکــرد، کــە گوایــا ســووکایەتی بــە ئەفــەندی کــردووە. بردیــان بــۆ لای مودیــر ناحیــە، بــەڵام مودیــر ناحیــە دەیناسی و زۆر ڕێزی لێگرت و بەریدا.

## قانع و پینەچی

ئوسا ئەحمەدی خەیات گێڕایەوە و فەرمووی:

کەوشــەکانی دڕابــوون. چــوو بــۆ لای پینەچــی، بــۆی پینــە بکــا. پینەچییەکە وتی: مامۆستا ببوورە بە خوا پینەم نیـە بیدەم لە پێڵاوەکانت، با ئینشەڵڵا بنێرم پینەم بۆ بێنن، جـا بـە سـەر چـاو بـۆت پینـە دەکـەم. مامۆستاش فەرمووی: کاکە من پینـەم پێیـە. تۆشـەبەرەکەی کـردەوە و دوو سێ کولێرەی گاڵێ زۆر ڕەقی تێدا بوون، وتی: ئەم کولێرانە بکـە بە پینەی کەوشەکان، ئەما چەند مەحکەمن. پینەچی وتـی: جـا مامۆسـتا ئەمە نانە و چۆن دەبێ بە پینە؟ وتی: کاکە هەقت نەبێ، چونکە خوا ئـەم کولێرە ڕەقانەی کردووە بە خواردنی مـن، منـیش دەیانکـەم بـە پینـەی کەوشی دڕاوم.

## قانع و نان و ترێ

دیسان کاکە شێخ مەحموود گێڕایەوە و فەرمووی:

زۆر جار نـیوەڕۆ دەهاتـە مـاڵی حیـلمی بـرام. ڕۆژێکیـان لـە بـەر چـاخانەی بـاقیدا جـامێکی دانـابوو هێشـوویەك تـرێی تێـابوو، دوو

نانیشی خستبووە سەر رانی، لەگەڵ یەکێ لە کوڕەکانی خەریکبوون دەیانخوارد. منیش لێیم پرسی: مامۆستا ئەوە چییە؟ فەرمووی: کاکە مەگەر خوا نەیفەرمووە:

دروستتانتەکەم بۆ سەیر و گۆ بەن

بـۆ خـزمەتکاریی پیاوی دەوڵەمەن

## قانع و خواحافیزی

حاجی ئەنوەری تووتەقاچی گێڕایەوە و فەرمووی:

لە تووتەقاچ هاتە ماڵمان و فەرمووی: پێم وایە ئەم نەخۆشییەم نەخۆشی دواییی، زۆرتان زەحمەتکێشاوە بۆم، هاتم خواحافیزی یەکجاریتان لێبکەم و دەمەوێ ئەم دەوروبەرە بگەڕێم تا کوێ بگەم لە هەمووان خواحافیزی بکەم. ئێوارە چووین بۆ مزگەوت خەڵکەکە زۆریان پێ خۆشبوو، هەموو هاتن بە پیریەوە فەرمووی: براکانم لووتم رۆشن، خۆ ناشوکری نەبێ چاوم نابینێ، ئەو شەوە دانیشت و بەیانی چوو بۆ ماڵی شێخ مەحوودی قەڵبەزە، لەوێ نەخۆشییەکەی زۆرتر بوو. سواری هێستریکیان کرد و بردیانەوە. شەش رۆژی پێنەچوو خەبەر هات کۆچی دوایی کردووە.

## قانع و نەداری

دیسان حاجی ئەنوەری تووتەقاچی گێڕایەوە و فەرمووی:

مانگایەکی هێنا بۆ ماڵی ئێمە. فەرمووی: ئەم مانگایەم بۆ بەخێو کەن. ئەو کاتە ماڵی لە «دەرەمیانە» بوو، ئێمەش مانگاکەمان بەخێو کرد و هەر نەهات بۆی، پێم وابوو لە ماوەی ئەم سێ ساڵەدا جێگا و ڕێگایەکی وای نەبوو بیباتەوە تا خۆی بە خێویکا.

## قانع و وشکەساڵی

دیسان حاجی ئەنوەری تووتەقاچی گێڕایەوە و فەرمووی:

ساڵێکیان بێبارانی بوو. ئاشەکەی نووستبوو. لێیان پرسی: مامۆستا حاڵت چۆنە؟ فەرمووی:

بــاران نــابــارێ ئــاشــم ناگەڕێ

کــوتەك لە برسا وەك سەگ ئەوەڕێ

ئەمــسە لــە جــاران زیاتر دێوە

حــاکە لــە ترسا حــاڵی پــەشێوە

## قانع و نانی نیوەڕۆ

دیسان حاجی ئەنوەری تووتەقاچی گێڕایەوە و فەرمووی:

دەور و بەری ساڵی (١٩٥٨) بوو. لەگەڵ بورهانی کوڕیدا لێرەدا خەریکبوو هۆدەیەکی دەکردەوە. من و خواڵێخۆشبوو

حاجی تایەربەگی برام بە بەردەمیاندا دەهاتین، ماندوو نەبوومان لێکردن، کاکەم فەرمووی: مامۆستا تۆ ئێستا دەبوایە زۆر خۆشحاڵ بوویتایە. ئەم قیرمقیرە و ئەم بزۆی برووخێتە زۆر پێخۆشبوو، ئەمە ویستی تۆ بوو. مامۆستا فەرمووی: بۆچی تۆ پێت وایە من شیوعیم؟ نا، کاکە من شیوعی نیم. شیوعی دەڵێ قانع هی منە، پارتی دەڵێ قانع هی منە، هەروەها حزبەکانیتریش، دەڵێن هی منە. فەرمووی: بێنەو پێکەوە نانی نیوەڕۆ بخۆین، جا فەرمووی: یەکێ ئاو بێنێ و یەکێ پووش بێنێ و یەکێ ئاگر بکاتەوە، منیش تەماتەکە دەجنم. مامۆستا عادەتی وابوو ئیشی بە خەڵك نەدەکرد و خۆی دانیشێت و ئاوا تەماتەکەمان لێناو و پێکەوە نانی نیوەڕۆمان خوارد.

## قانع و خوێنەرێکی شیعرەکانی

**کوڕی حاجی تایەر بەگ لە زمانی مامەیەوە گێڕایەوە و فەرمووی:**

جارێکیان لەگەڵ من هات بۆ سلێمانی بۆ ئیشێکی من، زۆر رێزیان لێگرت و چووین بۆ گەڕان. چاومان کەوت بەگەنجێك، کتێبی «گوڵاڵەی مەریوان»ی بە دەستەوە بوو دەیخوێندەوە، زۆر بە تاسەوە تەماشایدەکرد. من و قانعیش بە سەر سەریەوە وەستا بووین. من پرسیارمکرد: قانعت دیوە؟ وتی: نەوەڵا خۆزگە دەمدی! منیش وتم: ئەگەر بیبینی چی دەکەی؟ وتی: رەنگە لە

خۆشیدا بمرم. وتی: تۆزی سەرمان نایە سەری و پاشان وتم ئەوەی لەسەرسەرت وەستاوە قانعە. سەری بەرز کردەوە وتی: تۆ قانعی؟ مامۆستاش فەرمووی: بەڵێ. وتی: بریا نەمدیبایە. مامۆستا خێرا فەرمووی: جا کاکە تۆ دەتویست چاوت بە چ پەیکەرێك بکەوتایە؟ جا کوڕەکە سەری داخست و مامۆستا زۆر لوتفی لەگەڵ کرد.

## قانع و لیستی خواردن

دیسان حاجی ئەنومەرەی تووتەقاچی گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا لە کاتێکدا ماڵی لە کەولۆس بوو لە ماڵە شڕ و ناخۆشەکەیدا جەدوەلێکی خواردنی رۆژانەی لە سەر دەرگاکە داکوتابوو. بەم جۆرە: شەممە: ساوار. یەکشەممە: دۆینە. دووشەممە: ترخێنە. سێشەممە: شۆربا. چوارشەممە: تۆڵەکە[1]. پێنجشەممە: دۆینە. جومعە: ئەگەر بوو گۆشت، نیوارەکەشی تۆڵەکە، ئەگەر شێخ مەحوودی ئەمر میوانم بێت دەبێ تۆڵەکە بخوات و هەر کەسیش لە رۆژی گۆشتەکەدا هات ئەوە شانسی خۆیەتی.

---

١ــ گیایەکی خواردنە کە زیاتر لە کوردستانی عێراقدا هەیە و لە کاتی شینبوونیدا لە سەرەتای وەرزی بەهاردا دەیکوڵێنن و دەیهاڕن، کەڵای پانیشی دەکەنە دۆڵمە.

## قانع و پۆلە تەیارە

**دیسان حاجی ئەنوەرەی تووتەقاچی گێڕایەوە و فەرمووی:**

لە ساڵی (١٩٤٨)دا. هاتە ماڵمان لە تووتەقاچ. دانیشتین و کاکەم، حاجی تایەربەگ، پرسیاریکرد: مامۆستا دنیا لە چیدایە؟ ــ عەبدوللە بەگی حسێن بەگ ئامۆزای باوکمبوو، خاوەنی مڵکی دەور و بەری هەڵەبجە بوو ــ مامۆستاش فەرمووی: ئەوەڵڵا من ئەمەم بە دڵ نییە پێم خۆشە شەڕێکی وا رووبدا کە پۆلە تەیارە وکو ریشۆڵە بەم ناوەدا بێت و بچێ. دەوڵەمەند و فەقیر وەك یەك لێی بقەومێ. جا منیش پەلی ئەمنە و کوتەك و خەنجەر بگرم، بڕێ کولێرەی ئاشەکەی خۆمان لەگەڵ خۆم بەرم و بڵێم دەسق عەبەی حسێن بەگ....

## قانع و ماڵانەی مەلایی

**حاجی قادربەگ گێڕایەوە فەرمووی:**

دوو پیاوم لابوون کە پێیان دەوتن دەروێش بایز و ئەوڕانی، جا دەروێش بایز و ئەوڕانی ماڵانەی مەلایی مامۆستایان نەدابوو.

رۆژێك من و مامۆستا و کاکەم حەمەخان بەگ دانیشتبووین، باسی ژیانی مامۆستا و مەلایانە کرا. فەرمووی:

مــن کــە عادەتمــە برسی و بێنــانی
ســەری بــایزید بــە قنــگ نــەوڕانی

پێم وایە ئەم شیعرە لەو شیعرە فارسی‌یە وەرگیراوە کە دەڵێ:

چــون راضي شــدم مــن بــە نــان جو
خــاقــــان برود ســـرش بــــە خسرو

## قانع و کووپەی خاڵی

دیسان حاجی قادریەک گێڕایەوە فەرمووی:

ساڵێك پێش جمهوری، ساڵی لە نەوێ بوو. فەرمانی گرتنی بۆ دەرچــوو بــوو، ئێمــە شــاردبوومانەوە. زۆرمــان خۆشدەویســت. جمهوری هاتە بەرەوە، فەرمووی: کێچ زۆری بۆم هێناوە، با بچم بۆ قەڵبەزە. ئێمەش عەرزمانکرد: هەموو جێگایەك ماڵی خۆتە! رۆیشــت بــۆ قەڵبــەزە و دەســتیکرد بــە ماڵکردنــەوە. مــن و برادەرێکم رۆژێکیان چووینە خزمەتی و بورهانی کوڕی و لەگەڵ کرێکارێکدا خەریکبوون «خەنەك»[1]ی ماڵیان دەدایەوە. ئێمەش لە ماڵی «حاجی شێخ مەحموودی قەڵبەزە» بووین، لە خزمەتی مامۆستادا، بورهــان هــات، وتــی: بــاوەر، لــە خەنەکەکــەدا کووپەیەکمان دۆزیوەتەوە. رەنگــە پــڕ بــێ لــە پــارە، ئێمــەش چــووین و رووبــە خەنەکەکــە دانیشــتین. ئــەوان دەســتیانکرد بــە خــاڵیکردنی

---

ا- پەیکەنی، لە وشەی - خەلەمق -ەوە هاتووە، کە وشەیەکی عەرەبییە.

دەورروبـــەری کوویەکـــە، تـــا دەریانهێنـــا، کـــە تماشـــامانکرد تـــۆزێ خۆڵەکـــە و خـــەڵتووزی تێدایـــە. مامۆســـتا ســـەری بـــەرز کـــردەوە و وتی: خوایا نەدەبوو پڕ بێ لە لیرە و شتی وا.

## قانع و خۆشاردنەوە

**دیسان حاجی قادر بەگ گێڕایەوە و فەرمووی:**

دوو ســێ مــانگ پێش جمهــووری، مامۆســتا لــە نــەوێ لــە مــاڵی ئێمــە بــوو رۆژێــك عیــزەت بــەگی بــرام چــوو بــوو بــۆ خورمــاڵ لــە لای ئاوەکــەی «ریشــێن»[1] تووشــی مــەئموور مەرکــەزو چــەند پۆلیســێك بووبــوو. مــەئموور مەرکــەز پرســیبووی: قــانع لەوێیــە؟ عیزەت بەگی بـرام وتـبووی: نـەخێر، لـەوێ نیـە. مـەئموور مەرکـەز بردبوویـە لاڕێ و وتـبووی: هـاتووین بیگـرین، تـۆ بگـەڕێوە، ئەگـەر کتێــب و شــتی وای هەیــە، بیشــارنەوە و خۆشــی حەشــار بــدەن بــا نـەیگرین. عیـزەت بـەگی بـرام خێـرا گەڕایـەوە و مەسـەلەکەی بـە مامۆســتا وت. پاشــان بــە مامۆســتای وت خــۆت بچــۆ بــۆ مــاڵی حەمەسەعی بـەگی برازامـان لـەو سـەر، بـۆ خـۆت دانیشـە و خـاتوو ئەمنە با لێرە بێ. بورهـانیش لـە مـاڵ نـەبوو، هەرچـی کتێبـی هـەبوو شــاردمانەوە و کاتــێ مــەئمووری مەرکــەز گەیشــتە بــەرەوە چــوو بــە دەمیەوە و بردی بۆ مـاڵی مامۆسـتا قـانع. وتـی: ئەمـە خـاتوو ئەمنـە و

---

[1] ـ گوند و سەیرانگایەکە لە بناری شارەزوور.

مامۆستاش لە ماڵ نییە سێ چوار رۆژە دیار نییە. وتی: دەبێ من بە زبانی ئێوەوە وەڵامی حاکمی هەڵەبجە و دەستووری سلێمان بدەمەوە. جا دوای رۆیشتنی مەئموور مەرکەز، مامۆستا گەڕایەوە، لای هەموو کەس خۆشەویستبوو، هەموو کەس حازر بوو فیداکاری بۆ بکات.

## قانع و لابار

حاجی سالاری کوڕی حاجی نامیق گێڕایەوە فەرمووی:

مامۆستا ماڵی لە سەیدسادق بوو. رۆژێکیان مامۆستا هات بۆ لای غەریب بابل کە پیاوی حەمەسەعی بەگ بوو، وتی: غەریب با بڕۆین بۆ لای شێخ عەبدولکەریم، هاتووە و لە ماڵی حاجی حەمە کەریم میوانە. بەڵام دەبێ بە لابار لەگەڵم بێت. پێکەوە چوون بۆ ئەو بەری پردەکە بۆ ماڵی حاجی حەمەکەریم. کە رۆیشتنە لای شێخ زۆر رێزی لە مامۆستا گرت. زۆری پێخۆشبوو. کە چوو بۆ لای، وتی بە دەروێشەکانی، هۆدەکە چۆڵکەن و لەگەڵ مامۆستا کەوتنە گفتوگۆ. قسەی زۆریان کرد. وەختی خواحافیزی، شێخ دەستیکرد بە باوڵەکەیدا فەرمووی: ئەم قاتە لەندەنییە لە خزمەتتدا بێت. وتی: نامەوێ. شێخ زۆر هەوڵیدا کە هۆی نەویستنەکەی بزانێ. پاشان مامۆستا فەرمووی: ئەم قاتە کراسی دەوێ، فەقیانەی دەوێ،

کەوشی دەوێ، جامانەی تازەی دەوێ، ئەگینا پێم دەڵێن تماشاکە ئەم کابرایە بەو قاتە لەندەنییەوە چۆن پێکەوش و کراس دەگەڕێ. شێخ فەرمووی: دە باشە ئەمەش (٣٠) دینار خۆت ئەوانیش تەرتیبکە. شێخ زۆر تکایکرد. مامۆستا وەری گرت و فەرمووی: ئاخر من رەفیقم هەیە. شێخ فوتوویەکی جوانی دا بە غەریب. مامۆستا فەرمووی: بڕیار بوو تۆ بە لاهار لەگەڵم بیت.ئێستەفوتووەکە،سەرەکەی بۆمن و ژێرەکەی بۆ تۆ.

## قانع و ماڵکردنەوە

دیسان حاجی سالار حاجی نامیق گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا لە سەی سادق لە (زەوی)ی باوکم دا خەریکبوو خانووی دروستدەکرد. لەگەڵ باوکم چووین بۆ سەر زەوینەکە، باوکم فەرمووی: ئەم زەوییە هی منە، بۆچی بێ پرس و کڕین دەیکەیتەوە؟ مامۆستا فەرمووی: دابەزە ئێستە قسەت بۆ دەکەم. باوکم دابەزی و مامۆستا فەرمووی: دوانزەپەنجایی بدە با بیدەم بەو کرێکارانە، چاکبوو خوا ناردیی، نەمدەزانی چی بکەم بۆ پارەی ئەم کرێکارانە. باوکم (١٢) پەنجایی دا و پاشان فەرمووی: منیش ئەوەندەم دەکەوێ. باوکم زۆری پێخۆشبوو.

## قانع و چای بە سێلك

دیسان حاجی سالار گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا ئاشەوان بوو لە ئاشەکەی سەرپاوەرە. لەگەڵ شێخ سمایلی کەولۆسدا پێکەوە بوون. دوو بار گەنمان برد بیهاڕین. فەرمووی: بارەکانتان بخەن و دوو رۆژی تر بێنەوە بۆ ئاردەکە. بانگیکرد شێخ سێلك چای بێنە بیکە ئەو قۆرییە بۆیان لە کاتێکدا تەنیا بۆ ژەمێکیش چاییمان نەبووە.

## قانع و چاپی کتێبەکانی

دیسان حاجی سالار گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان شێخ عەبدولی سەرکان و ئەحمەدبەگی سەردۆش لە ماڵمان بوون. مامۆستا قسە و باسی زۆری کرد. من چووم ئاوی دەستوێژم بۆ هێنا و دەستنوێژی گرت و فەرمووی: خۆزگە نەمردمایە تا ئەو کتێبانەم هەموو چاپکردنایە، مێشکی هەموو روڵە کوردەکان و لێومیشم پڕ بکردایە.

## قانع و یەك ساڵی تر

کاك جەلالی کوڕی حاجی تایەربەگی تووتەقاچ لە زمانی باوکیەوە گێڕایەوە و فەرمووی:

بە ئەسپ و دەمانچە و برنەو و ستارخانی و بە سواری ئەسپێکەوە لە سەر ملەکەی کەولۆس

توورشبووم، جلێکی شڕ و شوڵی لە بەر بوو، کتێبی بە دەستەوە بوو، وتم: دەڵێی زبان و فیکرم ئەوەیە و وا دەکەنم، ئێستە ئەوەتە من دەربەدەگم و دەوڵەمەند، ئابەم وەزعەوە کە ئەمبینی ئادەی چیت پێدەکرێ؟ وتی: تایەر گیان دابەزە با دانیشین و دەستمانکرد بە قسە کردن. فەرمووی: گوێگرە، یەك ساڵی ترم لێ بخایەنێ جا تێدەگەی من چی دەڵێم. جا ئەو ساڵە ساڵی ۱۹۵۷ بوو کە لە (۱۹۵۸)دا ئەو بەزمە هات بە سەردا. جا مامۆستا دەیزانی دنیا چەندە لە ئاڵوگۆڕدایە.

## قانع و فێڵ لە فرۆشتندا

حاجی عەلی توتنفرۆش گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا تەماتەی بۆ فرۆش کڕیبوو، من بۆم دەفرۆشت. ئەو ڕۆژە نەفرۆشرا و بۆ بەیانی دامنابوو بۆ فرۆش. ژنێك هات، پرسی: ئەم تەماتە تازەیە؟ وتم بەڵێ. مامۆستا خێرا وتی: درۆ دەکا هی دوێنێیە. منیش وتم: بۆ وا دەڵێی؟ ئاخر نافرۆشرێ. فەرمووی: خوا خۆی رزقم ئادات و دەتەوێ بە درۆ و بە خەڵك خەڵەتاندن رزقم بێ، من هەرگیز بۆ پارە درۆ ناکەم و خەڵك ناخەڵەتێنم.

## قانع و دوارۆژ

**دیسان حاجی عەلی گێڕایەوە و فەرمووی:**

جارێکیان لە خزمەتی مامۆستادا بووم، فەرمووی: عەلی کەچەڵ چی لەم وەزعە دەزانی؟ منیش عەرزمکرد: قوربان هیچ. فەرمووی: عەلە ڕۆژێك دەبێ لەم دەشتی شارەزوورەدا تەیارە دەنیشێتەوە، خەڵك سوار دەکا بۆ ئەمریکا. ئیتر نازانم ئێمە دەمێنین، یا نە.

## قانع و جمهووری عراق

**کاك یونسی بانی بنۆکی گێڕایەوە و فەرمووی:**

ماڵی لە بانیبنۆك بوو، ڕۆژێ فەرمووی: با بچین بۆ سەیران و گەڕان. چووین بۆ پشت دێی بانیبنۆك. لە جێگایەکدا کە پێی دەڵێن «کانی دارمازوو» لەوێ دانیشتین. مامۆستا فەرمووی: ئەم جمهوریە چۆن دێتە بەر چاوت؟ چی لێ دەزانی؟ منیش عەرزمکرد: باشە، حوکمی شایەتی لابردووە، کورد چاکدەبێ. فەرمووی: ئەگەر تۆ بوویتە ئەندازیار و شاخی سوورێنت کونکرد، ئەم جمهوریەش بۆ کورد چاکدەبێ و مافی دەداتێ. کاکە ئەم جمهوریە خۆی بە دەست چەوسێنەرانەوەیە، چەوسێنەر چۆن بۆ چەوساوە چاکدەبێ.

## قانع و دوو نان

دیسان حاجی عەلی تووتنفرۆش گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا جارێکیان لە «کەولۆس»ەوە دەیەوێ بچێ بۆ «شانەدەری». لە ڕێگەدا تووشی ژنێك دەبێ بۆ ناو ران دەچێ. دەڵێ: دادە نانت پێ نییە، برسیمە؟ دەڵێ: با. کۆڵەکەی دەکاتەوە دوو نانی پێدەبێ دەیدا بە مامۆستا. مامۆستا نانەکە دەخوا. دەیەوێت لە ژنەکە خواحافیزی بکا، دەڵێ: ڕووی باوکی خۆت ڕەشبێ و بە قوزەڵقورتی خۆتبێ. دەڵێ: ئەوە چییە خاڵۆ؟ دەڵێ: ئێستە دەچیتە لای شوانەکە و دەڵێ: نانت پێیە؟ دەڵێ ئەوەڵا، ڕووی باوکی ئەو کابرایە ڕەش کە خواردی و بە قوزەڵقورتیبێ. من هەر لە ئێستەوە هەقی خۆمم کردەوە. ژنەکە دەڵێ: خاڵۆ تۆ مامۆستا قانع نیت؟

## قانع و داگیر کردنی زەوی

مامۆستا هێندە سەخی و خۆشەویستی خەڵکبووە هیچکەس لە ئاستی ئەودا خۆی بە خاوەنی هیچ نەزانیوە. شێخ قادر لە سەیسادق گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان لە سەفەر هاتمەوە کە تماشام کرد، مامۆستا لە زەویی مندا کە لە بەر ماڵەکەماندا بوو، خەریکە ماڵ دەکاتەوە.

کـە مـنی دی وتـی: قالـە، دەمـەوێ لێـرەدا مـاڵ بکەمـەوە. منـیش عەرزمکرد: زۆر جێگای شـانازییە بـۆ مـن کـە تـۆ بـەم زەویـنـەی مـن رازی بـی. داری زۆریشـمان هـەبوو. ماڵەکـەی کـردەوە. پـاش ماوەیەك بە جێیهێشت و رۆیشت.

## قانع و تۆمەت

**دیسان شێخ قادر گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆسـتا رقـی لـە زاڵـم بـوو، لەوانـەش کـە دۆسـتی زاڵـم بوایـەن. دەیـوت لـە زەویـی خـوادا کـە جووتیارەکـان بـە رەنجـی شـانیان ئاوەدانیانکردۆتـەوە دەبـێ بـۆ نـیوە بـدرێ بـە کسـێك کـە هـیچ رەنجـێکی نەکێشـاوە و ئـارەقی نەڕشـتووە. بـڕێ سـاویلکە و نـەزان لـە جیـاتی پشـتگرتن و ئافـەرین، دەیـانوت شـیووعییە. کەچـی قـانع جگـە لـە خزمـەتی گـەلی کورد و چەوساوەکانی شتێکی تری نەدەوت.

## قانع و پارێزگاری سلێمانی

**دیسان شێخ قادر گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆسـتا پـێی وتم بـا بـڕۆین بـۆ سـلێمانی. منـیش لـە خزمـەتیدا چـووم. چـووینە سـلێمانی و رۆیشـتین بـۆ لای پارێزگـار، چـووینە بـەر دەرگـا، مامۆسـتا جلـێکی شـڕ و جووتـێ پـێڵاوی لاسـتیکی لـە

پـادا بـوو، ئەفەندیـەك لـە بـەر دەرگـای ژووری پارێزگـاردا بـوو، مامۆستا پرسی: پارێزگـار لێرەیـە؟ وتـی: بـەڵێ. مامۆسـتاش وتـی: بـە یارمەتی. ویسـتی بچێتە ژوورەوە. ئەفـەندی وتـی: بـڕۆ خـاڵۆ، لاچـۆ تۆی چی و پارێزگـاری چـی! قـانع دەنگـی بـەرز کـردەوە وتـی: مـن هەر دەڵێم نابێ و بە کـار لای تـۆ نـاخۆم و نـاهێڵن، ئـەو هـەر دەڵـێ وەرە.

بـە دەنگـە بەرزەکـەی مامۆسـتا، پارێزگـار لـە دەرگـاوە سـەری کێشـایە دەرێ، بزانـێ ئـەم قـیڕە قـیڕە هـی کێـیە؟ کـە چـاوی بـە مامۆستا کەوت، خـێرا هـات بـە دەمیـەوەو لـە بەردەسـتەکەی تـووڕە بـوو. وتـی: هـەر ئێسـتا دەرتدەکـەم نـابێ لـە سـلێمانیشـدا دانیشـی. مامۆستاش بـە دەم قسـەکردنەوە فـەرمووی: بـەڵێ، جـا خـەڵك بڵێـن قـانع هێـندە دەسـەڵاتدار بـوو، خزمـەتکارێکی دەر کـرد!! وتـی بـە کابرا بـڕۆ چـوار چـا بێنـە.جـا پاشـان پێـت دەڵـێم چـی بکـە. کـابرا زوو رۆیشـت، چـوار چـای هێنـا و مامۆسـتا زۆری لێکـرد کـە خۆشـی دانیشـت لەگـەڵ پارێزگـاردا چـا بخواتـەوە. پاشـان لەگـەڵ پارێزگـار کەوتـە گفـتوگۆ و باسـی ژیـانی. قـانع. وتـی: لـە زووەوە خـەیاڵم هەیـە ئیشـێکت بـۆ بکـەم. ئێسـتە تـەگبیرێکی چـاکم بـۆ کـردووی، وەرە دەتخەمـە سـەر ئـیش. ئێسـتە عەریزەیـەك بنووسـە بـۆم، دەتکـەم بـە مودیـری شـارەوانی سـلێمانی و پـاش مـانگێك

عەزیزەیەك بنووسە، خانەنشینتدەکەم بە مووچەیەکی چاکەوە، هەتا ماوەی ژیانت مووچەکەشت زۆر زۆرە. ئیتر چیت دەوێ!! مامۆستاش فەرمووی: ئافەرین، جا ئەمە قسەی تۆیە؟ تۆ پێت وایە من هەرچیم وتووە درۆیە. ئەویش وتی: نەوەڵا بۆ درۆیە. مامۆستا فەرمووی: دە ئەگەر لەگەڵ جووتیار و کرێکار و وەرزێری کورددا درۆمکردبێ، چۆن من بە تاقی تەنیا لە ناو ئەواندا خۆم هەڵاوێرم[1]، گوزەرانی خۆم چاککەم و ئەوان هیچ. خۆم بەو موچەزۆرەوە ببم بە ئەفەندی. دەبێ جلی جوان و خانوو بەرەی خۆش و پێڵاوی چاك لەبێکەم، ئەوسا بە چەوساوەکان چی بڵێم؟ مەگەر بڵێم کاکە من گەیشتم بە نان و پارە. ئێوەش جەنابی پارێزگار خۆتان دەزانن هەرگیز من ئیشی وا ناکەم، ئەو هەزارانە جێناهێڵم. ئەگەر وا نەکەم و وەکو ئێستا نەژیم، لە بیرمدەچێتەوە چەوساوە زوڵم لێکراوەکان چۆن دەژین! مردنم زۆر چاکترە لەوەی کە وتەکانم لەگەڵ ژیانمدا یەك نەکەون. زۆر سوپاس، ئاشەوانییەکەم لە لا خۆشترە تا ژیانی تێر و تەسەلی، کە چەوساوەکان هەموو ژیانێکی وایان نەبێت دەتەوێ کەلیمەی قانع بکرێنێت کە هەرگیز نایکرێنم و بە قوربانی شوان و گاوانی کوردم.

١ـ جیا کەمەوە.

## قانع و میوانداری

ماموستا زۆر سەخی و دڵ ئاوەڵا بووە. هێندە حەزی لە میوانداری بووە. جارێك رێکنەکەوتووە میوانی دەستکەوتبێ و بە تەنیا نانی خواردبێ. مەلا عەبدوڵڵای سەی سادق گێڕایەوە و فەرمووی:

جارێکیان لە تەنیشت ماموستاوە دانیشتبووم، فەرمووی با بچینەوە بۆ ماڵی ئێمە، بردمیەوە. کاتێ گەیشتینە ماڵ بانگیکردە خێزانی: (سۆلی سلێمان) چیمان هەیە؟ ماموستاژنیش وتی: مەگەر خۆت لیستەی خواردنت هەڵنەواسیوە؟ کە تماشامانکرد نووسرا بوو چوارشەممە: پەتاتە. دانیشتین پەتاتەکەمان خوارد.

## قانع و پیرەژنێك

کاك حەمەی قادری ئیسماعیل خەڵکی سەرئاو گێڕایەوە و فەرمووی:

لەو کاتەدا کە لە کەولۆس بووە. پیرەژنێکی هاوسێیان هەبووە، ناوی....... بووە، هەموو شەوێ لە نیوە شەو بەولاوە، هەتا هێزی تێدا بووە دەستیکردووە بە ئەڵڵا ئەڵڵا. بەیانییەکیان قانع بانگیدەکا،...... دەڵێ: بەڵێ. دوبارە بانگدەکا..... دوبارە و سێ بارە و زۆر بانگدەکا..... وەرمز دەبێ و دەڵێ قوزەڵقورت. دەبڵێ، بزانم چیت دەوێ. کردبووی بە دارێکا بۆ قانع، قانع دەڵێ: ئەری دایکم تۆ هەرچی نیوە شەوە ئەو هەموو

بانگە لە خوا دەکەی خوات وەرەز کردووە، ئاخر مەگەر خوا گوێی لە من و تۆ سووکتر نییە؟ مەگەر ئاگای لە خشەی مار و مێروو نییە؟ تۆ ئەم قیرەقیرەت لە چییە و بۆچی ئەم عالەمەت هەراسانکردووە.

## قانع و قسەی خۆش

**کاک ئەحمەدی سەی سادقی گێڕایەوە و فەرمووی:**

لە بەندیخانەی عەمارەدا لەگەڵ حاجی ئەحمەدی مەحموود و حەسەنی خەلیفە مارف و مەلا مارفی گامێش تەپە گیرابوون. منیش سەرباز بووم لەوێ. هەموو ڕۆژێ دەچووم بۆ لای کاک بورهان. بۆ هەواڵی، پێم وابە لە (التآخي)دا ــــ کە ڕۆژنامەیەکی ئەو سەردەمە بوو ــــ ئیشیدەکرد، ڕۆژێکیان چووم، دیم مامۆستا هاتۆتەوە. کە چاوی پێمکەوت، فەرمووی: ئەحمەد، ڕۆڵە بڕۆ مشکی و جامانەکەم بۆ بێنە، لەوەندەیان ئازار داوم سەرم بە ئەندازەی تەنەکەیەك ماسیوە و بایکردووە. هەر کەس لە سجنی ئەم حکومەتەدا بێت سەری دەبێتە تەنەکە. زۆر ناڕەحەتبوو، پێم وابە زۆریان ئازار دابوو، بەڵام مامۆستا زۆر بە تاقەت و بوردەبار بوو. کاك بورهان هات و شتەکانی بۆ هێنا و وتی: بابە گیان خەفەت مەخۆ، ئەمە ڕێگایەکە کە خۆت هەڵتبژاردووە و ئەمە ژیانی تۆیە لە هەر کوێ بێت. پاشان بورهان وتی: مژدەیەکت

بدەمێ. فەرمووی: بلێ. وتی: لە مەیانی گەورە، چوار کەسیان لە گەوادەکان رەمی کردووە. وتی: کێ بوون؟ وتی: یەکێکیان عوقەیلی بوو، یەکێ تریشیان مولازم غەزال بوو، مامۆستاش فەرمووی: بە لاچوونی چوار کەس وەزع ناگۆڕێت.

**مامۆستا عەلی سەعادەتی، مامۆستای زانکۆکانی شاری سنە گێڕایەوە و فەرمووی:**

مامۆستا عەلی سەعادەتی

من زۆرتر لە شەش مانگ لە شارە جوانەکەی سلێمانی لەگەڵ مامۆستا قانعدا بووم، پێکەوە نەژیاین، بیر و باوەڕمان لە یەکتر نەدەشاردەوە، بە راستی مامۆستا قانع مرۆڤێکی میللی - مەزهەبی بوو، لە پاڵ ئەوەدا گەلەکەی زۆر خۆشەویست، دین و دینداریشی خۆشەویست. زۆر راست و رۆشنبیر بوو، زۆر رقی لە ستەم و ستەمکاری بوو، جەماوەری هەژار و چەوساوەی زۆر زۆر خۆشەویست، لە ئینسانی مورتەجع و بەکرێگیراو و خۆ فرۆش خۆشی نەئەهات. شایانی باسە لەو سەردەمەدا کە مامۆستا قانع لە مەیدانی رامیاریدا شۆڕە سوارێکی زۆر چالاکبوو، لە کوردستاندا کەمتر کەسێک هەبوو سەری لە سیاسەت و رامیاری دەربچوایە، لەو سەردەمەدا سەرانی حکومەت و نۆکەر و چڵکاوخۆرەکانی دوژمنی

مامۆستا قانع کوناوکون بە شوێنیدا ئەگەڕان، بەراستی لەو سەردەمەدا ئەگەر مامۆستا قانع لەگەڵ سەرانی حکومەت و نۆکەرەکانیدا سازشی بکردایە، لەگەڵیاندا رێککەوتایە، هەرچی سامان و پارەی بویستبایە پێیانئەدا، بەڵام مامۆستا قانع بێجگە لەوە بە هیچ قیمەتێ خۆی نەدەفرۆشت، زۆر زۆر رقی لە ئینسانی خۆفروش و ناڕاست بوو.

باش باش لە بیرمە لەو کاتەدا عەبدولکەریم قاسم پیرۆز بوو، شیوعیەکانی ئەو سەردەمە هەڵئەپەڕین، دوو دەستماڵەیان ئەشەکانەوە و هاوار و دروشمیان بەرز لەکردنەوە، پێیان وا بوو مەدینەی فازڵە بۆ گەلی عێراق دروستئەکا، بە تایبەت بۆ گەلی چەوساوەی کورد.

لەو کاتەدا مامۆستا قانع ئەیوت حیزبی سەر بە کەریم قاسم هەڵەن و هەرگیز ئەمانە نەهاتوون بۆ خێری گەلان و کومۆنیزم و شیوعیگەری پێچەوانەی فەرهەنگ و کەلەپووری گەلی کوردە. لە راستیدا مامۆستا قانع شاعیر و هۆنەرێکی زۆر پایەبەرز و رۆشنبیر بوو، هەتا هەتایە دنیای شیعر و زانیاری شانازی پێوە دەکا. منیش بەش بە حاڵی خۆم پارچە شیعرێکم بۆ ئەم شاعیرە پایە بەرزە نووسیوە، ئەوە ئێوە و پارچە شیعرەکە، دیاریی شوان ئاڵەکۆکە.

## قانع و بووکی ئازادی

قانع سەرقـــافڵەی عیشق و ئـازادی
خـــەمــخۆری میللەت پـەیامی شادی
سەرکـارەوانی کـــاروانــــــەرای خەم
دڵسۆزی گــەل و دوژمـــنــــی ستەم
دەروازەی بـەرزی قـــەڵاکەی هەولێر
هــەڵۆی بەرزەفڕ شێری بەچکەشێر
قـولەی دووهـاچە شاخـــی باڵانبۆ
کـێوی ئارارات سەر لوتکەی شاهۆ
شیعر و هــەڵبەستت یـــادگارییە
جـێگـــای شـانـازی کـوردەوارییە
قانع سەردەستەی ئازادیخـــوازان
بــەرزی بــەرزەفـڕ شا بازی بازان
ئوستادی حقووق نەڵقـــەی ویـــراسەت
مـــامۆستای زانای زانکۆی سیاسەت
شیعر و گۆرانی و ئاهەنــــگ و سازە
هـــــەمووی مــۆژگـاری و راز و نیـازە
بووکی ئازادیت کەوتە لـــەنجە و لار
پچڕاندی بـەند و نەڵقەی ئیستعمار
کـیژ و کوڕی جوان لە پــــای زرێبار
هــەڵبــەرکێیانە هەموو بە یەکجار

با رۆڵە کوردی بە چەپڵە و شادی

بخوێنێ بۆمان بووکی ئازادی

فەرموودەکانت چەن جانانەیە

چەندە شیرینە چەن پیاوانەیە

فەرمووت تانك و تۆپ لام نەفسانەیە

بەندیخانە بۆم قوتابخانەیە

ئافەرین لە تۆ قانعی ناودار

مەردی خەبات و شێری کارزار

قانع مامۆستای ئامۆژگاری

شانازی میللەت بۆ یادگاری

ئافەرین لە تۆ هەزار ئافەرین

قانعی زانا مەردی دنیا و دین

گیانی شیرینم خەزمەتگوزارە

خزمەتگوزاری گەلی هەژارە

حاڵی کۆتا کە ئەم دەنگ و باسە

رای سەفەر دوورە قەسر و جەم خاسە

عەلی سەعادەتی

مامۆستا وەکو لە شیعردا دەستێکی باڵای هەبووە، لە پەخشانیشدا زۆر بە توانا و لێهاتوو بوو نووسراوی زۆری بووە، بەداخەوە من نازانم چی نووسیوە و ئایا ئێستا ماون و لە کوێن، هێندە دەزانم لەمێژووی کوردەواریدا کتیبێکی هەبووە،

لەو کتێبەوە چەند جار بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان مەبەستی نووسیووە، جا لێرەدا من دوو نموونە لەو نووسراوانە بڵاو دەکەمەوە لە ڕۆژنامەی کوردستاندا بڵاو کراوەتەوە. جا لەم دوو نموونە بچووکەدا دەردەکەوێ چەندە لە مێژوودا لێزانە و پەخشاننووسێکی چۆنە.

ژمارەی چوارشەممە ای گوڵانی ٢٥٧٥ی کوردی بەرانبەر بە ٤ی نوردیبەھەشتی ١٣٤٢ی ھ.ھ. ٢٤ آوریل ١٩٦٣ی ز. ژمارە ٢٠٤ی کوردستان

کەلە پووری نەتەوایەتیمان

## یادێ لە کەسراوە

کاتێ کە دەستەڵاتی ئارییەکان سەر کەوت بە سەر هەموو هۆزەکانی خاوەری میانەدا، «کەسرا» مەدایینی دروستکرد و وشەی مەداین، وشەیەکی تازەیە و مەداین بە زوانی تازی جەمعی «مەدینە»یە، چونکە «کەسرا» حەوت شاری کۆچان لەو جێگەدا، کە ئێستا پێی دەڵێن (سەلمان پاك) وە کردی بە یەك شار و کردی بە پاتەختی خۆی، بە پێی نووسینی مامۆستای بەرزی مێژوو زانمان (مامۆستا ڕەشید یاسمی) گەڕەکێکی ناو نا (کوردئاباد) و لەو گەڕەکەدا کۆشك و تەلاری شاهانەی ڕازاندەوە بۆ خۆی کە ئێستاش تاقەکەی هەر ماوە و لە هەموو جیهاندا بە تاقی کەسرا بە ناوبانگە، و چەند کیلۆمەترێ لە شارەکەوە دوورە. باغێکی دروستکرد کە ناوی نا (باغ داد) و بڵاویکردەوە، کە هەموو دادخوازێك لە ڕۆژی

تایبەتدا بچێتە ناو ئەو باغە، من خۆم دێم سکاڵا کەی وەر دەگرم و دادی دەپرسم، نە وەکو دەست و پێوەند نەهێڵن هەژارەکان بێنە کۆشکی شاهانە سکاڵای خۆیان بکەن، بەم جۆرە هەموو ئەو زۆزە تایبەتانە کەسرا دەچوو بۆ ناو دادخوازەکان و دادپەرستیی خۆی دەکرد. هەتا لەم دواییەدا خەلیفەکانی عەباسی باغدادیان گەورە کردو کردیان بە شار و پایتەخت بۆ خۆیان کە ئێستاش پێی دەڵێن (بەغداد) جا لەو کاتەدا کە نەوشیروان لە مەداین دەستیکرد بە دادپەروەری و ئاواکردنەوە و پەرەپێدان بە کشتوکاڵ، دانیشتووانی خواری مەداین ئەم دادپەروەری نەوشیروانەیان زۆر پێناخۆشبوو چونکە ئەوان فێر بوون بە دزی و کوشتار و تالانکردنی یەکتر. نەوشیروانیش جڵەوگیری لێکردبوون لەدزی درۆزنی، هەتا گەیشتە ئەندازەیەك کە هەموو زیندانەکانی کەسرا پڕ بوبوون لە پیاو خراپ. رۆژێك لە رۆژان هێرزێکی بێگانە هات یەمەنی داگیر کرد، لەو چاخەدا (سەیفبن ذییەزن) فەرمانڕەوای یەمەن بوو، هات پەنای هێنا بە نەوشیروان. نەوشیروانیش نەیئەویست کۆمەکی پێبکات هەتا بوزرگ مهری وەزیری، کە تازییەکان پێیان ئەوت (ئەبوزەرج مهر) هاتە گفتوگۆ و روویکردە نەوشیروان،

وتــی: شاهەنشــاها! ئیمــە هــەموو زیندانــەکانمان تەماشــا بکەین چەندە پیاو کوژیان تیان، کە خۆمان هەر نەیانکوژین، بیاندەین بە سەیف بیانبات، ئەگەر کوژران، ئەوا گەیشتوون بە تۆڵەی کردەوەی خۆیان، ئەگەر نەکوژراشن و یەمەنیان رزگار کرد، لە مێژوودا پیاوەتی و خاوەن پەنایی بۆ ئێمە ئەنووسرێت.

ئەنوشیروان وتی: زۆر چاکە، بە مەرجێ یەمەن رزگار بکەن، لێبوردنێکی گشتییان بۆ دەر ئەکەم.

کاتێ کە تەماشای هەموو زیندانەکانیان کرد، نواریان ژمارەی دوانزەهەزار پیاو کوژیان هەین کە دادگا فەرمانی کوشتنی هەموویانی دابوو. ئەم دوانزدە هەزارەیان دا بە سەیف بردنی، هێزی دوژمنی پێ شکاندن و یەمەنی رزگار کرد، و کەوتەوە ژێر فەرمانی خۆی.

لە پاش ئەم پیرۆزییە، ئەوشیروان لێبوردنی گشتیی بۆ دەر کردن. پادشاکانی ئاری وە ئەبی هەر لە (پەینەنئەهرەین) و ئەرمەنستاندا فەرمانڕەواییان کرد بێت؛ لە رۆژ هەڵاتی ناوەڕاستدا تەماشای هەر قوژبنێ بکەیت جێگە دەستی یەکێ لە پادشاکانی ئاری ئەکەوێتە بەر چاوت، یا تەماشای تاریخ اجتماعی ایران (لاپەڕەی ٤٤١) بکە، جا دەزانیت کە شاپووری گەورانە. (شاپور ژوالاکتاف) چی

کردووە بە قەیسەری ڕۆمی. من دەتوانم بیچەسپێنم کە هۆزی ئاری، یەکەم هۆز بوون لە ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاستەوە بە سەر زۆرتری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا فەرمانڕەوا بوون و ئێستاش نەتەوەی ئاری ئەگەر هەموویان بە دڵێکی پاك تێبکوشێن بۆ بەرز بوونەوەیان، بە سەر بێگانەدا، هیچ گومانی نییە کە دەچنەوە جێگەی خۆیان، ئەو برینە کە بە تیغی بێگانە لێیان کرا بوو، پارچە پارچەی کرد بوون، یەکێ کورد یەکێ فارسی، یەکێ نەقشبەندی یەکێ قادری بوون، سازێژ دەبێت و زۆر چاك فەرمانڕەوایی خۆیان وەر دەگرنەوە لە ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاستدا.

## قانع و پیرەژنێك و پیرەپیاوێك

فاتمەخانی[1] کۆنەپۆشی خێزانی بەڕێز کاك لەتیفی شێخولئیسلامی سیفی گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا قانع لەو لێقەومان و دەربەدەرییەدا کە لەو دیو (کوردستانی عێراق) جێگەیان پێ لێژ دەکرد لە سێف گیرسایەوە و ماڵی ئێمەی بە ماڵی خۆی دەزانی. لە کاتی قسە

1ـ فاتمە خانم کچی خولێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی ڕەحمە دێ هاوسەری دڵسۆز و بە وەفای شێخ لەتیفی شێخولئیسلامییە، ئەم فاتمە خانە بەڕاستی دایکی هەژاران بووە، لە خزمەتی هەژار و نەدار و میواندا ماندوو نەبووە و هەرگیز ناوچاوی بۆ زەحمەتی داماوان گرژ نەکردووە. لێرەدا لەمە زیاتر بوار نییە باسی ئەم خاتوونە دڵسۆزە بکەین.

کـردندا دەیفـەرموو ھاتـمەوە، چـوومەوە، گەیشـتمەوە مـاڵی مەبەسـتی ماڵی ئێمـە بـوو. خـۆی لـە ئێمـە جیـا نـەدەزانی. ئـەو جـارە کـە بـە خێزانـــەوە ھـــاتبووە ســـێف، ھۆدەیـــەك و بەرھـــەیوانێکمان لـــە ماڵەکـەی خۆمـان بـۆ تـەرخانکرد و وەکـو یـەك خێـزان پێکـەوە دەژیـاین، زۆر خۆشمـان رائـەبوارد. ھیچـکەس خـەم و خەفـەتی نەدەزانی، لـە ھـەر لایـەك بوایـە ئـەو خێـزان و دانیشـتووانە تـەنیا لـە یـەك شـت دەترسـان، گـرتنی مامۆسـتا و دوور کەوتنـەوەی. پیاوێکی زۆر دڵئـاوا و بـەرەحم و بـەزەیی بـوو. لـە بیرمـە پـیرەژن و پیرەپیاوێك لـە سـێفدا بـوون کەسـیان نـەبوو. ھەردووکیشـیان کوێـر بـوون. ھـەموو نیوەڕۆ و ئێوارەیـەك کاتـێ چێشـت پێدەگـەیی پـێش ھـەموو کـەس ئـەیوت: ئەمنـە کـوا بەشـەکەی ئـەوان؟ بـە تایـەت کـاتێ بـرنج و گۆشـتیان ببوایـە. ھـەتا بەشـی ئـەوانی نەبردایـە کـەس بـۆی نـەبوو لـەو چێشـتە بخـوا. جـا سـەیر ئەوەیـە خـۆی بـە دەسـتی خـۆی ئـەیبرد بۆیـان. خـەڵکی دێ ھێندەیـان خۆشدەویسـت زۆربـەی کـات بـە دەوریدابـوون. چـاکتر بڵـێم، قـانع نموونـەی بـەزەیی و گەورەیی و لێبوردن بـوو. دڵـێکی یەکجار ئـاوەڵای بـوو، بـە قسـە خۆشـەکانی فرمێسـکی لـە گۆنـای خـەمباران دەتـاراند، زەردەخەنـەی دەخسـتە سـەر لـێوان. قـانع خـوا نـاردبووی بـۆ رێنمایی ئێمەی ھەژار.

# قانع و تەڵە

مامۆستا لەو زەمانەدا کە نە باسی ژینگە بوو نە کەسێ بیری گیانداری کێوی دەکردەوە و نە کەسێ لای گرنگبووە دارستانەکان لە نێو بچن، ئەوەتە دەیان نموونە و بەسەرهات دەگێڕنەوە کە نیشانئەدەن قانع هەمیشە لە زەمان پێشتر بووە و بیری تیژی سالآنێك لە پێش زانستدا بووە، جا نازانم ئەم گەورە پیاوە چۆن ئەم هەموو شتەی زانیوە! کەسێ نە بچێتە دەرەوە و نە پێداویستی تاقیکاری هەبێ، وەکو ئەو خەڵکە و لە ناو ئەو خەڵکەدا چۆن بووە هێندە ژیر و زانا بووە! خوالێخۆشبوو مەلا خەلیلی مەردۆخی گێڕایەوە و فەرمووی:

مامۆستا ماڵی لە کانی‌سانانی مەریوان دەبێ. ماوەیەکی زۆر راوچییەکان تەماشا دەکەن داوەکانیان خراپکراون و تەڵەکانیان تەقێنراون. ئیتر هەرچی هەوڵدەدەن «کەو» و «دەڵەکیان» بۆ ناگیرێ. ماوەیەك دەبێتە قاو، چی‌بکەن و چی‌نەکەن، ناچار بە شەودا خۆیان دادەگرن بزانن کێیە ئەم کارە دەکا، تا شەوێك کابرا دەگرن و دەبینن قانعە، لێی دەپرسن ئەم ئیشە چییە؟ دەڵێ برا ئێوە وەها لێی براون گیانداران نەهێڵن، ئێوەی راوچی زۆر بێرەحمن، بە یەك و دووان تێر ناخۆن، لێوە دەزانن پێی دەڵەك دەکرێ بە چی؟ لەڵێن نا. ئەڵێ دەکرێ بە میوانی پاڵتاو و کراسی ژنە ئینگلیسی، جا رەوایە گیانداری وڵاتی ئێمە

و دارستانە جوانەكانى بفەموتێن؟ بەرا مەگەر بەرم ئەگینا هەرچی شەرە هەرچی داوتەڵە هەیە هەموویان دەتەقێنمەوە.

## قانع و بەهار

**كاك سەی لەنیفی شێخولئیسلامی‌سێفی نووسیویە:**

قانع هەلكەوتوو و لێهاتوویەكی زۆر گەورە بوو. هەموو ژیانی فێر كردن و زانیاری بوو، لە هەر كۆڕ و كۆمەڵێكدا بووبا، دەبوو هەموو بلێن (چی)، چونكە كەسێك لەو پێشتر نەبوو. ئەم پیاوە خوو و خەدەیەكی تایبەتی هەبوو. لە بیرمە مالی لە دێی سێقدا بوو زستانێك بەفری زۆر باریبوو گلوگوێز نەمابوون بۆ ئەوە خەلكی لە گوێ ئاور دەربێنێ و زەردەخەنەیەك بخاتە سەر لێوانی ئەو خەلكە كۆیدەكردنەوە و دەیبردنە سەر لوتكەی (مام هۆمەرە) كە دەیروانیە زرێبار، بەفرەكەی پێ پاكدەكردنەوە و گیا دەر دەكەوت، دادەنیشتن و قسەی خۆشی بۆ دەكردن، دەبووە سەمیرانێك و دەیگوت وا بزانن ئێستا بەهارە و ئێوارە دەگەڕانەوە.

# قانع و مۆسیقا

**بەڕێز شێخ لەتیفی شێخولئیسلامی سێلی نووسیویە:**

**ڕۆژێـک لــە حوجـرەی مزگەوتەکـەی دێـی سـێقدا لــە خزمــەتیدا بووین. بـە عـادەتی ئـەو وەختـە مۆسـیقار (دەهۆڵکـوت و زوڕنـاژەن) کـە پێـان دەگوتـن (لۆتـی) جـار جـارە مـەیموون، یـان ورچـێکیان لەگـەڵ خۆیـان دەهێنـا بـۆ شـادکردنی خـەڵك و خـەڵکی دێ پارەیـەکیان بـۆ کـۆ دەکردنـەوە، بووبـوو بـە ڕەسـم، قێخـای دێکـە لۆتـی دەدی، نـان و چـای دەدانـێ و دەچـووە مـاڵی ئاغـەی دێکـە، دەیـوت لۆتـی هـاتووە، پـارەم بـدەرێ بیـاندەمێ بـا زوڕنـا و دەهـۆڵ لێـدەن. جارجـارە ئاغـا، یـان کەسـێك داوایدەکـرد زوڕنـا و دەهۆڵـێ بـۆ لـێدەن مامۆسـتای دێکـەش خێـرا هـاواری لـێ بـەرز دەبـووەوە و دەیـوت زوڕنـا حەرامـە و نابـێ لـێدرێ. ئـەم کێشـەیە هـەر هـەبوو، جـا بـۆ ئـەوەی کـە مامۆسـتا و بـڕێ کەسـانیتـریش هەرایـەك بـەرپا نەکـەن، پارەیـەك دەدرا بـە لۆتیـەکان. ئـەوانیش بـە بێئـەوەی مۆسـیقایەك لـێدەن دەڕۆیشـتن بـۆ دێیـەکیتـر. جـا قێخـا هات و بە مـن وت ئاغـە لۆتـی هـاتووە پـارەم بـدەرێ، بـا بیاندەمـێ نـەگینا فـوو دەکـەن بـە زوڕناکـەیاندا. خێـرا قـانع وتـی: ئـا بـڕۆ بیانهێنە بۆ ئێرە. قێخا ڕۆیشـت و بـانگیکردن، قـانع وتـی: ئێـوە ئـەم ئیوەڕۆیـە مـیوانی مـنن، مـن لـە ئێوە مـەمنوونم چـونکە ئـەم مۆسـیقا**

رەسەنە کوردییەتان هێشتووەتەوە و نەتانهێشت بفەوتێ، ئەوانیش ئەمەیان زۆر پێ سەیر بوو، کە مامۆستایەك بە چاك و مێزەرەوە لە جیاتی ئەوە دەربانکات و لێیان توورە بێ، بۆ لیوەڕز بانگیاندەکات. جا فەرمووی: بیکوتن. لە حوجرەی مزگەوتدا دەستیانکرد بە زورنا لێدان و دەهۆلکوتان. ئەم کارەش بۆ ئەو سەردەمە شتێکی زۆر سەیر بوو. مەلایەك لە حوجرەی مزگەوتدا ئیزن بدا ئیشی وا بکرێت.

## بە راستی کوڕی قانعن

**بەڕێز شێخ لەتیفی شێخولئیسلامی نووسیویەتی:**

لای سەرهەنگی سەرزبانی سەریوان ـــ سەرهەنگ چەمەنئارا ـــ بووم، کابرایەکی چریك کە ناوی (مەلا حامیدی سەرنژماری) بوو نامەیەکی دایە دەست سەرهەنگ و سەرهەنگ وتی: با بێن. دوو کەس هاتنە ژوورەوە، من ئەوانم ناسیەوە، سەلاح و بورهان (کوتەك و خەنجەر)، سەرهەنگ پرسیاریکرد: ئێوە کوڕی قانعن؟ خێرا بورهان وتی: ئەمێ ئەمە لە دایکمان بپرسی. سەرهەنگ کە بە زاراوەی کرماشانی لە گەڵیان دەدوا خێرا وتی بەڕاستی کوڕی قانعن! ئەمێ کوڕی قانع رابێ. فەرمانیدا بەرەڵایانکردن.

## قانع و پارچەی کەوا و سەڵتە

**بەڕێز شێخ لەتیفی شێخولئیسلامی نووسیویەتی:**

قانع دەچێتە سەر دوکانی حاجی عەبدوڵڵای کوتاڵفرۆش، دەڵێ: حاجی قاتێك پارچەم بدەرێ بۆ کەوا و سەڵتەم، نیوەی قەرز و نیوەی حازر. بەڵام بۆ حازرەکەی یەك ساڵم لێ بخایەنە. حاجی دەڵێ: ئەی بۆ ناڵێی قاتێکم بدەرێ بە قەرز و تەواو. دەڵێ: ئاخر ئەترسام ئەگەر هەمووی قەرز بێ نەمدەیتێ.

## گوێندێرژەکەی قانع گورگ دەیخوا

**بەڕێز شێخ لەتیفی شێخولئیسلامی نووسیویەتی:**

قانع ماڵی لە دۆڵەسوور دەبێ. بۆ ئیش و کاری پێویست کەرێکی ئەبێ، بەڵام لە بەر بێجلی (کۆپان) دادەمێنن، قانع شتومەکی پێویست بۆ دروستکردنی کۆپان ڕێکدەخا و دەچێتە پێنجوێن بۆ لای (کەریم کۆپان) بۆ دروستکردنی. زیاتر لە حەفتەیەك لە پێنجوێن دادەنیشی، هەتا کۆپان تەواو دەبێ. پاشان بە ماشین هەتا ناڵپارێز دەبیا و لەوێوە تا دۆڵەسوور نزیك بە (٥) کیلۆمەتر دەیگرێ بە کۆڵەوە. زۆر ماندوو دەبێ و ئارەقدەکا و دەگاتە بەرەوە، خاتوو ئەمنە دەڵێ: بەدبەخت و هەژار بۆچی خۆشت ماندوو کرد، کەرەکە گورگ خواردی.

## قانع و لەقلەق

**مامۆستا مەلا ئەولخالقی ریشێنی گێڕایەوە و فەرمووی:**

قانع بێجگە لە خزمەتی خەڵك و مرۆڤایەتی، لەگەڵ گیاندارە کێوییەکان و هەر وەها دار و گیا و «ژینگە» خۆی بە بەرپرس زانیوە و نەیهێشتوە مافیان پێشێلبکرێت. رۆژێك قانع کە ماڵی لە دێی کاڵ دەبێ دەچێتە هەرد بۆ بارەداری وشك، تماشا دەکا هێلانە لەقلەقێك لایەکی خراپبووە و بەچکەکانی خەریکە دەکەونە خوارەوە. خۆشتان دەزانن لەقلەق هێلانە لە سەر داری بەرز دەکا و مرۆڤ دەستی ناگاتێ. مامۆستا دەچێتەوە بۆ ئاوایی و دوو کەس لەگەڵ خۆی دێنێ و کە یارمەتی بدەن، هێلانەکە چاکبکاتەوە. کە دەڕۆن یەکێ لەوانە دەڵێ ئەم دارە بەرزە، ناتوانین پێیدا سەر کەوین، ئەبێ تەگبیرێ بکەین، پاشان دەڵێ دوو چڵ داری درێژ دەبڕم دەیکەمە پلەکانە (پەیجە) و پێیدا هەڵدەگەڕم و چاکیدەکەمەوە. مامۆستا دەڵێ: راوەستە تا خۆم بچمە ئاوایی و بێمەوە مامۆستا دەڕوا و ئەوانیش چاوەڕوانیدەکەن تا بێتەوە. پاش ماوەیەك مامۆستا دەگەڕێتەوە پەیژەیەکی بە کۆڵەوە

گەرتووەو ئازەڵی کردووەتەوەو، زۆر ماندوو بووە. ئەڵێن مامۆستا بۆچی ئەفەرموو ئێمە بیهێنین، یا لێرە پلەکانە چاککەین. مامۆستا ئەفەرمێ: ئێوە داری درێژ ببڕن خەسارێکی زۆر لە ژینگە دەکەوێ، ئەگەر ئێوەش دەنارد بۆ پەیژەیەکی لەبەر بۆ نەجاتی گیاندارێکی هەردی ئێوەی ئەشرەفی گیاڵەبەرم بەستایەلە زەحمەت، ئەم ئیشەی من دەبوو بە چی؟ جا هێلانەکە چاکدەکەنەوە و جوجەڵەکان دەخەنەوە جێگای خۆی. مامۆستا لە مزگەوتدا لەم بارەیەوە باسدەکا و دەڵێ: نابێ گیاڵەبەران ئازار بدرێن، هێلکەی هێلانەکان هەڵگرین.

نابێ بێمەبەست و بێنیاز دار و درەخت بڕدرێت.

پاشان ئەم شیعرە دەڵێ:

جووجەڵەی لەقلەق لە لەقلەقانم
بڕوا دەنووکم بڕوا پاکانم
تەقەی دەنووکم وەك شەیپوور دەڕوا
فەرقی نییە بۆم زەوین و هەوا
لای زرێبارا پێم خۆشە ژیان
حەز ناکەم ئەزان لێم بکەن بە ژان

## قانع و میوان

مامۆستا مەلا کەریمی سەردۆش[1] گێڕایەوە و فەرمووی:

چوومە ماڵی قانع، ژوور و نیوێکیان هەبوو. نیوەژوورەکە مامۆستا ژن و منداڵەکانی تێدا دەنووستن و ژوورەکەش گوایا هی میوانبوو. کورە گەورەکانیش لەگەڵ میوان لەوێ دەنووستن. بڕێك لە ژوورەکە تەڕ بوو، بووبوو بە قوڕ، بەڵمی چەڵتووکیان هێنابوو خستبوویانە سەر تەڕیەکە و فەرشی واشیان نەبوو کە لە سەر بەڵمەکە رایخەن، گیریانخواردبوو، من عەرزمکرد: قوربان، بۆ نووستن دەچمە مزگەوت. فەرمووی: ئاخر ڕەوا نیە میوانەکەم بنێرمە مزگەوت. مزگەوتیش زۆر گەرم نیە، لەوانەیە سەرماتبێ. بە هەر حاڵ رامان هاتە سەر ئەوە بۆ

مەلا کەریمی سەردۆش

---

[1] مامۆستا کەریمی سەردۆش زانایەکی ئاینی زۆر زیر و خوێندەوار بوو. مەدرەسە و فەقێی هەبوو، ئەویش وەکو زۆربەی مەلاکان دەربەدەریی زۆری کێشابوو، لە زۆر جێگادا مەدرەسە و حوجرەی رازاندبووەوە و لە ئاکامدا لە دێی سەردۆش زێدی خۆی پەرەی بە زانست و مەدرەسەکەی دا و جگە لە خزمەتی فەقێ و مەدرەسە و مزگەوت ئیش و کاری کۆمەڵایەتیشی گرتە ئەستۆ و زەحمەتی زۆری بۆ خەڵکی ناوچەکە کێشا و بە زیانی فەقیرانە قەناعەتیکرد و هەتا لە سەردۆش ماڵاوایی لە خەڵکی هەژار و قوتابییەکانی کرد و سەری نایەوە، خوا بیبەخشێ.

نوروستن بچمە مزگەوت. مامۆستا لێفەیەکی دامێ، پێم وابە هی خۆی بوو، هەڵمگرت و چووم بۆ مزگەوت. مزگەوت تاریك و سارد بوو، ناچار بووم راکشام و لێفەکەم دا بە خۆمدا. جیرەی دەرگای مزگەوت هات. مامۆستا هاتە ژوورەوە و مەوجێکی پێبوو راکشا و مەوجەکەی دا بە خۆیدا. منیش لێفەکەم بۆ برد و داوام کرد مەوجەکە بدا بە من. هەرچیم کرد وەرینەگرت. عەرزمکرد: بۆچی هاتی بۆ مزگەوت؟ فەرمووی: کاکە، کە تۆ هاتی دڵم تاقەتی نەگرت و وتم: من لە ماڵ بنووم و میوانەکەم لە مزگەوتی تاریك و سارددا بنوێ، شەرمەزار بووم و هاتم بۆ لات، دەبێ منیش وەك تۆ ئەمشەو رابوێرم. ئەو شەوە هەر جۆر بوو رۆژمکردەوە و زۆر شت لە دڵ و دەروونمدا بوو، هەمووم لە بیر چووە و دەرسێکم لێوەرگرت و بە هەموو تەمەنم هێندەم دەرس نەخوێندبوو، هێندەم کەسبی فەزیلەت و گەورەیی نەکردبوو. پێم وایە لە رەفتاری ئەو گەورەپیاوە وەها دەرسێك فێر بووم، ئەگەر ئێستاش بێنێکم لە مرۆڤایەتی بردووە، هی دەرسی ئەو شەوەیە. ئێستاش خۆم بە شەرمەزار دەزانم ئەگەر قانع نەبوو، ئێمە چین؟ ئەگەر

ئێمە ئینسانین، قانع چیبوو؟ ناتوانم شتێك بڵێم، جگە لەوە کە سەرم دەخەمە بەر پێی و خاکی بەر پێی ماچدەکەم و دەڵێم تۆ فێرتکردم و من کەریی سەردۆشی بووم.

کاك عەلی نادری گێڕایەوە و فەرمووی:

مەلایەك لە تاران بووەتە نوێنەری پەرلەمان و لەگەڵ رەزاشا کەوتووەتە ململانێ و حەزبێکردووە رەزاشا نۆکەری ئینگلیس و ئامریکا بێ. ئەو مەلایە هێندە ململانێی کردووە، سەرەنجام کوشتوویانە. قانعیش پارچە شیعرێکی بە زمانی فارسی بۆ نووسیوە و تاریفی لێکردووە، شیعرەکە زۆر درێژە و چونکە دەمێ ساڵە وتراوە هەر تۆزێکم لە بیر ماوە، لە پاشان فەرموویان ئەم مەلایە پێم وایە ناوی موسەدیق بووە، منیش وتم: موسەدیق کەسێکی تر بووە و ئەگەر موسەدیق بوایە لە شیعرەکەدا ئەنووسرا موسەدیق. وتی: بە خوا نازانم، من هەر ئەوەم لە بیرە.

منیش نازانم خوا ئەیزانێ و ئەمە شیعرەکە:

مدرس دشمن جهل و حماقت

مدرس مظهر حسن و صداقت

مدرس پایگاه علم و دانش

مدرس ضد هر نیرنگ و سازش

## سەی ئەحمەد حسەینی

سەید ئەحمەدی حسەینی

ناوی سەیید ئەحمەد حسەینی کوڕی شێخ عەبدول دانیشتووی کانی‌سانان، لە دایکبووی (١٣٣٨) ی کۆچی هەتاوییە، خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییە لە کانی‌سانان لە مووچە و مەزرای باوەگەورەیدا لە دەشتی دۆڵاشی قانع. ئەم سەیید ئەحمەدە، خۆشی هۆنەرە و هۆنراوەی زۆری هەیە، بەڵام تا ئێستا هیچی چاپنەکراوە، چونکە خۆی دەردی نەداری چێشتووە و ناسۆری و کوێرەوەریی زۆریٚ دیوە. دەردی چەوساوەکان دەزانێ. جارجاریٚ هۆنراوەیان بۆ دەهۆنێتەوە و ئەم هۆنەرە ناز ناوی هۆنراوەیی دڵپڕە. ئەم دڵپڕە خزمی نزیکی مامۆستا قانعە، کە بیستبووی من خەریکی کۆ کردنەوەی بەرهەمە بڵاو نەکراوەکانی قانعم. هۆنراوەیەکی هۆنیبۆوە و ناردبووی، ئەوا منیش وەکو نموونە، هۆنراوەیەکی بڵاو دەکەمەوە لە ژێر ناونیشانی:

### قانع موژدە بیٚ

پێشکەش بە گیانی پاکی هەمیشە زیندوو مامۆستا قانع

قانـــع تۆ مردی بەڵام هەر مـاوی

بـــۆ هەموو کوردان هەر سۆمای چاوی

یاد و بیری تـــــۆ هەر لە بیرمانــە

شـــەوچەرەی ماڵی گەنج و پیرمانە

لە ناو کوردانا هەر ناوت بــەرزە

یـاد و بیری تۆ لە لامان فەرزە

قانع موژدە بێ بە گۆڕ و خاکـت

بــە بیر و باوەڕ، بە ڕۆحی پاکت

هەر وەك خۆتـفەرمووت لە دیوانەکـەت

بـــە هۆنراوەیبەرز، شیعرە جوانەکەت

ئەسپی خەیاڵت ئەمڕۆ سەرگەرمــە

مــشتەری شیعری جوانت بێشەرمە

ئەمڕۆ لاوانی کورد و کوردستـــان

دڵسۆزانـــی پاك خاك و نیشتمان

خوێندن دەخوێنن لە قوتابخانـــە

مـــــایەی شانازین لەم کوردستانە

بەرەو پێش دەڕۆن لەگەڵ زانینـــدا

لـــــەگەڵ زانین و بڕوا و ئایینـدا

هەتاوی زانین دڕی پەردەی شـــەو

لاوانـــی نوستوو هەستاون لە خەو

قوڵی مەردییان لێ هەڵماڵیـــوە

شـــەوگـــار ڕۆییوە بەرەو کازیوە

لاوان نەزانین ئەوا گۆڕ دەکـــەن
سەری تەعزیەی زوو پێ شۆڕ دەکەن
وەتەن رازاوەس بە بیری خاوێن
لـــە لوتکەی چیا تا دەشت و داوێن
لە کووچە و کۆڵان شەقام و بازاڕ
لـــە تەواو وڵات لە دێهات و شار
پۆل پۆل کچان و کوڕانی دڵسۆز
دڵســۆز بە خاك و نیشتمان و هۆز
لە هەموو شوێنی ئەم کوردستانە
بـــە فیکرەو دەڕۆن بۆ قوتابخانە
ئەڵێن تا دەگەین بە لوتکەی ئاوات
هەروا دەخوێنین بۆ بەرزیی وڵات
ئەمجارەش مژدە بە بیری پاکت
بـــە گڵکۆ و مەزار بە گۆڕ و خاکت
تا لەگەڕدا بێ گەردشی دەوران
ناچیت لە بیری کورد و کوردستان

دڵپڕ
رۆژی ٧٩/١١/١٦ نووسراوە.
لە دەشتی دۆڵاش (دۆڵاشەکەی قانع).

## بەسەرهاتی بەیازەکەی مەلا رەسووڵ

وەکو پێشتر رامگەیاند من لە مێژە خەریکی کۆکردنەوەی بەرهەمی مامۆستا قانعم. لە پرس و جۆ و هاتوچووندا بووم، کاک (ئومێد عیزەدین)ی ئامۆزازام دیوانێکی دەستنووسی کۆنی دامێ و فەرمووی ئەمە شیعری مامۆستا قانعە، خوالێخۆشبوو، باوەگەورەم (باوکی دایکم) مەلا رەسووڵی فەریقی[1] شاعیر و نووسەر و هاوەڵ و هاو فەقێی قانع، کە ئەویش پیاوێکی زۆر خوێندەوار و شاعیرێکی بە توانا بووە ئەم شیعرانەی کۆکردوونەتەوە، خۆی و بە هۆزی فەقێیەکیەوە نووسراونەتەوە، تماشاکە بزانە کامی بڵاو کراوەتەوە، کامی هێشتا بڵاونەکراوەتەوە، بەڵکو بڵاوی کەینەوە منیش خەریکی نووسینی کتێبی هەورامانناسی بووم. بەرێز کاک حەکیم مەلا ساڵح لە شاری سنە دەژیا و خەریکی کۆکردنەوەی دیوان و بەیازە دەستنووسەکان

---

1ـ مەلا رەسووڵی فەریقی کە زیاتر لە حوجرەدا لەگەڵ مامۆستادا پێکەوە بوون و زۆر هاورێی راستی بوون، لە کۆتایی ئەم دیوانەدا کورتەیەک لە ژیان و نموونەیەک لە شیعر و نووسراوەکانی بڵاو دەکەمەوە.

بوو، لە هەر جێگەیەك شتێکی کۆ کردبۆوە. منیش لە بەر ئەوەی دەستووسی تری لا بوو، دەشپەرژا خەریکی لەم جۆرە ئیشانە بێت، دیوانەکەم دایە دەستی و داوامکرد بڵاوکراوە و بڵاونەکراوەی جیاکاتەوە. پاش ماوەیەك لێم پرسی، فەرمووی خەریکم ئەبێ هەر مایەوە تا بەرێزیان گەڕایەوە کوردستانی ئەو دیو. من دەستم پێنەگەیشت هەتا بە هۆی کاك عومەرەوە دیوانێکی تازە چاپکراوم دەسکەوت. کە کاك وریا قانع بۆ رای دڵسۆز و زەحمەتکێش چاپی کردبوو، بەڵام لە ژمارەیەکی کەمدا کە زۆربەی هەر ئەو شیعرانە بوو کە کاك ئومێد دابوویە من و من دابووم بە مامۆستا حەکیم مەلا سالح. نە ناوێك لە من بوو نە لە ئومێد و نە لە مامۆستای خاوەن دیوان. سەرم سوڕما هەتا لە فستیواڵەکەی خوالیخۆشبوو هەژاری موکریانی کە لە هەولێر بەسترا، منیش وەکو میوانێك بەشدار بووم. کاك وریا و کاك حەکیم مەلا سالح هەردووکیان لە هەولێر بوون، منیش کاك ئومێدم لەگەڵ خۆم برد و وتم خۆت لە نزیکەوە بزانە چۆن بووە. چووینە خزمەتی مامۆستا وریا قانع و مەسەلەکەمان باسکرد، مامۆستا وریا لە ناو کتێبخانەکەیدا

دەستووسەکەی دەر هێنا و فەرمووی: ئەمە دەستووسەکەیە، کە مامۆستا حەکیم داویە بە من. کاک ئومێد فەرمووی، خۆیەتی، ئەمە خەتی باوەگەورەمە، کە دامە دەست تۆ، پاشان چوومە خزمەتی مامۆستا حەکیم مەلا سالح و ئەم باسەم کرد و فەرمووی راستە هەر وا بووە کە تۆ دەڵێی. جا ئیتر بۆم دەرکەوت کە مامۆستا حەکیم، من و ئومێد و نووسەری بەیازەکەی لە بیر چووەتەوە لەگەڵ کاک وریا ئامادەی چاپیان کردووە. با ئەوەش بڵێین کاک حەکیم لەو کەسانەیە کە رەنجێکی زۆری داوە بۆ پەرە پێدانی ئەدەب و فەرهەنگی کوردی و هەرگیز بە تەمای ئافەرین و دەستخۆشیش نەبووە و زۆر جاریش لە رەهەا رووداوێکدا گلەییشی لێکراوە، چووەتە ژێر پرسیاریشەوە. جا من وێڕای ماندوونەبوونی و دەستخۆشی بۆ کاک وریا و کاک حەکیم، ئەم رووداوە هەرچەند زۆر ناخۆشە و منیش لە ئاستی کاک ئومێددا شەرمەزار بووم، بە لە بیرچوونەوەی کاک حەکیمی دادەنێم، لە کاک ئومێد و بنەماڵەی مەلا رەسووڵی فەریقی داوای لێبوردن دەکەم. ئەو شیعرانە بڵاودەکەمەوە کە کاک ئومێد رازیی و بنەماڵەی مەلا

رەسوولیش حەقی خۆیان وەرگرتبێ. چونکە ژمارەی دیوانە چاپکراوەکەی مامۆستا وریا کەمە و لە بەر ئەوە هەمووان بتوانن کەلکی لێوەرگرن لە کۆتایی ئەم بەرهەمەدا بڵاویدەکەمەوە. هەزار سڵاو لە گیانی قانع و ئافەرین بۆ کاک وریا و کاک حەکیم. ئەمە بوو سەرگوزەشتەی بەیازەکەی مەلا رەسوولی فەریقی کە لە دیوانەکەی مامۆستا قانعیشدا شیعری فەریقی لە لایەن مامۆستاوە کراوە بە پێنج خشتەکی.

ئەمەش ئەو شیعرانەن کە مەلا رەسوولی فەریقی لە بەیازەکەیدا نووسیوونی و ئەو نوکتانەی کە کاک وریا لە سەرەوەی بەرهەمیاندا بڵاویکردبوونەوە و داوای لە من کرد کە بیخەمە ناو لەم بەرهەمە تازەیە و لە بەر فەرموودەکەی ئەو بڵاویدەکەمەوە.

## چەند نوکتەیەکی قانع

جارێکیان لە دانیشتێکدا لە قانع دەپرسن: ئەرێ مامۆستا تۆ ساڵی گرانییەکەت بە بیر دێ؟ ئەویش لە وەرامدا دەڵێت: لە رۆژێکەوە من لە دایکبووم، لە ماڵەکەی مندا گرانی بووە، نازانم ئێوە کام ساڵتان مەبەستە؟

قانع تازە لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد گەڕابۆوە، لەبەر پەڕی هەژاری و دەستکورتیدا بوو، سێ دانگی ئاشی سەریاوەرەی نیوداشێ بۆ نارد بوو، قانعیش لەو ڕۆژانەدا کەرێکی پەیدا کردبوو، بەڵام کەرەکەی کورتانی نەبوو، ئەویش نەیکردە نامەردی، کەوا و سەڵتەکەی کرد بە کورتان بۆ کەرەکەی، وای دووریبوو ملیوانەی کەوا و سەڵتەکەش کەوتبووە سەرملی کەرەکە و وتی میراتی «کەر بۆ کەمتیارە».

مامۆستا شێخ محەممەدی ساوان گێڕایەوە و وتی:

حەمەئەمین بەگی پشتکوڕ، لە ناوچەی بانە، پیاوێکی زۆر قسەخۆشبوو، ڕۆژێک بە مامۆستا قانع دەڵێت: تو خوا شیعرێکم پێدا بڵێ، ئەویش دەڵێت: دەترسم زویر بیت. ئەمین بەگیش دەڵێت: هەر چیم پێدەڵێیت من ڕازیم. قانعیش چونکە لە بناغەدا ڕقی لە دەرەبەگایەتی بوو، بە بێراوەستان ئەم دێڕە شیعرەی پێدا هەڵدەدات).

**مەرحەبا چاکی چلۆنی کۆنە ئاغای بەد بلووک**

**کیسەڵی دەرفنگ شکاوی جووجەڵەی بێباڵ و تووک**

**بەڕێز مامۆستا شێخ محەممەدی ساوان گێڕایەوە وتی:**

لەو ڕۆژانەدا لە بانەوە هاتم بۆ سلێمانی. لە خاڵی پشکنینی قەراخ شار داوای شناسنامەیان لێکردم و منیش هیچم پێ نەبوو، وتیان کوێندەریت؟ وتم: عێراقیم. وتیان: نەخێر ئێرانیت. وتم: ڕاستەکەن بانەییم و بانەش ئێران نییە. وتیان: نەخێر بانە ئێرانە و دەبێت دابەزیت. وتم: بابە گیان بانە ئێران نییە. بە کورتی دوای مشتومڕێکی زۆر، لە ئەنجامدا وتم: من بەڵگەم هەیە کە بانەیی ئێرانی نین. ئەوانیش وتیان: کامەیە بەڵگەت؟ منیش وتم: ئەوە نییە قانعی شاعیر دەڵێت:

هەزار ڕەحمەت لەوەی ئەیگوت لە ئێستاوە هەتا مردن
نە خەڵکی بانە ئێرانین، نە ساداتی ئەسڵ کوردن

بە خوێندنەوەی ئەم شیعرە پۆلیسەکان دەستیان بە پێکەنین کرد و وازیان لێهێنام.

**کاک ئامانج ژاژڵەیی گێڕایەوە، وتی:**

مەلاحەسەنی موفتی گێڕایەوە وتی: ساڵی (١٩٦١) مانگی خاکەلێوە، ڕۆژێکیان مامۆستا قانع پاڵیدابوو بە موحاجەرەی حەوشەکەی سەرای سلێمانییەوە، منیش

ڕۆژنامەیەکم کڕیبوو، بە دەم ڕێوە دەمخوێندەوە، گەیشتمە لای مامۆستا قانع. سەلامم لێکرد وتی: کوڕی خۆم ڕۆژنامەکەت چی نووسیوە؟ منیش وتم: قوربان بە مانشێتی گەورە لێی نووسراوە (عید نوروز لیس عیدالاکراد فحسب، بل عیدالعراقیین جمیعا) کە بە تەواوی عیبارەتەکەم بۆ خوێندەوە، لێی پرسیم: دەزانی ئەو(بل)ە لەو ڕستەیەدا چی دەگەیەنێت؟ منیش وەکو فەقێیەکی چالاك یەکسەر وتم: قوربان ئەو(بل)ە یانی نەورۆز هەر بە تەنها جەژنی کورد نییە، بەڵکو جەژنی هەموو گەلی عیراقە. قانعیش بە زەردەخەنەیەکەوە ئافەرینی کردم و یەکسەر ئەم دێڕە شیعرەی وت:

بـژی بەل بژی بەل	جەژنی حەڵاڵ کرد بۆ گەل

## خواناسی

ئەی خۆت بە تاق و تەنها بێ شوبهە و میسالی
دووری لە فیکری فیکرەت، بێبەش لە هەر خەیاڵی
زەڕڕاتی کەونی عالەم یەك زەڕڕە سادراتت
بوون و نەبوون لە تۆیە، تۆ ساحێبی جەلالی
بۆ عیشقی هیچ و پووچی، وەك من ڕەقیبی ئەمما
بۆ عیشقی وەحدەتی خۆت، سەرمایەیی ویصالی

حــــارث لـــــە فیکری تۆدا بێسوودە کۆششی ئـــەو

بــــە هانەیە تــــەجەدود (............) کـــە مــــاڵی[1]

پوچـــــە بوو فیـــکری (تـــوسی) ............... فــاعیل

.........................................................................[2]

هەوا ئەگەر ئەبەخشی، لوقمان و من چ تـــــەوفیر

بۆچ عەقڵی ئەو وەك بەدرە یا عەقڵی مـــن هیلالی

بێومزەعە، زاتی پـــاکت بێچوونە هەر سیفــــــاتت

خـــــــارج لـــە دەرکی ....، بـــێرێ لە رێی سوئالی

هەر کەسێ رووی لە تۆ کرد، پێی نا لە ئەسڵی مەقصەد

هەر کـــــەس لە تۆبە وەهمە، تۆیش بۆ ئەو لائوبالی

(قــــانع) دەریـــایە (ئـــــەمە) کــــۆتا بــــە لەم وتارە

نــــــــازانی وەسفی باری، بۆچ وا لە قیل و قــــالی

## لە بەختی من

لە بـــــەختی من مەلایەك هاتە گـــوفتار

جـــــنێوی زۆری نارد بۆ ساحیب ئەشعار

وتی یا شێخ بە تۆچی زەرب و تەقسیم

چ لازم، زانـــــــینی باتمـــان و خــــەروار

١ـ لە دەستنووسەکەدا نەخوێندراوەتەوە.

٢ـ لە دەستنووسەکەدا نەخوێندراوەتەوە.

قســــەی جـوگرافیاکـــان هەر درۆیــە
ئەمە سیحرە ئەڵێن پێی گەسری ئـەشعار
ئـــەگەر عیلمـــت ئەوێ مـردوو بشۆرە
چلۆن شۆرینێ وەك شــــــۆرینی مردار
لە سەر حیخێ لە پێشا رایبـکـــێشە
ئـــــەبێ راست رایبـکێشی میسلی رەشمـار
ئەبێ (ك...)ی بە هەر دوو دەس بـــدۆشی
وەکــــو بـــزنێ کـــە بیدۆشێ تەمەعکار
بـــە هێواشێ دەســـت بێنی بە سکیا
هـــەتـــا دەردا ئەوی خواردوویە پێرار
لە پاش شۆرینی چڵم و (گ...) و گمیزی
هەڵیسێنیتۆ هەر وەك ، ورچی سەردار
لە ساحیب مردوو ئەو وەختە بسێنە
لە حەق و زەحمەدا ، یەك روبعە دینار
وەهایە نانی مەردانە کە فـــەرمووم
دەخیلە ئەم وەسیەتە، نـەیخەیتە پێوار
وتم حەیوانی لایەعلـــەم بـــفامە
چـــــلۆن سونعیاتی چەرخی دەوار
لـــــە پێشا واجبە تەعلیمی دینی
لە قورئان و حەدیس و شەرع و ئاسار

ئەوەی ئەمرە بە جـــــێبێنە تەواوی

ئـــــەوەی نەهیەنەکەی هەرگیزبە ڕەفتار

بزانە مردن و میعـــــاد حـەقــــن

ئەمە مـــــەعلوومە ڕاستە جەنەت و نار

بە پێی ئەعمالی خۆت ، ئەدرێ جەزای تۆ

بە مـیزانا ئەکێشن جەمعی کــــردار

لە چاکە چاك و ، بەد بەد ، دێتـەوە ڕێت

بـــەقەد یەك زەڕە وننابێ لە ڕەفتــار

لـــە پـــاش زانینی ئەمر و واجبـات

بزانە چۆنە وەزعی چـــەرخی دەووار

لە چی پەیدا دەبێت هەوری بـــەهاری؟

لـە چی ئەشئەت ئەکا نێرگس لە گوڵزار؟

ئەبێ ئینسان بە ئاگابێت لــــە عالەم

لەچی تەشکیل دەبێت بەفراوی کۆسار؟

لـــە بـەرچی بەفر پان و تەرزە گردە؟

چیـیە نەعـرەی سەوعیق دێ لە ئەقتار

لە زستانا لە بەرچی سارد و سەخـتە؟

لـــە هـاوینا لە بەرچی گەرمە وەك نار؟

درەخت بۆ چی بەهاران بەرگی سەوزە؟

لـــــە پـــاییزدا ئـــــەمێنی ڕووت و بێـبار

(ك...) چـــــوار پێ ئەبێ تۆ شارەزا بیت
لە حاڵی ئەمریکایی و چین و تاتار
لە چییەوە وەرئەگیرێ گازی کـاربۆن؟
چلۆن تەرفیع ئەکات میللەت بە کردار
بـــەچی ئاوا ئەبێ خاکی وەتەنمان؟
بەچی دێهات بنەخشێنین وەکو شار؟
سووتت لازمە لەم بەزمە (قـــانع)
ئـــەوا دەورت بدەن یارانی خـــوونخوار

## ئەم عەسرە

ئەم عەسرە چ عەسرێکە کە هەر شامە بەیانی
ئەم قەرنە چ قەرنێکە کە هەر کوردە قـــڕانی
ئەم شینە چ شینێکە کە سەد شینی سیاوەحش
بــــــێزارە لە هەر زەلزەلە و شین و فغانی
ئەم زەنگە چ زەنـــگێکە لە مل کوردی فەقیرا
هەر لەحزە بە سەد ڕەنگە ئەڵێی دەنگی زڕانی
ئەم بەزمە چ بەزمێکـە لە شاران و لە دێهات
ڕۆڕۆیـە لە هەر ماڵێ کەوا کـــوردە زمـــانی
(مەنـسوور)ە لە سەر داری فەنا حەزرەتی ناجـی
ئـەم (ڕانـــە) چلۆن ژینی ئەبێ مەنعە شوانی

چۆن بێهونەر و سەرسەرییە (....) وەتەنمان

برۆانە چلۆن گەپیە حەلەب گەورە کەچانی

سەد حەیف کەوا (قانع) تەنها و ئەسیرە

غەمخۆری وەتەن تەنها ئەوە و جووتە کوڕانی

## گلەیی

بە دڵ، گوێڕاگرن تو خوا ئەیا ئەهلی سلێمانی

بەیاناتی وڵاتم کەم، لە پاش عەرزی سەنا خوانی

لە غورەی مانگی (ذیلحەججە) تەمی خەم خێوەتی هەڵدا

بەسەر میر و مەلا و شێخ و بەگ و سۆق مەریوانی

شکا شیشە، رژا مەی، هەڵفڕی مورغی فەرەحمەندی

بە سەرچوو دەوری ئیسراحەت لە دەس کارمەندی تارانی

خەجاڵەتین هەموو ئیشی ئیفاقی بەینی خۆیانبوو

کە قەسری (جەننەتولمەئوا) برا، عەیشی بە تاڵانی

ئەمە مەقبووڵی قانوونی تەعەصصوب چۆن ئەبێ ئێمە

زەلیل و ئێوە مەشغووڵی (....) انی کانی ئاسکانی

وەرن ئەی ئەهلی تەئریخی قەدیمی، بیر لەمەو پێش کەن

نەژادی کوردی چەمن دوورە لە رشتەی کۆنی ئێرانی

ئەگەر مردنبێ، با، وەك یەك، ئەگەر دەرچوونە وەك یەك بین

مەگەر ئێمە مەسیحین و نەژادی ئێوە عیمرانی

دەوای ئەم دەردە پڕ ئــێشە لە پێشا کۆمەکی عامە
لە لای مەئمووری بیر تیژ و هەموو زانـــــای سلێمانی
لە بۆ نەشری شکاتی میللەت، ئیمڕۆ لـــــە عالەمدا
جــەنابی زێوەرە بێشك وەکیلی کـــوردی ئێرانـــی
سکـــووتبــــی چاترە (قانع) لە ترسی ئەجنەبی، بۆچی؟
هـەموو ئیشێ ئەبەسرێتەو بە رەحم و لوتفی یـــەزدانی

## دەست پێوەگرتن

تۆ کە نـــۆمـاڵی بزانە ، خەرجی ماڵت چۆن ئەکەی
دەستەڵاتت نــانی وشکە بۆچـی مەیلی رۆن ئەکەی
رۆژێ، دەخڵت یەك قەرانـە و خەرجەکەت یەك روپیەیە
تێبــــــفکرێ بۆچی ئیشی بێسەر و بێشۆن ئەکەی
فۆتۆگرافێ دامەنێ با لۆرکە لـۆرکت بــــۆ نەکـــا
کـــــاکی خۆم بۆ ئارەزووی رادوێ و گرامافۆن ئەکەی
یا کە تۆ نەتخوێندووە و عـالم بە هیچ ئیشێك نەبووی
بۆچی باسی کیمیا و گـــازەکەی کاربۆن نــــەکەی
تۆ بەرە کۆنت نییە رایخەی لە ژێر خێزانــــــەکەت
بۆچی سەڵتەی ئالێ و شین و یا کەوای فاسۆن ئەکەی
کــــاکی کوردم بـــۆ لیباسی چلکن و بەرگی دڕاو
هێنـدە بێمەغزی کە سەودای شووشە عەتری بۆن ئەکەی

تۆیش وەکو (قانع) لە زۆر باری گەدایی لارۆ بوویت
بۆچی خـەرجی کاپیتان و زیتی مێجەرسۆن ئەکەی

## هەرکەسێك

هەر کەسێك شاهی پەرست، بۆ ئاخری ریسوا دەبێ
دانـیم و دەرهەم خەریکی مەخمەسە و غەوغا دەبێ
شـــــاهیدی ئـەم ئیدیعامە هەر لە شادا دیارییە
عــەدلی شـــاهی پەهلەوی کەی هەر وەکو کیسرا دەبێ
خەرمەن و مەحسوولی کێوی بێستوون هەر نالە بوو
هـەرگی تۆی مەجنوون بکێڵێ فیرقەتی لەیلا دەبێ
نەفسەکەت شەهوەتپەرستە بێتو گونچکەی لێگری
ئیش و کارت ئۆف لە چاوی سەلـمەو و عوزرا دەبێ
تیاترۆیە نـــــــەفسبازی، پارە بۆ چ بەر با ئەدەی
تـیاترۆ هەر کەس بچێ تیایا، ترۆ و ریـسوا دەبـێ
ماڵــە پیتێنی مــناڵە شەرت و بـــەیتی عاشقان
پـیاوی عاقڵ چۆن بە کاری هیچ و پووچ شەیدا دەبێ
حــورمەتم نــــازانن ئێوە ئەی کوڕانی کوردستان
پــاشی مەرگی (قــــانعێ) کەی قانعی پەیدا دەبێ

## وتم ئەی دڵ

وتم ئەی دڵ تەمەللوقکە بە ئەحکاماتی یـەزدانی
هەتا کەی ئارەزووی بێسوود لە (دارولیمحنەت)ی فانی

جوابی وا ئەداکردم وتی ئەحسەنتە نـوتقت کرد
وەلــێ بێمورشیدی قابل عیبادەت سەختە ناتوانی
لە بۆ تەعقیب، حەکیمی دڵ گەرام ، خەیلێ بە دنیادا
عێراق و شام و بەغداد و سەلاحیە و ســـــلێمانی
هەتاکو خـاکی عەبدالان کە جەنبی شەرقی کەرکـووکە
لەوێدا عـــالــمێکم دی (عیصـامودین)ی نوورانی
چرایە بۆ شەوی زوڵمەت، نەهەنگی بەحری تەوحیدە
عیمادەددینی مەحموودە و خەلیفەی غەوسی گەیلانی
نیشـــانەی عیززەتی وایــــە خوا کاتێ کوڕی پێدا
فـەتاحی پێ عەتا فەرموو، بە سوورەت بەدری تابانی
کە دەستی دایە پێنج تیر و سواری رەخشی گوڵرەنگ بوو
چ مەردێ جەرگی زۆر سەختە بوێرێ و بێتە مەیدانی
لــــە دەشتی نیمتیحانا شەهسواری تایەفە دەرچوو
وەلێ فایدەی چییە کوردە ، زەلیل و مات و بوحرانی

## گلەیینامە

کـــاکی شـــاعیر وا دیـــارە ئارەزووی مـەیدان ئەکەی
هەجوی شێـــری بێشەلانی کـــۆمەڵی کوردان ئەکەی
چیت لە دەست دەرچوو کە ئێستە وێڵ و سەرگەردانی بۆی
بـــۆچ بە نـــاحەق هاوبەشیی (...) پێ پان ئەکەی؟

سەد هەزاران نەوجوانی شێرەزای میللەت کوژران

ئێستە مەیلی ئیلتیامی (....) کوردان ئەکەی؟

خۆزگە مێشێ بوو لە ماڵی ئالی نەمیووب وایە کرد

ناری نەمروودی لە زێر چی مەخفی و پەنهان ئەکەی؟

شۆڕە سوارانی غەیوورم چاوی خۆیان هەڵبڕی

کاکە گیان تۆ چۆن خەیاڵی سەرکزیی کوردان ئەکەی؟

مارەکەی شێخ هۆمەرە زۆر چاکتر لە من حاڵیتری

دەردی دواکەوتووی وڵاتم، تۆ بە چی دەرمان ئەکەی؟[1]

مام و باپیر و برا و عەشرەتم کوژران و چوون

تازە سوڵحی حەربی بەینی ئادەم و شەیتان ئەکەی؟

بێرە مەیدانی سەداقەت پێم بڵێ کوێت ژان دەکات

ناوێری هەڵمەت لە کەر دەی، شەڕ لەگەڵ کورتان ئەکەی؟

## ئینقیلاب ئاخ ئینقیلاب

تەقەللوب چەن هەتیوت کرد بە ئینسان

تەقەللوب فەیلەسووفت کرد بە حەیوان

تەقەللوب چیت بە سەر قاجاری هێنا

تەقەللوب چۆن بەبات دا ئالی عوسمان

---

١ـ لە دەستنووسێکی دیکەدا ئەم شێعرە وا نووسراوەتەوە (تا بە کام روو باسی لەیلول ماڵی کوردستان دەکەی)

تەڵەللوب تۆ نەبی لای ئێمە چیبوون

گرۆی بەنگکێش و تریاکی خۆران

تـەڵەللوب ئیشی حیزی تۆیە (....)

ئەمیر هەوجن لەسەر لاوانی کوردان

تەڵەللوب زوڵمە ، تۆ ڕێوی ئەنێری

کە ئاغا بێ لە بێشەی شێری مەردان

تەڵەللوب من وەها ئیشم خـــرابێ

ترۆ، و بەدناو ئەبم تا خەتمی دەوران

## ئەمشەو

هەی هەی لە ئاسۆر زامانم ئەمشەو

گوڵگوونە بە زووخ زامانم ئـەمشـەو

قەڵای جوانیم خاپوورە ئـــەمشـــەو

بینایی دیدەم بێنوورە ئـــــــەمشەو

سەدای غولغولەم چوون سوورەن ئەمشەو

قابز ، بۆ ڕۆحم زەروورەن ئەمشەو

کێ بو دڵسۆزم ؟ کێ بو غەمخۆرم ؟

کێ نەوی لە باڵ سۆتەی بیمـارم؟

کێ بو یاسینم بخوێنێ دەمـــــدەم؟

کێ بو پاو و دەس ، بشێلێ بە هەم؟

کێ بۆ رووم کەرو لە قیبلەی ئیمان؟
کێ بۆ سەری من بنێنە سەر ڕان؟
ئەوسا کە قابز ببینم وەجهەم
کێ بۆ چۆڕێ ئاو بتکێنێتە دەم؟
کێ بۆ، بنەرو وەسیەتم دەسماڵ؟
کێ زاری کەرو هووناو وەڕووی خاڵ؟
جە دمای کۆچم کێ ئــەلوەدا بۆ؟
کێ شەیدای شیوەن ڕوی کەربەلا بۆ؟
کـــێ بمـــنێ وەبان تەختە شۆرەدا ؟
کـــێ ئـــاو بڕێزو وە کافۆرەدا؟
چێوەی سواریم بێکـــەس هوردارو
کێ بۆ جەنازەم وە گڵکۆ بارو؟
کێ بۆ دامبنیو نەپەردەی قەبرم؟
کێ بۆ واز کەرو توورەکەی سەرم ؟
تێکی هەڵپێکـــــا سزای گۆڕەوشار
کەرەمدار هەر تۆی غەفوور و غەفار

## پرسیارێك

لە سوختەی مەدرەسەی عیلمی موحەققەق
بگـــاتە دەستی شـــاگردانی ئـــەحمەق

سوئالتـــــان لێدەکـــەین ئەی بێتەمیزان

لە مەسنووعاتی رەبـــــی  فەردی موتڵەق

لــــە بەرچی بەینە بەینە رۆژ ئەگیرێ؟

قــوتب بـــــێگرتنە و  دایم مەعووەق؟

فەلـــەك ئایـــــا بە حەرفە، التیامـــــی؟

وەیا خود جەوهەرێکە مەحکەم و رەق؟

ئەگەر فەرقی هەیـە چۆن پارە نابێ؟

وە گەرنا فەخری عالـەم چۆنی کرد شـەق؟

دەسا رێکخـــــەن لــە بۆ ئێمە وەرامی

بەیاناتی حـــەسین و زۆر مــــــــودەققەق

بــــــە دینم (قانعا) خۆت مەکوتە جەوتە

دڵیان هەر پیسە لێت شێخانی مــــــەترەق

## نامەیەکی دۆستانە

کاکە دەستت ماچئەکەم گوێ راگرە بۆ عەرزی حاڵ

تا کە تەقدیمی حوزوورت کەم تـەواو حاڵ و هەواڵ

چوومە بەغدا بۆ تەداوی و زیــــــارەتی پاکانی دین

کەوتمە گێژی گەڵبە گەڵبە و شنەو شنەو، و فیل و فاڵ

دەوریـــــان لێدام بــە جارێ کۆمەڵێکی بێپــــەتی

چـــــونکە زانیم هیچ نەزانن شەرمەسار و ئینفیعال

غــیرەتی کــوردیم بزووت و یادی تۆم هێنایە دڵ
کــردمۆ بابی نیزاع و کەوتمە سەر جواب و ســوئال
بــەحسی تەوحیدی خوات و بیعثەتی خەیرولبەشەر
هــاتە بازاڕی تەکەللوم کەوتە مەیدانی جدال
هیچ درۆ ناکەم لە سایەی هیممەتی عالیتەوە
بووم بە سوڵتانی کەلام و ئامری موڵکی مەقال
(قانعا) سەیر و سەفای ئەم مەعرەکە لەفزەن بـلێ
بۆ حوزووری خۆشەویست و ساحیبی عیزز و کەمال

## فوڕی عالەم

لە داغی دەبدەبەی خەڵکی دڵم پــەستە و پەریشانم
لە ئیستیقلالی فولرووتی (....) وا دیدە گریانم
فوڕی عالەم بەسەر ئەحواڵی ئــەم کوردە ، لە بۆ عەقڵی
لە ئاستی گەورەمان شوانێک ئەڵێت من شاهی خاقانم
ئیتر ناڵێت وە فەضضەلنا عەلا بەعزێ خوا فــەرمووی
ئەڵێت من سەد ئەوەندەی ئەو رەئیسم ئــەرجی بێنانم
(ئەم هەڵبەستە لە دیوانەکەدا ناتەواو بوو)

## ئینقیلاب

ئینقیلابە فلتحی هەر مەخــزەنی رازی نیهان
ئینقیلابە وەك ( ئەرەستوو ) دافعی دەردی گران

گەر نەبێ ئاشووبی چەرخ و ئینقیلابی رۆژگار
تا قیامەت بۆ کەسێکبوو سەربەسەر موڵکی جیهان

شۆرەتـــــی نادر بمێنێ پەهلەوی بێرەونەقە
میللەتی میدیا بە هێزبن چۆن ئەژین ئێرانییان

گەر لە هیممەت ئینقیلابا تۆ نەبێ ئەهلی حیجاز
چۆن ئەبوونە حوکمڕانی مەسنەدی ئەنوشیرەوان

هەر لە سایەی ئینقیلابە وا عەرەب سەربەست ئەژی
(یەثریب بەطحاء) ئەجاتیان بوو لە نێزەی تورکەکان

خزمی ئاسوری کە تێکەڵ عەشرەتی کلدانی بوون
[1]................................................................

دەستی مووسا گەر بمێنێ نەفخەیی عیسا چییە
ئەعرەتی رۆستەم بیێ بۆچ وا کزە مازەندەران

ئینقیلابە بۆ فەقیر جێگەی ئومێد و ئارەزوو
ئینقیلابە بوو بە باعیس ئاه و دەردی کوردەکان

کۆنە شاری دێی ئەوێ ئەوسا کەجێی (زوححاك) بوو
ئیش و کاری ئینقیلابە ئێستەکەش ، چۆڵە و وێران

جا کە وا بوو ئینقیلابە واسیتەی گەورە و بچووك
هەر بژی ئاشووبی چەرخ و ئینقیلاباتی زەمان

(قانعا) ئومێدی تۆ هەر ئینقیلابە و هیچی تر
بەڵکوو ، کەرتێ[1] رێکەوێ یەك ئینقیلابێکی گران

---

1ـ لە دەستنووسەکەدا نەخوێنرایەوە.

## ئیستیخارە

بە عەزمی ئیستیخارە دوێنێ لە بانگی شێوان
نووستم کوتوپڕی دیم پیاوێکی ئەهلی عیرفان
جوان چاك و ژیر و عاقل ئەلفاضی زۆر موڕەتتەب
فەصیح و ڕەند و زیرەك نووریین و صاحێب ئیمان
پرسیم لێی ناوت چییە و کوڕی چ میللەتێکی؟
تورکی یا خۆ عەجەمی، بۆڵغاری یان لە کوردان؟
جوابی وەها ئەدا کـــرد لە خاکی پاکی کوردم
بەریم لە ئەمریکایی و دوورم لە قەومی ئەڵمان
کـــاوەم کە شۆرەتم بوو لە سونعەتی زرێدا
کوشتم بە جارێ میللەت زوحاکی دوور لە ئیمان
وتـــم تـــو خـــوا فلآنی تـــۆ شارەزایی حاڵی
بۆچی نەبوو لە کوردان پیغەمبەرێك لـە بۆمان؟
ئـــاهێکی ســـاردی کێشا وتی وەڵلاهی (قانع)
لـــە کوردی قوڕبەسەردا زۆرتر ، بوون ڕەســوولان

## ئەمەکی خاك

پیاوێ بوو سێ کوڕ سواری بوو
دەولەتێ زۆر و بێژمـــــاری بوو

ـ کەرلێ: کەرەتێ، جارێکە

چەندە دوکان و قەیسەری و ئەملاك
کیسە پارەی دووسەد هەزاری بوو
دوو ژنی بوون کە یەك لە یەك چاکتر
سەد و سی هێسری قەتاری بـــوو
زیاد لـــەمە زێڕی دانراوی هەبوو
سەد و پەنجا نەفەر توجاری بوو
ئەمە سێ ساڵە خۆم لە بیرم دێ
کە چلۆن ئەگبەتی سواری بـــــوو
بوو بە خوێنخۆر و دوژمنی وەتەنی
هەم لەگەڵ دوژمنی قەراری بـــوو
دەبـــــەکی خاکەکەی وەهاگرتی
هـــــــەر وەکو (قانعی) فیراری بوو

## چوومە بەسرە

وەتـــەنی کوردەکانە پـــڕ نیعمەت
وەتەنە دلك و بابی پـــڕ شەفەقەت
بۆ کەسێك تۆزێ کـــاسبی تیاکـــــات
میوەیێ زۆر و نـــــــانێ بێمیننـــــەت
ئـــەجنەبی کەی لەگەڵ کوڕی خەڵکـــی
ئـــــەنوێنێ موحیببەت و رەئفـــــەت

چوومە بەسرە بە عەزمی سەیروسەفا
کــەوتمە گێژی میحنەت و زەحمەت
پــــەلی گرتم لە بەسرە مەنمووری
ولی جاسووسی ئەی عەجەم هـەیئەت
بردمی کۆڵە خاکی پێ کــێشام
ساڵە وەختێ بەسەد غەم و میحنــەت
تاکو هاتن حەجاجی کوردی عـێراق
حاجی و دین دروست و پاك طـینەت
بە نـفووس و بە پووڵ و کۆمەك و قەول
هــــاتمە دەر لە بەندەکەی زەحمەت
(قانعا) تۆبەبێ کە دەفعەیـــــــەتر
نەچمە (مەکە) لە بۆ حەج و تاعەت

## شێخی من

شێخی من نوقڵ و نـــــەباتە، پیری من نان و کەباب
مەیلی من ئەسپ و تفەنگە نـەك لە سەر چەنگ و روباب
مێشکی من مێشکـی بە هێزە و غیرەتم وەك رۆستەمە
ئیشی من خزمەت بـــــە خاکە و فکری من قەهرە و عیتاب
ناوی مــــــن خەنجێرە، جـــەرگی دوژمنی خـــاکی وەتەن
دۆستی من کوردی غەیوورە و دوژمنم زومرەی غـــــــوراب

کاکی من نـــاوی کوتەك مەغزی عەدوو دێنێتە دەر

بابی من رۆحی وەتەن عالەم بە هەر چاك و خراب

مـــاسی خـــۆری (....) و بـــەنگفرۆشی (....)

کەی لە خاکی کوردستانا دێتە سەر رێگەی صـەواب

هێندە پیشەمخواردەوە وەختە بە جارێ شەقبەرم

شاهی دڵ وەك شـاگرە تـــاکەی ئەسووتێنێ حیجاب

با هەموومان پێکەوە دەستمان بە دەست یەکتر گرین

شۆڕ بەهێنە مێشکی کوردان هەر وەکو ئەشئەی شەراب

## شاهی عەلائەدین

قـانع لــە مـەریوان فـەلێ دەیێـت لــە جـەنگی یەکـەمی

جیهـــانیدا لەبێتـــە موجـــاهید و لـــەو کاتـــەدا ئـــەم پارچـــە

هەڵبەستەی بە سەر شیخ عەلائەدینی بیارەدا وتووە.

شێخی ئەصحابی کـەرەم شاهی عــەلائەدینە

حەزرەتی والی نـــەعەم شاهی عەلائـــەدینە

وەر ئـەخۆش و دەردەدار و بێنومێدی ئاخـــری

مەلجەئی جوملەی ئومەم شاهی عەلائەدینـــــە

چ لـە دنیا چ لە عوقبا هـــەر ئەوە فەریادرەســم

دافـعی دەرد و ئەلەم شاهـــی عـــــەلائەدینە

بەشربە خـــاکی بیارە و خـەڵکەکەی صەحابەیە

فـەخری ئەعراب و عەجەم شاهی عــەلائەدیـــنە

جەیشی مەنسووری مەلەك بەزمگەهی عەرشی بەرین

ساحیبی سـەیف و عەلەم شاهی عەلائـەدینە

کێ ئـەڵێ کەشفی نەماوە بـا ببینێ زاتـی شێخ

واقفی لەوح و قەڵەم شاهی عەلائـەدینە

کامی مونکر نەسەفەم زۆرە لە بۆ بێ عەقڵێت

مەعدەنی فەیز و وەهەم شاهی عەلائـەدینە

( قانعا ) لازمی ئیرشاد نییە مەزهەبـی حەقم

بـاعیـسی رەفعی نەدەم شاهی عەلائەدینە

## سەرخۆشم

سەرخۆشم پەروام نییە بێباك ئەڵێم با بێ شەراب

سێوی ترش و پرتەقاڵ و هەم هەنار یا خۆ کەباب

بۆ مەزەی مەی بێنە ساقی لازماتی نۆشی مەی

مەجلیسی کەیفم تەواو کە بێنەدی ساز و روباب

بە پەلە ، سووڕێ بدە ، با سەرگرانبن مەجلیسم

شـۆڕشێ پەیدا بـکە دڵ بێتە حاڵی ئیلطیراب

بەزمی کەیخوسرەو بیناکـە تا سبەینێ سـاقیا

بیرە ویسـکی و مەزە و قۆنیاخ و ئارەق هەم شەراب

گشتم بۆ ئامادەکە تـاکو بە وێنەی ئـەنومران

سـەیری ئەم دنیایە کەم لاچێ لە پێش چاوم حیجاب

چوون منەوومر شارەزای سەرکەوتنن تەرفیع نـەکەن

شەرتی ئەووەڵیان شەرابە و کەیف و سەیران و حیساب

عومری بێهوودەم بە سەر برد ئێستە بیرمکـــەوتەوە

هیچ نەزان بوون باپیرانمان ماڵ سووتاو و خانە خراب

( قانعا ) تۆش خۆت منەوومر کە بە شیعری فشقیات

گـوێ مەدە هەرگیز بە دنیا دڵفەرەح بە و کامیاب

## لە دیتنی خشتێکدا

ڕۆژێ لە ڕۆژان بێکار و بــەتاڵ

ئاسوودە و ڕەحەت لە نەبوونی ماڵ

بێیار و یاوەر بێـــبڕوا و هـــاودەم

بێرەفیقی ڕۆژ دەروون پڕ لە غەم

پاڵدام وە سەرین حەریری گـوڵڕەنگ

بیر دام وە کردار چەرخی شەوە زەنگ

نواڕیم زەمزەمــەی جاران کـــۆتایە

بنچینەی شــــادی گەردی بەبایە

مزگەوت بێرەونەق، دیوەخان وێــران

ئــاوایی بێشەوق نۆکەر سەرگەردان

بێتــار کـەوتوون دوو تەپڵە و دەهـۆڵ

تــانجی بێسوار ڕاوگە چۆڵو هۆڵ

عەشایەر سەر کــــز تایەفە بێدەنگ

میللەت میللەتان لێوزەرد و بێڕەنگ

وتم چاک وایە تۆشە پــەیداکەم

ئــیقلیم بگەڕێم سەیری دنیاکەم

هەتا بــزانم گەردووناى گەردوون

کێی کردووە بەشا، کێی خستووەتە توون

کێ لە رەحمەتە و کێ لە زەحمەتە

کێ خاوەن شەئن و کێ لە حورمەتە

نەجیب نا نەجیب نانەجیب، نەجیب

توخلی خاوەن ملك خاوەن ملك غەریب

کەشکۆڵم هەڵگرت عەبام خستە شان

زرێ و چوار ئایین رەسمی دەروێشــان

دەف و قەبارە و دووحاچە و شمشێر

مەتــــرەقی چلچــــــڵ کڵاوەی دلێر

کەلپۆس و عەسا پۆس لەنگی نەکۆڵ

قاپــقاپ و دانەی شاخنەفیلی چۆڵ

جامی چل کلیل پێنج پەنجەی زەڕین

تەختەی سەدلاقەت سەددانەی بەردین

خەرقەی سەدپارە و تاجی گەدایی

کوولەکەی فەقر و شێوەی ڕیسوایی

بەیداخی عەشرەت شەجەرەی شێخان
دەیەرەی میحنەت حەمە پاڵی شان
دەلایلی خێر قورئانی نووریـــــن
قوتو و قەڵەمدان نەسبابی نـــــووسین
هەم سەفەرنامە و بەیاز و دەفتـــــەر
بەرد و بەردنەسێ نەساسەی سەفەر
بە ساعاتی خاس رۆژی مـــوبارەك
نێوەڕۆی جومعە گـــرتم تەدارەك
گا بە کەیفخۆشی، گاهی بە گریان
گا بـــە سۆزی دڵ گۆرانیی شێخان
گا شیعری شیـــرین شێخی مەولەوی
گا گوریزی حەق مـــەولای مەسنەوی
گا روو بە مەقسەد گا بۆ دواوە
گا دەم بە خەندە دەس بە دوعاوە
بەم نەوعە چەن ساڵ خەریك سەیران بووم
گاگا لە دێهات گـــا لە شاران بووم
چەن چۆڵم تەیکرد چەن دێ و چەن شـاران
چەن مەنزڵگای شەو لە بەر موغاران
چەن تەماشای تاق برۆی سێومنگی
چەن قەمرە زولفان وەك ماری جەنگی

چەن تاقی زەرباف چەن گێلگێلەی سوور

چەن کوڵمی بێغەش ساف وێنەی بلوور

چەن گەورە کچان غەزاڵی سەرمەست

چەن هەرزەکاران دەمانچە بە دەس

چەن دڵی وێرانە چەن دڵی ئاوەدان

چەن قەڵای کــۆنی دەسەڵاتداران

ناگاە لـــە تەقدیر خوای لامەکان

ڕێم کەوتە چۆڵی دەشت و بیابان

نە دار بوو، نە ئاو نە پووش نە گییا

غەیری زاتی پاك خۆم تاقی تەنیا

خەیاڵێ تیفکرام نیگامکرد لـــە دوور

کەوتە بەر چاوم لەتە خشتێ سوور

لەدیتن ئەو خشت گەلێك عەجەب مـــام

خشتم بەرزۆ کرد بە سەد ئیحترام

وتم یــــا کـــەریم عەللامولغـــیووب

ڕەحمان و ڕەحیم غافیرە ذەنـــووب

ئەمە هی کێیێ و کـــێ دروستیکـــــــرد

کێ نایە چین ماڵ، کێ لە دوای مرد

کێ خستییە قاڵب کێ شێلای بە ئاو

کێ نایە کوورەی بڵێسەی بـــە تاو

کام بەنای ژێری چەرخی رۆژگار

نایە دیواری کام کۆشك و تــــەلار

بە فەرمانی خوا هـــاتە گفتوگۆ

وتی ئــــەی قانع گێلی رەنجەڕۆ

هـــەرچی ئەپرسی بێکەم و زیاد

بۆت بەیانئەکەم زۆر بە خاترشاد

من خاکی کــەللەی دە پادشاهم

پادشای بێباك حیشمەت نیگاهم

ئەووەڵ ئەسکەندەر شاهـی ذولقەرنەین

دووەم شا عەباس سێهەم شـــا حسەین

چـــوارەم کەیقوباد پادشای کەیان

رەشید و سەخی خاوەن سفرە و خوان

پێنجەم شای عەزیز عەزیزی مەرغووب

خریداری پاك یوسفی یـەعقووب

شەشەم کەیومەرس حەوتەم ئەنوشیروان

ئـــیحیاکونەندەی بنچینەی کوردان

هەشتەم ئەردەشێر پاشای ساسانی

نۆهەم ئۆردووان گەورەی ئەشکانی

دەهەمین نەمرووود ئاسووری ئەژاد

پادشای بێدین دوور لە حـەق و داد

نۆبەیان ڕۆیی و دەورەیان تـــەواو

مەغزیان لەگەڵ خاکا تێکـــەڵاو

زەڕە زەڕە بوون ، بوون بە غوبارێ

کەللەی هەر پاشا کەوتە دیـــارێ

بە ئەمری خوا پادشای بێعەیب

شەماڵ هەڵیکرد لە کاخانەی غەیب

لە خاکی هەر یەك تۆزێکی هانی

تـــێکەڵیکردن زۆر بـــە ئاسانی

لە تەقدیری حەق خوای لایەنام

لـــەو تێکەڵ بوونە من دروستکرام

سەد ساڵ لە سەر یەك من خشتی کاڵبووم

لـــە خۆتەن زەمین بنەڕەت ماڵبووم

من بوومۆ بە خاك هەر وەك ئەوەڵ جار

بە ئیزنی بێچوون پادشای غەففار

لە دوای ئەو ماڵە کرام بە ئاجوور

نرامە دیوار قەڵای سەلم و توور

هەتا سەلم و توور تەواو بەر باد بوون

لە بازیچەی چەرخ میحنەت ئازاد بوون

ئێستە یـــادگار شاهانی دەورم

لـــەم بیابانە پـــڕ جەفا و جەورم

زانیم ئەم دنیا بێبەقا و بەمینە
قاتڵی هەزار ئیمام حسەینە
کوانێ دیاکۆی شاری هەمەدان
کوانێ رۆستەمی دەشت مازەندەران
کوانێ ئەفراسیاب کوا خاقانی چین
کوا پاڵەوانان لە سەر رووی زەمین
کوانێ فەرهادی هونەرمەندی کورد
کە لە رێی عیشقا رۆحی فیدا کرد
حاڵی من وابوو ئەوەڵ تا ئەنجام
عەمرم تەواو بوو باقی وەسەلام

## مێژووی کۆچی ئایشێ خانی نەقیب

لە ئالی ئەحمەد (عایشە) لە یەك پێی نایە دنیاوە
سەدەی چواردە لە حەفتا و دوو چرای ئامالی کوژاوە
بێحەمدیللا چ بێباکە لە دەشتی مەحشەرا چونکو
سوپەهـ سالارە جەددی شافیعی کەونەینە لای خوارەوە
١٢٧٢ی کۆچی مانگی

## نامەیەك بۆ جەنابی شێخ عوسمانی بیارە

پەرێشانیی دڵم ئەمرۆ بە هیوای لوتفی عوسمانە
کە خاکی مەقدەمی بێشك دەوای دەردی دڵ و گیانە

ئەگەرچی هەر دیارنیم و بە چەشنی زەڕڕە نابەهەدەم
بەڵام دەرکەوتنم قوربان بە شوعلەی شەمسی تابانە
ع خۆشە هەڵتروشکانێ لە بەر قاپیی مواردی تۆ
بە شەرتێ تۆش بڵێی یاران ئەوە یارۆی مەریوانە
مەلا نازی بە عیلمە، سۆفی فەخری ویرد و ئەورادە
منیش ئومێدی دلرەبنم لە لای تۆ لوتفی جارانە
مەفەرموو بۆ ئەمەت ئەڵبەت نەماوە شۆر و ئیخلاسی
بزانە مانیعم پیری و خەتای سەرماو و بارانە
لە بیرم دێ کە ئیمزام ( قانع لعوسمانی ) دانا بوو
بڵێم چی ئێستە بەدبەختم ئەڵێن مونکیر بە شێخانە
بە چاوی باطنی بڕوانە بۆ دەروونی من
ئەزانی (قانع)م مەحکەم لە سەر ئەو شەرت و پەیمانە
موخلیسی قەبووڵنەکراو: قانع

قانع لە حەشاری کەو کوشتنا کە کۆڵێتیشی پێدەڵێن، بە پارچە هەڵبەستێك نامەیەك بۆ شێخ عوسمان ئەنووسێت، بە داخەوە ئێمە نامەکەی قانعمان لا نییە، بەڵام ئەم شیعرانەی خوارەوە وەڵامی ئەو نامەیەی (قانع)ن.

## وەڵامی شێخ عوسمانی بیارە بۆ قانع

هۆشیاری حەشاری خێرەدی دەرکی ئەحیران
صەیادی کەوی زیرەکی مورغابی سبەینان

چەند خۆشە سبەینانە کە گوێ دەگری لە دەنگی

نەززارە دەکەی خاڵی مل و لەنجەیی جەیران

ئەوکاتە کە پێکات بە پەیکانی خەدەنگت

یا ڕەب ئەشکێ پەنجەیی سەر ماشەی شێران

بیکە بە کەبابی فڕنی کوورەیی سنە

سینەم کە شەرارەی کوورەیە و لەهەبی نیران

نانێ کە چزەی دێت و پڕوزەی سەری سێخی

شێخی، بە ئەزەر بێنە پڕوزەی دڵی بریان

چوون شوبهەی کزەی جەرگی منە زوو بکە یادم

یا ڕەبی هەموو صەیدی تۆ بێ تەیری مەریوان

پۆل پۆلی کەو و قاز و قولنگ، سۆنەو و کۆتر

گرۆدەیی دەمداوی تۆ بێ کێوی شەمێران

هەر چەندە کە ئەمنێری بەشی من نیوەیی ڕانێ

هەر بەو خەبەرە قانعەدڵ، مەیلی بە سەیران

چ بکەم لە دڵ و تالیعی کە چ ڕەوتی زەمانە

من مامەوە کەم بەخت وەکو خانی (سیپران)

## ملکی وێرانە

ملکی وێرانە عەزیزم قەت بە کەس نادا ڕەواج

تۆ ئەبی ئەی موددەعی ناحەق لە من ئەستێنی باج

لێمگەڕێ ئەسپابی ئۆمالێم لە بۆ خۆم پێکوونێم

بم بە ساحیب عەسکەر و قانوونەکەی کوردی مەزاج

ئەو زەمانەیێ ، بە یەك (پلتە) جەنابت دەرئەکەم
یان بە مەیلی خۆت ، ئەکێشم تەکلیفی باج و خەراج

گوێگرە با پێت بڵێم زۆر چاك لە بەندە تێبگە
من کوڕی کوردی ئەزادم قەت بە کەس نادەم خەراج

پێغەمەر فەرموویە بێژن کێوێ چوو بـــۆ کێوێتر
بەحتەمیل ئەمما بزانن ناگۆڕێت خـــولق و مـــەزاج

( فائما ) کوردان ئەگەر ئێستا کە تەرە تێرە بـــن
دێنەوە سەر فکری کوردی کاتی خۆی رۆژی عیـــــلاج

## ئەم میللەتی کوردە

بابی هەموو ئەوزاعی مەقـــالاتی خیـــتاب
شیرینتریـــــن گوفتاری سوئالاتی خیتـــــاب

یەکیەك بە هـــــونەر خاوەنی عەقڵێکە ئەزانن
[1] ........................................................

سیـــــحر و هونەری بابلی هارووتی خرابـــــە
تا رۆژی ئەزەل وا لە مەجازاتی خـــــیتاب

........................................................
[2] ........................................................

1ـ لەدەستنووسە کۆڵەکەدا نەخوێنرایەوە، داوای لێبوردن دەکەین.

2ـ لەمیش نەخوێنرایەوە.

ئەم میللەتی کوردانە کە وەها بەند و ئەسیرن

بێ عیلمی و جەهلە لــــە گەراماتی خیتاب

ئەم عەسرە کە مەشهوورە لە عاما، بە ویقایە

نەیدیوە لە عومری گوڵی بـــــاغاتی خیتاب

## مژدە

با سپیبێ لۆکە کۆنە چۆن ئەبێ هەرگیز بە عاج

شیشە با پان و قەوییێ چۆن ئەکا فەرمانی ساج

بـــا ، بە ریش پرتان و پۆ بێ دانیشن بیگرنەوە

دەوڵەمـــەنکەی رای ئەخا هەرگیز لە جێی دیبا و دەواج

دژمنیش بـــا ئیتیفاق و تـــــۆپ و تەیارەی هەبێ

چۆن ئەچێتە رووی سوارەی کوردەکان رۆژی عیـــــلاج

دوژمنـــــان ئێوە و خـــواتان مۆڵەتێکم پێبدەن

بێرە سەیری بەزمگاهی مەعرەکـــــەی باز و دوراج

کەی لـــە ئەوەڵ دەفعەدا وەك من کز و بێچارە بووی؟

من ئەبووم بۆیە جەنابت بووی بە خاوەن تەخت و تاج

مژدە بێ ئەی قانعا کوردان ئەگەر گشت لێنـــەون

جا لە باتی سەد هەزار بن سەهلە ئیش، ئەهلـــی ( ... )

## تێکهەڵکێش

من لـــە دەشتی فیرقەتا بۆ عاشقان

لب چشمـــــــم اندر رهش کردم سبیل

پێی لـە خوێنی عـــــــاشقانا گوڵگوڵە

آنـــــکه کشتی راند بر خون قتیـــــل

ڕێی ویسالی هەر لە من پەنـهانئەکا

ضلني فيالعـــشق من يهـدی سبيـــل

واعیـــزا ڕیشت برن بۆ وەعـزەکەت

راحــــتی فــــيالراح لا في سلسبيل

یا بـە دڵ تۆ ئاگری عیشقت ئەوێ

ورنـــه از آتش گز رکن چون خليل

یا لەگەڵ فیلانی عیشقا یەك مەبە

یــــا بنا کن خانهای در خورد پیل

یا ئەبێ نەتبێ خەیاڵی هـــاتنـەوە

یا منه پا اندرین ره بـــــــیدلیل

کاکی کوردم حاڵەتی کوردی عەجەم

همچو مور افتاده زیری پای پیل

( قانعا ) ماڵ و منداڵ و عیزز و جاه

باد و هر چیزی که خواهی زین قبیل

## پێنج خشتەکی لە سەر شیعری حافظ

زامـــــدارم بێنـــە لای من الغیـاث
عـــاشقم سـووتـــاوی جانان الغیـاث
چۆن بە لوقمان دێتە ســامان‌الغیـــاث
( درد مـــــا را نیست درمان‌الغیاث )
( هجر ما را نـــــــیست پایان الغیاث)

تاری زوڵف، تەیری دڵی کێشا کەمـەند
لە شکری خاڵت منی هێنایە بـەند
کێ وەکو من وایە ئەمڕۆ موستەمـەند
(دین و دل بردند و قصد جان کنند)
(الغیــــــاث از جور خوبان الغیاث)

مەنع و لۆمەی من ئەکەن کورد و عەرەب
پێم ئەڵێن ئـــەم شێتە بێمەقڵە و ئەدەب
بێخەبەر لەم دولبـــەرانەی خۆش لەقەب
( در بهـــــــای بــــوسه جانی طلب)
(میکـــــنند این دلستانـــــــان الغیاث)

گوو بە یـــاڵی پەلکە شۆڕی چاو کلان
هەم بەهـــوودی، ڕیشەکانی کەرملان
خۆ گرفتارم لـــــــە ناو قاڵ و قولان
(خون ما خوردند ایـــــن کافر دلان)
( ای مسلمـــــــانان چە درمان الغیاث)

من لە داغ بێگانەکانی بەد ئەسڵ

بەڵکوو تەوقی تەعنەمان لاچێ لە مل

هەڵمەتی مەردانە دەن ئەی کوردەگەل

( داد مسکینان بـــده روز وصـــل )

(در شب یلدای هجـــران الغیاث )

واعیزی ناشارەزای خـــاوەن حەسەد

تیری تەعنە و نێشی لـۆمە و زوانی بەد

داغ و دەردم زۆرە کـــاکە بێمەدەد

( هر زمانم دردی دیگر میرسد )

( زین حریفان بر دل و جان الغیاث )

کەس نەبێ وەك من زەلیل و دڵخـــەزەن

خوار و سووکی ناو رەفیقی ئەنجومەن

قانعیش سووتاوە ئەمڕۆ بۆ وەتـەن

(همچو حافظ روز و شب بی خویشتن)

(گشتـــەام سوزان و گریان الـغیاث)

## تێکهەڵکێش

گەر لە لای تۆوە بە عومرم دیم خەتایی رەفت رەفت

( ور ز هنـــدوی شما بر ما جـــــفایی رفت رفت )

تیری برژانگت ئەگەر زامی لە دڵ کـــــرد چی ئەبێت

( جـــور شاه کامران ار بر گـــــدایی رفت رفت )

تاقەت و زەحمەتکێشانێ لازمە وەخـــــتی مراد
(هر کـــــــدورت را کە بینی چون صفایی رفت رفت )
گەر بسووتێم مـــــن وەکو کوردی لە شەوقی ئەو دەڵێم
( گـــر بلای بـــود بود ، گــــر خکایی رفت رفت )
گەر ، دڵم غەمباری عیشقی رووتە بمرێ لایقـــە
( ور مـــــیان جان جانان ماجرایی رفت رفت )
حاکمی کـــوبرا بپرسێ بۆ قەصاصم پێی ئـەڵێم
( گـر میـــان همنشینان نـــاسزایی رفت رفت )
(قانع)یش وەك حافظە مەنعی لە مـــــەیخانە مەکەن
( پـــای آزادی چـــه بنـدی گر بە جایی رفت رفت )

## شینی رەزاشا

حەسرەتا بۆ مەرگی تریـــــاکی گڵاو
مەفخەری تـــرپاکیانی میانـــــدووئاو
ئەکبەر نـــاباد دوور لە تۆ بێرەونەقە
رووسپی بـێبەرگ و نانە و بەشبڕاو
مشتـەری و شاگردی ناو مەیخانەکان
بۆت زوبرن سەر بە قوڕ هیوا نـەماو
بۆت پەرۆشن دڵ بە خەم شیوەن ئەکـەن
بەنگفرۆش و بەنگکڕ و دەمـــڵەك دڕاو

شین ئـەگێڕن زۆر بە کوڵ بۆ مـردنت

پۆخڵ و بێقیمەت و فنگ هـەڵچڕاو

جـــەردە و تاڵانکەرانی بێرەوشـت

دەستە پاچە و سەر کزن ئـەوڕۆ شکـــاو

بێشعوور و سەرسەری و حـیز و تەرەس

بۆت ئەنۆشن شەربەتی مەرگ و زووخـــاو

ڕۆژی مـــەرگت ڕۆژی جەژنە بـــۆ وڵات

بەزم و ئاهەنگە لە ناو پیاوانی پیـــاو

پۆل بە پۆل گەورە کچـــان و شۆڕە ژن

وا لە سینگ خۆیان ئەدەن عـــەتر و گوڵاو

.................................................

ماشەو و مـــەنقەڵ خوماریان دێت لە چاو

ساڵی تۆپینتم لـــە شاپوور ویست وتـی

(کەر کە تۆپی ڕایدەکێشن بۆ کەنداو)

١٣٦٢ی کۆچی مانگی

## قوتابیی زیرەك

من منداڵێکی بچووکی کـــوردم

مـــــامۆستایەکەم وا فێـــریکردم

هەموو بەیانی کە لــە خەو هەستم

پاك ئەشۆم چاو و ڕوومەت و دەستم

بەفر و با ، نەبێت سەریشم نەشۆم
ئینجا بەر چایی چی هەبوو ئەیخۆم

بە بەرگی مەکتەب لەشم ڕێکئەخەم
کتێب و دەفـتەر لەگەڵ خۆم ئەبەم

بێباك بە خۆشی بۆ مەکتەب ئەڕۆم
رەوانمکردووە دەرس و دەوری خۆم

ئەچمە ناو مەکتەب لەگەڵ رەفیقان
گۆرانی ئەڵێم یاریش ئەکەم جوان

لە وەختی دەرسا ئەچمە دەرسخانە
لە لام خۆشترە لە سەد چایخانە

گوێ لە دەرس ئەگرم ئەیکەمە بەرم
ئەیشینووسمەوە لە ناو دەفتەرم

جومعانیش سەری خزم و دۆست ئەدەم
بە خۆشی و سەیران بە سەریئەبەم

بۆ لەش و دەست و زبان هەمیشە
پاکڕاگرتنم کردووە بە پیشە

حورمەتی داك و باب و کەس ئەگرم
چاکەم کردووەتە پیشە تا ئەمرم

لە مەکتەب فێر بووم ئەم رەوشتانە
مەکتەب سەرچاوەی عیلم و عیرفانە

ئاوا بێ مەکتەب جێگەی خوێندنە
شوێنی تەربیەت چاک وەرگرتنە
بۆی مامۆستام دەرسم ئەداتێ
ئەو ئەمگەیەنێ بە گشت ئاواتێ
ئاواتی چاکە بۆ خزمەتکردن
بۆ گەل و وەتەن بەرەو پێشبردن

## ئەی فلس

ئەی فلس رۆحی رەوانم تۆی پەنا و پشتی هەژار
دەستگیری عالەمی مردوویش دەخەیتە ئیش و کار
نەك منی پەرکەندە نەمزانی بە راستی قەدری تۆ
زاهیدیش لام وایە بۆ تۆیە کەوا ئەخزێتە غار
ئەی فلس لای هەر کەسێك بی هەر وەکو لێفەی قەوی
دایئەپۆشی گەر بێ عەیبی بە خەروار و تەغار
ئەی فلس گەر تۆش نەبی بارگیر کز و داماو ئەبێت
تێر لە کا و جۆی گەر نەکەی لۆقەیشی نابێ تا بە غار
چەند کەسم دی من لەمەو بەر تۆی بوو ناوی ئەبوو
بۆت حیسابکەم ئێستە ئەشرافن هەتا دووسەد هەزار

## گۆزەڵەی کوردستان

قــانع بــە رێــبواری، دەدا بــە لای پیرەژنــێکی گۆزەگــەردا گۆزەڵەیــەکی نــیوە وشــك و نــیوە تــەڕی بــەر چــاو دەکــەوێت بــە نووکــە چــەقۆیەك دوو دێــڕە شــیعر لەســەر گۆزەڵەکــە هەڵدەکــەنێت پــاش ســوور کردنــەوەی گۆزەڵەکــە بــە دیــاری دەنێــرێت بــۆ بــەڕێز هــادی چاوشــلی کــە مدیــر ناحیــەی پێــنجوێن بــوو. ئــەویش گۆزەڵەکــەی ئــەوەندە بــە لاوە بــە نرخ دەبێت لە سەر مێزی فەرمانگەکەی دایدەنێت.

دەســتەیەك لــە ئەدەبپــەروەرانی شــاری ســلێمانی لەگــەڵ مامۆســتا پیرەمێــرد دەچــن بــۆ هاوینــە هــەواری چــوارباخی پێــنجوێن، لــەوێش زیــارەتی مامۆســتا هــادی چاوشــلی دەکــەن و چــاویان بــە گۆزەڵەکــە دەکەوێت، لێی دەپرســن ئــەم گۆزەڵەیــەت لــە کوێــبوو؟ بەڕێزیشــیان لــە وەرامــدا دەڵێــت قــانع بــۆی نــاردووم. کــە گەڕاونەتــەوە هــەر یەکــەیان بــە نامەیــەك داوای گۆزەڵەیــەکیان لــە قــانع کــردووە قانعیش بە سێ دێڕە شیعر وەرامیان دەداتەوە.

### شیعری سەر گۆزەڵە

نــاوی گـــۆزەڵەی خــاکی کوردســتــان

خۆشتـــــرە لە ناو سەرچاوەی لوبنان

کوردە بە یادی دەوری کەریم خـــــان

بنۆشە قوم قوم بــــــەفراوی کوێستان

## وەرامی داواکاران

نە خـــاوەن کـــارگە و نە هەوڕگـــەرم
نازانم پەنا بـــــۆ لای کێ بەرم
گۆزەڵەی ناوی ئـــــەم کـــوردستانـــە
زادەی ئەفکاری پـــــیرە ژنـانە
ببوورن بە خـــوا گـــــۆزەڵەم نییـە
ئەرنا بـــۆ ئێوە قیمـــــەتی چییە

قـــانع دیوانـــێکی خـــۆی بـــۆ گـــەورە پیـــاوێکی کوردپـــەروەر دەنێـــرێت، ئـــەم دوو دێـــڕەی شـــیعرەی لـــە ســـەر زەرفەکـــە دەنووسێت.

دیاری خوا پێداو زێڕە یـــان زیـــوە
دیــــاریی مــــن شیعری خـــوا بڕیوە
با وەجود قوربـــان حەزرەت ســــولێمان
کوللەی قەبووڵکـــــرد لە مێروولەکان

قـــانع قـــەقێ ئـــەبێت لـــە مـــەریوان لەگـــەڵ مامۆســـتاکەیدا دەچـــێت بـــۆ بیـــارە، بەکـــەمجاری دەبێـــت کـــە بیـــارە دەبینێـــت، کـــە چـــاوی بـــە خانـــەقا و مـــەلا و فوتابییـــە ئاینییـــەکانی بیـــارە دەکـــەوێت ئـــەم پارچـــە هەڵبەســـتەی بـــە نـــاوی (قـــانع و بیـــارە) داناوە.

## قانع و بیارە

بـــە ڕێکەوت ڕێکەوت ڕۆژێ لـــە ڕۆژان
هـاتمـــــــە بیارە مەعدەنی عـــیرفان
زوو بـــۆم گـــرابوو بــــــاسی ئەو صاڵ
سەرچاوەی فەیضی بێ لـــــــەکە و ساڵ
ئەیانوت بـــــــێ شك کانی مـــــوردە
ڕێـــگـــــەی نەجاتی ڕۆژی میمـــادە
کـــــەهفی ئەمانە بۆ خەتا بـــــاران
مـەنزڵگای تەوحید بۆ تــــەقواکاران
کە نواڕیم فەیزی لە بەر نـــــەباری
عـــەرشبوو بۆ لیقای حەزرەتی بـاری
گـــرۆی شەوخێزان دەروون ئـــــاوەدان
مـــــاتەم نشینان بە ظاهر وێـــــران
ڕوانیم خەلایق ڕیـــــــــز ڕیز و قەتار
ئەجووڵێنەوە هەزار بـــــــــە هــــــەزار
یەکی دلگەرمی سەدای قورئانخوێن
بە تیری عەشقی یەکێ دڵپڕ خوێـــن
یەکێ موبتەدی لە عیلمی فەنــــــــا
یەکێ شەهسەوار مەیدانی بـــــــــەقا
یەکێ خـــــەریکی عیلمی ظاهر بوو
یـەکێ مەنظوور و یـــەکێ ناظر بوو

رۆیـــــم گەیمــــە نانـــــەواخـانە

بەرسیەتیم بۆ خۆم کرد بە بەهانە

داخڵبووم بە ناو ژووری نانــــــکردن

دانیشتم لە پێی کــــولێرە خواردن

وتم ، نانـــــەوا خۆت و ئیمانت

رۆژێ چەندێـــکە مەسرەفی نانت؟

وتی، هەر رۆژێ میوانمان کـەمــبێ

هەشت پووت ئەشێلم خاترت جەمبێ

بەعزێ رۆژ میوان نایــــەتـە تەحریر

دە تەنەکە ئارد ئەکەم بــــــە هەویر

هێشتا بــەشناکـات، ئەشێ دووبـــــارە

هەویر بشێلم، چــارم ناچـــــــــــارە

خۆم و چوار شاگـــرد هــــەتـا نیوەشەو

ئاراممان نییە بــە دەوانی دەو

لـــــە وێ تێپەڕیم چـــوومە خانـــەقا

تـــــــــەماشا ئەکەم وەك (یوم البقا)

ســـــــــەقی نوێژ ئەکا سەقی مەشغووڵە

سەفێ لە یادی شـاهی رەسووڵە

گاهی ئەعرەتەی ( یا ئەڵڵا )ی شـەیدا

ئـەگاتە حضوور عەرشی بـارەگا

یـــــەکێ وەك فازان بە دڵ ئەمدا جۆش
یەکێ لە یادەی موحیبیبەت سەرخۆش

یەکێ شاگردە یـەکێ ئـــــوستادە
گـــشت کەس لە روتبـەی خۆیا دڵشادە

ئەمجا رووم‌کردە ناو تەلەبەی دین
( رضـوان الله علیهـم اجمعیـــــــن )

سوختە و موستەعید لە سەر ئیجازە
( الحمـــدلله ) بـــــە بێـئـەنـــــدازە

گرمەی دەرس و دەور موتاڵای تەفسیر
حوجرەی شافیـــعی ئـــەخاتەوە بیر

پـــــرسیم لە مەلا کە فەقێت چەندە؟
وەك غـــونچە پـــشکووت بـە لێوی خەندە

وتی نــــــــازانم، هەر دێت و دەڕوا
مەپــرسە لـــــە سیڕ کردەوەی خوا

کە دیقەتم کرد هەر یەکە کارێ
هـەر یـــەکە ویــردێ، هەر یەك هاوارێ

شێرانی ڕێی حەق بە عیلم و عەمەل
خـــەیمــە و خەرگایان بردوەتە ســەرکەل

بە سۆزی دەروون ئاهی نیوەشەو
رووبــــەرووی مـــــەقسەد بێنارام و خەو

کاروان ڕێگەی کـۆچ، سارای موحیببەت

سـەرحەڵقـەیحەڵقەی شۆری تەریقەت

ئەوسا کـە زانیم بێشەی شێرانە

ئـارامگای کـۆڕی دڵ بێدارانە

ڕووەکـردە مەجلیس شای(سیراجوددین)

عـوسمـانـی ثالث، سەرچاوەی یەقین

موجەددیـدی دین ڕەسووڵی ڕەهـبەر

وەکیلی موتـڵەق شای (خەیرولبەشەر)

خەریکی ئیرشـاد ڕێگەی خودا بـوو

لە سـەرتا بـە پێ غـەرقی لیقا بوو

بە دەس کیتابەت بە دەم نەسیحـەت

بـە دڵ دڵـداری یـاری تـەریقەت

بە چاو تەوەججوە بـە ڕۆح هۆشیاری

لـەگـەڵ مـوریدان بۆ نیگەهداری

نزیك تـا لە دوور زۆر چـاك هۆشیارە

بۆ هـەموو مـوریـد باش ئـاگادارە

کە دیـم ڕیسالەی نەسیـحەتنـامە

تۆشـەی سـارای دەشـت (یەومولقیامە)

نەینـووسییەوە بۆ (عەبدولڕەحمان)

نـە تەنها بۆ ئـەو بۆ هەموو یاران

چــــرا ئاسا بوو بۆ ڕێی هیدایــــەت
چـــاوسـاغی کـوێر بـووبۆسەر سەعادەت
بەڵێ بێ ظاهر بۆم خـــــوێنرایــــەوە
گــرێی مـــەعانیـم بـــۆ کرایەوە
نەسیمی عەتری دای لـە دەماغـــم
بـــوو بـە مـــەرهەمی دڵەی ناساغم
ئەوسا داچڵەکام بـــۆ پەرێشانیم
بـــۆ عـــومری فـــەوتا و لـە ڕێی نەزانیم
گردم بە چرای بەر پێی تـــاریکم
گـــردم بـــە عـــاسـای دەستی باریکم
وتم یا کـەریم (علام‌الغـــیوب)
(رحمـــان‌الرحیـــم غـــافر الذنـــوب)
بەکە بە خاتر شـای (قاب قـــوسـین)
بەبیـــەخشـــە بـــە نوورسەیدی کەونەین
بە سۆزی سینەی فـــاتیمەی مەعـــســووم
بە قەتـــڵی نـــاحـەق‌حوسەینی مەزڵووم
بە چیای قەلبی شـای (سیراجوددیـــن)
عـــوسمـــانی سێهــەم موجەددیدی دین
بەخەرە زومرەی مـــەنسووبی دەرگـــای
بێبـــەشـــم نـــەکەی لە سایە و پەنای

با ئیتر بەسبێ لە سـەرگەردانی
فـرسەتـە (قـانع) بگرە دامانی

قـانع هـەر لـە مەریوان دەبێـت و نامەیـەکی دیکـە بـۆ شـێخ عوسمان دەنووسێت و لە سەر زەرفەکە دەنووسێت:

دڵـم زەرفە و وەکـێڵم زەرفە بۆ لات
کـە مـاچیکات لە تەوقی سەر هەتا پات

جەنابی شێخ عوسمانیش بەم چوارینەی وەرامیدەداتەوە:

| | |
|---|---|
| مەزرووقی نامەم هەناردم بۆ یار | پاك و جوانە خاڵییە لـە غوبار |
| (گـانە) راس دڵـی دڵنـامـە | بـۆ لای ئـەدیـبی زانا و دانامە |

نامەیەك بۆ شێخ محەممەد

ئازیز زوبـەری ئـازیز زوبـەری
دوور بێت ، جـە گیانت، ماچان زوبەری
جە بازیچەی چەرخ ، چەپگەرد دڵگیری
گیرۆدەی مەینـەت ، بـەندی زەنجیری
شنەفتـم ، دوور با نێشی چەم داری
( فرەوفـەردانـە ) ، دەرد و خـەمداری
بـازی بێوەفا ، چـەرخی چەپکردار
شانا، مورەی‌نەرد ، وە سەد قین و قـار

ئەو ئەوڕەس ئەوهاڵ، باغەکەی شادی

ئەو سەروی جۆبار، ڕەوضەی ئازادی

ئەو بزی شەشدانگ تەڕلان تەوار

ئەو قامەت عەرعەر ، ئەو خەڵفی چنار

ئەو غەزاڵ وەحش، سەرعێلی جەیران

ئەو صەیدی بێخواف ، ڕەوییەی هەردان

ئەو کەبکی پەڕخاڵ ، قەهقەهەی کۆسار

ئەو گوڵدەستەی تەڕ ، سەر بەزمی گوڵزار

چەرخەکەی بەدخوو ، ئەداش وە ئازیز

سارد کەرو مەیلش ، چوون ساردیی پاییز

داش وە حەسەننام، گیرۆدەی خەسبۆ

پامالی زەحمەت ، جۆشی، هەرەسبۆ

دەك ڕۆحش، هەوای گۆڕی تەنگ، کەرۆ

هۆنەش بەردەی عەیش وەسڵ ڕەنگ کەرۆ

نەکێشو پەنجە ، نە تۆی پەخەی ناز

نەمنیشو هەرگیز چەنیش وە دڵواز

ماچنەکا لە بان ، وێنەی پەڕەی گوڵ

نەگیرو چەنەش مەقصووداتی دڵ

با وجوود ئازیز، یاران بێمەیلەن

هەر کەس مەجنوونە ئەوان هەر لەیلەن

وێرد بە ئەحواڵ ، خەرابەی ئادەم
حەزرەتی ( حەوا ) ، دایك ، گوڵ عالەم

چ ئیصرارش کەرد، پەی گەندوم خواری
پاونا ئادەم وە شەرمەساری

یا حەرەمی لووط کارش چ، تەوربی
چەنی موسافر ، وە جەفا و جەور بی

شیرینی ئەرمەن ، فەرهاد فەنادەر
..................................................

هەر مەگەرزەن بی ، سەنعان فریب دا
هاروت و ماروت،حەپسکریان نەچا

هەرمەگەرزەن بی‌بەلعەم‌وەستنەخەم
زەن بی، وە سەبەب هابیلی ئادەم

باقی وە سەلام نییەن مەجالم
پەرەی دەردی تۆ ، پەرێشان حاڵم

# بەشی فارسی

## شکر ایزد

شکر ایزد که دگر رحم خدا بـــــاز آمد
زغـن و زاغ برفتند و همـــا باز آمد

کوکبی کز وسخ ظلم زمان گم شده بود
حـمدلله که بـــه بـــازار ضیا باز آمـد

مژده به مردەی صد ساله بده بـــاد صبا
گو فرح باد مسیحا ز سمـــا بـــاز آمد

پیر یـــعقوب دل خستـەدلان شـــاد بکن
خبر گمشده از مصر به ما باز آمد

ای که معلول غمیگریەمکن خوشدل شو
کـه طبیب از سر رافـــت به دوا بـــاز آمد

بلبلا چهچەی عشق بـــه افـــلاك بزن
غـــنـچه را خنده زد و باد صبا باز آمد

## کلاسا

کلاسا کسب مکتب کن که تا گیتی به کامت بـــاد
بـــــــخوان جغرافیای نو کــــه تا عالی مقامت باد

وکیل چپ شو از اول به خدمت راستی یابی
و زان پس شو معین نایب ز زحمت‌ها دوامت باد

تو از پاداش سربازی بود روزی شوی یاور
بکش تیغ از صف دشمن ز هر سو صیت نامت باد

اگر بختت مدد کرد و رییس تیپ کل گشتی
ز بهر حفظ جان خود سرایی از رخامت باد

دخیل ای شیر پر غیرت جبونی پیشه خود کن
که شاید چون رفیقانت تمنا و سلامت باد

اگر گویم امیر شرق باش از لرها ترسم
خدا ناکرده در دوری زمانه اختتامت باد

وزان پس چند اوقاتی تو بر تخت شهی بنشین
در آندم بهر روسی‌ها بیانات و پیامت باد

## ای میهن من

ای میهن من گلشن من کشور ایران
ای مردمک ارباب سخن‌ران
گهواره‌ی داریوش دوصد نادر دوران
ای مادر میدیا و نشیمنگه ساسان
ای رزمگه کشمکش پور نریمان

تو باغ پر از لاله و من بهر تو بلبل
ما باده پرستیم و تویی شیشه‌ی پر مل
تو معدن دل‌ها و منم شاعر بی‌دل

تو گلبن گلزار و منم شاخه‌ی سنبـــــــل

من خضر ره عشقم تـــــو چشمه‌ی حیوان

دیری است که من بی‌خبر از کار تو هستم

سودایی و سودا سر بازار تـــــــو هستم

سر تـــا بـــه قدم عاشق دیدار تـــو هـستم

جان در کف خود کرده خریدار تو هـــستم

بـــــرگشته و غمگیـــن سراسیمه و حیران

آیـــا ز تو باقی است همـــان ناله و فریاد

خـــم کـم نشده زره به صد تیشه فرهـــاد

مـادر نتوانست دهـــــد شیر بــــه اولاد

می‌گفتی شب و روز دوصد وای سیصد داد

آن دوره کـــه دیدیـــم چنین بود و چنان

آن چته نـــیلی که او را امنیـه نـــام اســـت

صد چته کوهی ز برش همچون غلام اسـت

گـویند که فاشیستی او جمـله تمام اســـت

کـام دل درویش در این دوره به کام است؟

شادان شـــدی ای صوفی بیچـاره و عریان

ای هم‌وطنان دوری ز یــــاران دگـــر بـــس

محـــرومی از ایـــن جنت ایران دگـــر بـــس

بازمنده از ایـــن گردش دوران دگــــر بـــس

خون خــــوردن دل‌هـــای جوانان دگر بس

............................................................

هان ای پســـر پرخرد چشمەی نـــامـــوس

امریکی مشو صینی مشو دور شو از روس

اینگلیزی مشو شرم کن از گنبد کـــاووس

بر کش همـــه دم نـــاله و افغان پرافسوس

ایـــرانیم ایـــرانیم ایـــرانیم ایران

### ای میان اولیاهان

ای میـــان اولیا هان ارشد و اعـــلاستی

وی زعلم عـــرف وحـدت لـــجه و دریاستی

ای زده طبل حقیقت بـر سیـــاحت‌گـــاه عرش

وی زمشرق تا به مـغرب فرد و بی‌همتـــاستی

ساربـــانا محملـم رخ کـــرد در دشت فنا

هوش دارای حافظ هر پـستی و بـــالاستی

نقش اژدرها و عقلـــم بلبل بـی‌بـــال و پر

عدل فرما ای که عادل‌تر ز صـــد کسراستـــی

آنکه گفتا در یمن بیش من است منـش نـبود (!)

حمدالله شـــاه من تو حـــافـظ بطحاستی

بنگـــر اندر حالت بی‌حـالتـــان ای حـــالدان

کار تو تطبیق شرق و نایب لـــــولاستی

نقد فکرم پر ز عشق و دل بوتەیی پر آتش است
آتـــــش عشق از تو جوید ای ز دین اعلاستی
( قانعا ) مـــــستانەوار رخ بنـــــه اندر عدم
عبـد شاهی دینی و خود بیش از کسراستی

## آن تاسف

آن تـــــاسف بـــــر وجود ما زده دیار نیست
پیش هر کس ملتجی باشم به جز خونخوار نیست
این سخن حق است جانـــــا قصه و گفتار نیست
کس در این دنیا چو من از عمر خود بیزار نیست
چون که درد دل گران است قــابل اظهار نیست

## شورش دنیا

شـــورش دنیا ز آه و ناله و زار مـــن است
بادەنـــوشی در خـــرابات مغان کـار من است
......... رمـــز خـــوانند ابلـــه اندر ابلـــهی
رمز خواهی ، در میان ابروی یار مـــن است
آن که در پیش خودم با من دم یاری زنـــد
در غیابت بد نهاد و دشمن کـار مـــن اســـت
عطـــر گـل تزیین دل نـــور قمر طعم شـــکر
این همه از نکتەهای رمز گفتار من اســـت

کوزه‌ام را گر سفالین باد ای دل غم مـــــخور

شربتـــی دارم کــه حلواپز خـــــــریدار من است

از دم عیسی مدان ای هــــوشمنــد ، احیــــای موت

التیام از بوی زلف سر و جــویبـار من است

یــــا خماری نرگس از طرف چمن از خویش نیست

زره‌ای از نــــازشی، زون خــــریــــــدار من است

شوردریا، نـــی ز آب خـــوش گوارا قدرتی است

قطره‌ای از آب عشق هجرت یـــــار مـــــــن است

(قانع) اندر بی کسی چـــون بلبلان نالش کنـــد

او نــــمی‌داند که شاه عشق سردار من است.

## خرمن غرور

ملخی بی درایت و نـــــادان

کـــرد قصد غنیمت مـــــــوران

بــــــا سری پر غرور و مغزی تـهی

بــــــر ســــــــر راه مور گشت روان

چون نظـــــر بــر درازی خود کرد

در گمان شد که اوست شیـــــر ژیان

بال خود باز کرد وپی پــــــی و زود

تیز می‌کرد هـــــــر دمش دنـــدان

گـــــاه بگفت نهنگ دریـــــایم

گـه زده دستهـــــا بر دامان

از قضا مورکی در ایـــن صحرا
می‌دویـد از برای دانـــه و دان

چون ملـخ مور دید دشـــمن آمد
روی خود راست کرد در میــدان

پای نـــاموس زد بـــه قبه خاک
چنگ‌هــا تیز کرد هم‌چونـان

یفعل‌الله مایشاء خـــوانـــد
آیـــه فتح کرد، ورد زبان

مور پر غیرت و حمیت بـود
نبودش بیم اندر این میـــدان

چـــون درون ملخ مجوف بـــود
رفت دنــدان مـــور در توی آن

جـان سپردش به قابــض‌الارواح
بر ملخ خصم گشت دور چندان

(قــانعا) خرمن غرور این است
ثمرش نیست غیر کندن جـــان

## اندیشه

شبی انـــدیشه می‌کردم ز ایــــام
گـــهی از شعـــر سعدی گاه خیام

گهـــی از گات‌های دین زردشـــت
گـــهی از خارزار و باغ و گل‌گشت

گهی یاد ارسطو بــــه افلاطـــــون

گهــــی از حسن لیلی شور مجنون

درین غوغا چو ناگه رفتم از خواب

بسان مرده بــی همراز و احبـــــاب

ز خواب خوش عجب خوابی بدیدم

بــه شهرستان گردون در رسیـدم

چـــو دیـدم خانه و قصر و نگارش

چو دیدم باغ بــــا حوض و حارش

گذر کردم ز کوچه تـــا خیابـــــان

به راست و چپ نگه کردم ز دکـــان

دهانم پــر ز مــــاشاالله پـــی پی

گهی لاحول گویان گاهی هی هـــی

بدیـــدم پرچمی شیـرین ومـــــهوش

سفید و سرخ و سبز و خیلـی دلکش

ز زیـــر دار پرچـــم تابلـــو بـود

نشــــان جــــایگاهی ساخلـــو بود

نــــوشتـه دادگــــاه آسمـانـــــی

به امر ایزد هــر دو جهـــــانی

چو رفتم من ، بـــه کرسی جای دادند

لب خوش آمدی از هم گـــشادنـد

جنا ایـــل و مشانا ایل و زا ایـــل

کشیده صف برابر امر جبرییـــــل

بگفتنـــدش کـــدامین آسمانـــی

کـــدامین ایل در نام و نشـانـــی

بگفتم (قـــانع) بی ایل نـــامـــم

ز اهل ســـــرزمین نـــا تمامـم

همه اهل زمین بی ایل و میلـــند

از آن رو پیش یزدان بـــی‌دلیلند

بگفتنـــد خوانـده‌ای ای مرد میهمان

بگفتـــم آری آری نــصـــف قرآن

کتـــاب ابتدایی خیلی خـــوانــدم

بـر دیـــوار مسجد خیلی مـــاندم

ز صوفی احمد و مـــلا فـــلانی

گـــرفتم علـــم از دنیـــای فانـــی

پی آن که ســـر نـویسنده جنا ایل

بنا بر امـــر آقا شیخ جبریـــیل

کتابی بر گرفت و داد دستم
که تا داند کدامین مرد هستم

کتابش باز کردم اندران آن
چو دیدم خط و حرف و لفظ یونان

شکایت نامه‌ای از دست زوردار
ز دور استیلای شاه خون‌خوار

مگر یک مرد مرغ دیگری خورد
شکایت‌نامه را پیش عدلیه برد

هنوز آن ادعا در آسمان است
ز عدلیه ز پرونده عیان است

مگر صاحب زمان آید بری کار
ستاند خون مرغ از مرد خون‌خوار

## ماده تاریخ‌خانه‌ی آقای محمد امین خان

(در روستای «شێوه گوێزان»)

پس از حمد و ثنای حی اکبر
درود مصطفی سالار محشر

منم اسمم محمد هم امینم
به دل مشتاق ارکانات دینم

نژادم بانــەای آل سلیمـــــــــان

به بهرامی شــدم مــشهور دوران

شبی رفتم به خـاک (شێوه گوێزان)

بدیدم یادگاری از نیـــــــــاکان

چو یاد آن بزرگان کردم از دل

دل از ویـرانه آن‌جا کرد مشکل

به صرف مال کردم خانه بنیاد

که تا آباد باشد جای اجــــداد

خرد تاریخ او گفتا به ظــــــاهر

(چو گل تعمیر کردم جای قادر)

بـــەرگی یەکـــەمی بەرهەمەکـــە پێچـــیی کـــرا و تـــەواوبوو، بردمـــە لای مامۆســـتا وریـــا، ئـــەویش دوای تماشـــا و بـــژار کـــردنی، جگـــە لـــەوە کـــە بـــە دەستنووســـی خـــۆی داوایکـــرد ئـــەو نوکتانـــەی لـــە دیوانـــە پێشـــووەکەدا بـــڵاو کراونەتـــەوە بخرێنـــە ســـەر ئـــەم بەرهەمـــە، زۆر تـــەئکیدیکرد کـــە ئـــەم داوایـــە وەرگـــرم و فـــەرموویان حەیفـــە کەســـێك ئـــەم بەرهەمـــە دەخوێنێتـــەوە ئەمانـــەش نـــەبینێ. منـــیش لـــە ســـەر فـــەرموودەی ئـــەو مامۆســـتا بـــەڕێز و پایەبـــەرزە کـــە چـــاکتر لـــە مـــن شـــارەزایە، ئەوانیشـــم خســـتنە ســـەر ئـــەم بەرهەمـــە، بـــەو جـــۆرەی کـــە لـــە دیوانـــی قـــانعدا بـــوو لـــە چـــاپی یەکـــەمی ســـاڵی ۱۹۷۹ (چـــاپخانەی زانکـــۆی ســـلێمانی) کـــە مامۆســـتای ماندوونـــەناس و شـــاگردی قـــانع کـــاك بورهـــانی رەحمـــەتی کۆیکـــردبووەوە و چـــاپیکردبوو، نووســـیمەوەو دەقـــی ئـــەو چاپکراوە بڵاو دەکەمەوە.

## وەرگیراو لە دیوانی قانع

## چەند سەرگوزشتەیەکی شاعیر

قانع ڕووخۆش و نوکتەبەزێر و قسە لە ڕوو بووە، لە هەر کۆڕ و کۆمەڵ و کۆبوونەوەیەکدا بەشداریکردبێت بە زوویی دەرکەوتووە و ناسراوە، کردەوەکانی و قسەکانی سەرنجڕاکێشەر بوون ... ئێستا لەم بەشەدا هەندێك بە سەرهاتی بچووکی باسدەکەین کە پەیوەندیان بە واقیعی ژیانییەوە هەیە:

ـ قانع منداڵ دەبێ و بێدایك و باوك، شەوانە لە سەر تەنووران ڕۆژیدەکردەوە لەگەڵ کۆمەڵێك منداڵی وەك خۆی لە کۆڵانێکدا لە دێی دۆڵاش کە نیشتەجێی باب و باپیری دەبێ، یاریدەکات ... (ئاغا سەید حسێن) خەڵکی «چۆڕ» بەوێدا بە سواری دەڕوات و ئەسپەکەی پێ بە خانووکچەی منداڵەکاندا دەنێ و دەیڕووخێنێ. قانع دەستدەکا بە گریان. پیاوێکی بە ساڵاچوو کە لە بن دیوارەکەدا دانیشتوو دەبێ بە ئاغا سەید حسێن دەڵێ: ئەو منداڵەی ئەگری کوڕی شێخ قادری شێخ سەعیدی دۆڵاشە ... ئاغا سەید حسێن دادەچڵەکێ و دەڵێ بۆچی بەم شێوەیە وەکو بێکەسێك دەژی ... پیاوە پیرەکە دەڵێ: پاش لێقەومانیان بە دەست دەرەبەگاکانەوە، ڕایانکردە بناری شارەزوور، کە شێخ قادر ئەمری خوای کرد ئەمیش بە بێکەسی

هێنایانەوە بۆ دۆڵاش و مامەکانیشی ئازی ناکێشن ... ئەویش دەڵێ: بەرزیکەرەوە و بیدەدەستم ... لە کابرای وەردەگرێ و بە سواری دەیباتەوە بۆ دێی «چۆڕ» هەر لە ناوچەی مەریوان ... ئنجا قانع خۆی دەیگێڕایەوە و دەیووت: لە بیرم دێ ئاغا سەید حسەین بە دەستی خۆی بە ئاو و سابوون لە ناو تەشتێکدا شۆردمی و دەستێ جلی تازەی منداڵانیان بۆ هێنام، کردمە بەر و زۆری پێنەچوو لای مەلای قوتابخانە دایانام. ئەمە بوو بە سەرەتای فەقێیەتی و خوێندەواریم و تەنانەت لە شیعرێکدا وتوویە:

هەزار رەحمەت لە ئارامگاهی بەرزی سەییدی (چۆڕ)ی

کە منداڵبووم بە لوتفی خۆی مەساری ژینمی گۆڕی

ــ قانع بە فەقێیەتی سەرێك لە مەریوان دەداتەوە و دەچێتە دیاری کەلاوە رووخاوەکانی دێی (دۆڵاش) لە سەر بەردێك دادەنیشێ و هەناسەیەکی سارد هەڵدەکێشێ و دەڵێ:

ئەگەرچی پەردەوازەی ئەم دیارەم

خەریداری (دۆڵاش)ی (مەحەمەد روخان)م[1]

یان هەر بەو هەناسە ساردییەوە دەڵێت:

وەتەن[2]ا خاکەت بە موژگانم ئەکێڵم

لە بەر تەحصیلی عیلمە جێت ئەهێڵم

---

١ـ بە ملانا لەمەریوانە.

٢ـ مەبەستی لە مەریوان بووە.

وە یان کە ستایشی (گوێزەبەیخان)[1] دەکات دەڵێ:

ئەگـــەر زاهید دڵی زەوقی تیـایە

دەبا بێتە نیساری (گوێزەبەیخان)

کـە دۆڵاشم هەموو بوو بە کەلاوە

چ زەوقی تیا نەما، خاکی مەریوان

لــە کـاتێکدا لــە شـاری (کۆیــە) فـەقێ دەبـێ بـیری ناوچـەی مەریوان دەکاتەوە دەڵێ:

(مەریوان) فیـــکر و هۆشم هـــەر بـــە تۆیە.

دەروون ڕێش و سەراسیمەم لە (کۆ)یـــە ...

ــ لەگەڵ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسـدا دۆسـتایەتییەکی زۆر بەتینیان دەبێ، لە سەرەتای شەستەکاندا دەبێ، فەقێ تایەر نـاوێکی خزمی قانع دێت بۆ لای و داوای لێدەکات نامەیەك بـۆ مامۆسـتا مـەلا عەبدولکەریم بنووسێ بەڵکوو لە حوجرەکەی مزگـەوتی گـەیلانی لـە بەغدا وەریبگرن و بخوێنێ ... ئـەویش ئـەم چـوارینە شـیعرە فارسـییەی سـەعدی وەکو لای خوارەوە دەگۆڕێ و بۆ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی دەنێرێ:

ای کــــریم کە از خــزانەی عیلم

گـبـــــر و ترسا وظیفە خورداری

---

1ــ هاوینە هەوارگەیەکی سروشتییە کەوتۆتە پشت ئاوایی ئەوگڵانەوە.

ظاهـــر ما کـــجا کنی محروم

تـــو کـــه بـــا یابەها نظـرداری

ـ ڕۆژێکیان ڕێی دەکەوێتە تەکیەی شێخێك لە ناوچەی شلێر، لـەو کاتەدا شەکەر و چایی دەگمەن دەبێ شێخەکە بە قانع دەڵـێ بـە زمـانی ئێمەوە قاقەزێك بۆ (خان) بنووسـە لە دارۆخان، بەڵکوو نەختێك شەکەر و چای بۆ تەکیە بنێرێ ... ئەمیش ئەم چوارینە شـیعرەی سـەعدی هـەر بە فارسی دەگۆڕێتە سەر بامـەکەی خۆیان.

روی بــردار و خـــان و میگویم

هـــر سحرگـــاه که بـــاد میآید

ای که صندوق قند و چای داری

هیچـــت از بنده یـــاد میآید ...

ـــ مـالێ لـــە دێـــی کـــەوڵەرس دەبـــێ، دەچـــێ بـــۆ دیدەنـــی مەلایـــەکی بـــرادەری بـــۆ هـــەوار موبـــارەکی لێکـــردنی، تـــەنیا ســـەگێکی دەبـــێ بـــە دیـــاری دەیـــات بـــۆ مەلاکـــەی هـــاوڕێی ... هاوڕێکـــەی زۆر ســـەری ســـوڕدەمێنێ و لـــێی دەپرســـێ: ئـــەم ســـەگەت بۆچـــی هێنـــاوە؟ ئـــەویش دەڵـــێ: لـــە بـــەر دوو هـــۆ، یەکـــەم هـــیچ نـــەبوو بـــە دیـــاری بـــۆت بێـــنم و دووەمـــیش ئـــەم سـەگە نان دەخوات منیش نانم نییە بیدەمێ.

ـــ بە رێبواری رێی دەکەوێتە دێیەك، زستان دەبێ. شەو لە مزگەوتی دێکە دەمێنێتەوە، گەلێك گوێ لە قسەی دانیشتووانی مزگەوتەکە دەگرێ ... مەلای دێکە قسە بۆ خەڵك دەکات و دەڵێ: هەر کەس بە ئانقەست چڵەپووشێك لە سەر خەرمانی یەکێکی‌تر هەڵبگرێ، یان بە بێپرسی خاوەنەکەی بیکات بە ژێر دیانیا، لە قیامەتدا حەفتا هەزار ساڵ لە ئاگردا دەیسووتێنن ... قانعیش خۆی پێناگیرێ دێتە وەڵام: مامۆستا لە سەر چڵێك پووش حەفتا هەزار ساڵ زۆرە ...

ـــ خەزمێکی شاعیر کچێکی خۆی دەدات بە مەلای دێکەیان کە مەلاکە زۆر بە تەمەن گەورە دەبێ ... قانع بە خزمەکەی دەڵێ: بۆچی ئەمەت کرد؟ ئەویش دەڵێ: لە بەر ئەوەی کوڕەکەم بکات بە خۆی، واتا (کوڕەکەم وەکو خۆی فێری خوێندەواری بکا) ... ئەمیش دەڵێ: پەلەت نەکردایە هەر کات کوڕەکەت گەورە بوو دەبوو بە خۆی!! واتا دەبوو بە مەلاکە ... (بەم مانایە گوایە جیاوازیی نێوان کوڕە نەخوێندەوارەکە و مەلاکە تەنیا گەورەیی تەمەنە) ...

ـــ كۆمەڵێك لە دۆست و برادەرانی قانع پێی دەڵێن دوكانداریكات ئەویش دەڵێ: (ئەگەر خوا بزانێ دوكانی كڵاو فرۆشتم هەیە ئادەمیزاد بە بێسەر دروستدەكات.)

ـ مەلای دێی «ئەوێ» دەبێ لە بناری شارەزوور، لەو كاتەدا هەركەس بەرازێكی بكوشتایە گوێچكەكانی بۆ بەڵگەی راستی بردایە بۆ لای مدیری ناحیە، بەرامبەر بە گوێچكەی هەر بەرازێك چارەكە دینارێكی وەر دەگرت ... ئەویش رۆژێكیان دەچێ بۆ لای ناوچەداری (مدیری ناحیە) خورماڵ لە شارەزوور، چەند گوێچكە بەرازێك لە ناو دەسەسرێكدا لە سەر مێزەكەی دادەنێ و مدیریش تەماشایەكی سەر و سیمای دەكات، كە مێزەری سپی و پشتێنی سەوز ـ كە نیشانەی شێخیەتیە ـ دەبینێ، سەری سوڕ دەمێنێ كە چۆن ئەم مەلایە دەست لە گوێچكە بەرازەوە دەدات، كە بە پێی فەرمانی شەریعەتی ئیسلام گڵاوە؟! لێی دەپرسێ: ئەمە چییە؟ ئەویش دەڵێ: ئەمانە گوێچكە بەرازن، هێناومن بۆ ئێوە پارەكەم بدەنێ. مدیرەكە پێی دەڵێ: تۆ مەلای و شێخیشی چۆن راوە بەرازت كردووە و بەرازت كوشتووە؟ قانعیش پێی دەڵێ: قوربان خۆم راوم نەكردوون ... من مەلای دێكەم خەڵكی ئاوایی راویان كردووە ئەو گوێچكە گەورەیانە لە جیاتی سەرفیترە وەرمگرتووە، ئەو ناوبجیەیان لە جیاتی

سەرقەڵەمدانەی دوعا و ئەو بچووکەشیان مردووشۆرانەیە ...
مدیرەکە دەموودەس دەزانێ ئەمە هەبێ و نەبێ قانعی شاعیرە.

ـ نەخۆش دەبێ لە خەستەخانە، دوکتۆر پێی دەڵێ: نابێ بە هیچ جۆرێ جگەرە بکێشی. چەند جارێك دوکتۆر سەری لێدەدا هەموو جار دەبینێ هەر خەریکی جگەرە خواردنە، ئینجا دوکتۆرەکەی پێی دەڵێ: مامۆستا تکات لێ دەکەم وەکو ناتوانی جگەرە نەخۆیت بۆ ئەوەی زیان بە تەندروستیت نەگات کە دووکەڵەکە هەڵدەمژیتە ناو دەمت، قووتی مەدە لە دەمتەوە بیکەوە دەرەوە، ئەویش بە دوکتۆرەکە دەڵێ منیش تکایەکم هەیە جەنابیشت کە نان دەخۆی دوای ئەوەی کە پاروەکەت بە تەواوی جوو قووتی مەدە، تفیکەوە.

ـ بۆ ئەوەی ئەو لایەنە خورافیانەی تێکەڵ بە ئایینی ئیسلام بوون کەمیانبکاتەوە رۆژێکیان لە دێیەکی مەریوانەوە دەچێ بۆ دێیەکیتر و سواری گایەك دەبێ، چەند جارێك دەکەوێتە خوارەوە، کە نزیك ئاوایی دەبێتەوە دەیناسن، دەچن بەرەو پیریەوە و پێی دەڵێن: مامۆستا بۆچی رانەسپارد ولاخێکت بۆ بنێرین سواری بی و ئیتر ئەوەندە لە سواری ئەم گایە نەکەوێتە خوارەوە، ئەویش دەڵێ: مەبەست ئەوە نییە بە سواری بێم، یان

نە! بەڵام ئاخۆ ئەم گایە لەم دنیایەدا و لەم لەولای خۆماڵە و لەم ڕێگا پان و پۆڕەدا ئەمە حاڵی بێ. ئاخۆ سەعیی لە سەر پردی (سیرات) چی بکات؟

ــ ساڵی (١٩٥٦) دەچێ بۆ دەربەندیخان، لەو کاتەدا چەند کۆمپانییەك خەریکی بەستەکەی دەربەندیخان دەبن، مامۆستا (کەریم زەندی) هاوڕێی لەو کاتەدا ئەفسەری کارگوزار و پەیوەندیی یەکێك لە کۆمپانیاکان دەبێ ئەمیش لە پارچە قاقەزێکی بچکۆلەدا تەنیا ئەم ڕستەیەی بۆ دەنووسێ:

(یا کەریمی کارساز مەدەدی) ...

مامۆستا زەندی دەمودەس دێت بۆ لای و تێدەگات بە شوێن ئیشدا دەگەڕێ، دەیکات بە پاسەوانی بلدۆزەرێکی شکاو بە ڕۆژانەیەکی باش.

ــ قانع لە دێیەك مەلا دەبێ و کۆمەڵێك کۆلکە فەقێی دەبێ، ڕۆژێکیان فەقێکانی پێی دەڵێن دوعای دەمبەستی گورگمان فێرکە. ئەمیش ئەم دوو دێڕە شیعرەیان پێڕەوان دەکا:

| | |
|---|---|
| ئادانە، دانە، دانە | گورگیش سەگی هەردانە |
| بە گالۆك و بە گۆچان | دەم گورگ بەستێن لە حەیوان |

فەقێکان ئەمە لای خەڵکی ئاوایی ئاشکرا دەکەن و خەڵکەکە لە سەر ئەمە لێی زویر دەبن، گوایە گاڵتەی بە دوعای (دەم بەستی گورگ) کردووە.

ـــ برادەرێکی بە تەڵاق سوێند دەخوات، پێی دەڵێ: تۆ هەرگیز نابێتە خاوەنی دوو دینار پارەی خۆت، ماوەیەکی بە سەردا تێدەپەڕێ ڕۆژێکیان لە ئۆتۆمۆبێلێکدا بە ناو بازارە بچکۆلەکەی سەیدسادقدا تێدەپەڕن، چوار دیناری پێدەبێ لە ناکاو چاوی بە کوڕی برادەرەکەی دەکەوێ، بە شۆفێرەکە دەڵێ: زەحمەت نەبێ نەختێك لێرەدا ڕاوەستە. بانگ لە کوڕی برادەرەکەی دەکات، پارەکە لە گیرفانی دەردێنێ و دەڵێ: سڵاوم بە باوکت بگەیەنە و پێی بڵێ تەڵاقەکەی کەوت چونکە ئەم چوار دینارە هی خۆمە.

ـــ فەقێ دەبێ و سەرەتای شاعیریەتی دەبێ و تازە (قانع) ناو بانگی پەیدا کردبوو، دەچێتە دێ (سادموا) لە مەریوان، تەماشا دەکا حوجرەی فەقێکان چۆڵە. لە یەکێك دەپرسێ فەقێکانی ئەم دێیە لە کوێن؟ کابرا پێی دەڵێ قانعی شاعیر هاتووە لە ماڵی ئاغا میوانە و هەموو فەقێکانیش بەو بۆنەیەوە بانگکراون بۆ دیوەخان ... ئەمیش لە دڵی خۆیدا دەڵێ: ئاخۆ ئەم قانعی شاعیرە

کێیی؟! ئەویش دەچێ بۆ دیوەخان بۆ بینینی (قانعەکە) کە دەچێتە ژوورەوە سڵاو دەکا تەماشا دەکا فەقێیەك لای ژووررووی هەموانەوە لە سەر دۆشەکێك دانیشتووە و تەنیشکی لە سەر سەرینایەك داداوە و ئاغای دێکەش لە تەنیشتیەوە لە سەر چۆك دانیشتووە، فەقێکانی ئاوایی و دەست و پێوەندە نزیکەکانی ئاغاش بە ریزە دانیشتوون، هەر کە دەچێتە ژوورەوەو ئەمە دەبینێ فەقێی خۆ بە قانع ناونراو دەناسێتەوە. ئەمیش دوای سڵاو کردن پەلاماری دەستی فەقێکە دەدات و دەستی دەگوشێ و پێی دەڵێ: مامۆستا قانع بەخێر بێیت، زۆر تامەزرۆی چاو پێکەوتنت بووم. فەقێکەش قانع دەناسێتەوە لە هەوڵەوە رەنگی تێکدەچێ، بەڵام کە قانع بەو جۆرە دەست و ماچی لەگەڵ دەکات فەقێکە دێتەوە سەر خۆی، لە لاشانی خۆیەوە دایدەنێ و دەڵێ ئەم فەقێیە زۆر دۆستمە و دەمێکە ئەمدیوە حەز دەکەم لە لای خۆمەوە دابنیشێ ...قانعیش دەڵێ: ئەم مامۆستا قانعە ئێستا میوانی ئێوەیە مارەیەك مامۆستام بووە و دەرسی پێ وتووم. خەڵك داوا دەکەن شیعریان بۆ بخوێنێتەوە. ئەویش تاك و تەرا شیعری ئەم و ئەو دەزانێ و تێکەڵیان دەکات ... قانعیش پێی دەڵێ: مامۆستا قانع ئەگەر ئیجازە بفەرمووی شیعرەکانی ئەو ساڵەی بە دەرس پێت وتم هەموویم لە بەر

کـردوون، بـا بیانخوێنمـەوە بـۆ دانیشـتووان. ئـەویش دەڵـێ: فـەرموو ... قــانع چــەند پارچــە شــیعرێك دەخوێنێتــەوە و کۆڕەکــە گـەرمدەکات. دوای نـانخواردن دەیانـەوێ بـڕۆن، ئاغـا وڵاخـێك بـۆ میوانـە بـە نـاو قانعەکـە زیندەکـات و خزمـەتکارێکیان دەخاتـە گـەڵ کـە لـە ئـاوایی دەرچـوون مـیوانی بـە نـاو قـانع دەڵـێ: دەبـێ تـۆ سواری ئەم وڵاخە بیـت، چـونکە بـۆ قـانع زینکـراوە. ئـەویش دەڵـێ کـەوابوو بـا وڵاخەکـە بگەڕێنـەوە و هـەردووکمان بـە پـێ بـڕۆین و بە سەر بەستی قسە بکەین.

ــــ ڕۆژێــك لەگــەڵ هاوڕێیــەکیدا ڕێیــان دەکەوێتــە ئــاوایی گۆخلاّن لە ناوچەی شـلێری پێنجوێن، کەوا و سـەڵتەی لـە بـەردا دەبـێ و مێـزەرەی سـپی مەلایانـە بـە سـەرەوە دەبـێ، کـە دەچـنە هـەیوانی مزگەوتەکـە خـەڵکی ئـاوایی، ئـەوەندەی کـە لـەوێ دەبـن زۆریـان پـێ ناخۆشـدەبێ، وا دەزانـن ئاغـای دیکـەیان ناردوویـەتی بـە زۆر بیـێ بـە مـەلایان و ئـەرك بکەوێتـە سـەریان ... قـانع لــە مـاردیی خولکـی خەڵکەکـە تێدەگـات و پێـان دەڵـێ: برایـنـە بـۆ ئـەوە نـەهاتووم کـە بـبم بـە مـەلاتان، ڕێبوارم، بـەڵام زۆر مـاندووم ئەمـەوێ گوێدرێژێکـم بـۆ پـەیدا بکـەن. لـەو کاتـەدا خەڵکەکـە خـەریکی پـەیدا کـردنی گوێدرێژەکـە بـوون، ئـەویش ڕوو دەکاتـە هاوڕێکەی و ئەم نیوەشیعرە دەڵێ:

**(چاوەڕوانیی لوتفی گەر کەین تا دەگەینە ئارەزوو)**

ــ لە کاتی یەکەمین شەڕی جیهانیدا فەقێ دەبێ لە ناوچەی مەریوان و خەڵکێکی زۆر بە ناوی ئاینەوە دژی لەشکری رووسیای قەیسەری چەك هەڵدەگرن و داکۆکی لە سەر لەشکری عوسمانییەکان دەکەن، کۆمەڵی مەلا و فەقێیانیش بارەگایەکی تایبەتیان دەبێ لە چیایەکدا دەبن، زستان دەبێ، ئاگرێکی گەورە دەکەنەوە و شەو بە دەوری ئاگرەکەدا رادەکشێن: لە نیوەشەودا تەقەی تفەنگ و پەلاماربردنی لەشکری رووس خەڵکەکە بە ئاگا دێنێتەوە. قانعیش لە نزیك ئاگرەکەوە خەوتبوو، پێڵاوەکانی نیوە سووتاو دەبن، کە تینی ئاگرەکە دەگاتە لاقی، بە ئاگا دێتەوە، لە بەر ئازاری قاچی بێپەروا بەرەو بناری چیاکە ــ واتە رووبەڕووی لەشکری رووسەکان ــ را دەکات بەو نیازە کانی و ئاوێك دەبێ، خۆی بخاتە ناوی و قاچەکانی سارد بێتەوە. کە خەڵکەکە ئەمە دەبینن، وا دەزانن بۆ سەر لەشکری رووس پەلامار دەبات ... بە جارێك دەستەکەن بە سەڵەواتلێدان و شوێنی دەکەون. لەشکری رووس کە ئەم هێرشە رووبەڕووە دەبینێ ناچار دەکشێتە دواوە، بۆ سبەینێ سەرکەردەی عوسمانییەکان دەبیستێ کە فەقێیەك بۆتە هۆی شکاندنی لەشکری رووسەکە... بانگیدەکات و گوایە لە سەر ئەو ئازایەتییە خەڵاتیدەکا.

ــ لە دێیەك ئاشەوان دەبێ، شەوێك كارگوزارێكی سیاسی ڕێی دەكەوێتە ماڵیان. تاكو نیوەشەو دادەنیشن و باسی چەندان جۆر بابەت و مەسەلەی نیشتمانی دەكەن... لە كاتی خەوتندا كارگوزارەكە پێی دەڵێ: مامۆستا قسەكانتم زۆر پێخۆش بوون، بە قسەكانتدا دیارە لایەنگری كۆمەڵەكانی... ئەمیش پێی دەڵێ: كاكی برام وا دیارە لە ئێوارەوە لە قسەكانم تێنەگەیشتوویت، چونكە قسەكانی من ئەوە ناگەیەنن لایەنگری ئێوە بم بەڵكوو ئەوە نیشان ندەدەن كە ئێوە لایەنگری منبن.

ــ خاوەن ملكێك قانعی زۆر خۆشدەویست چەند جارێك پێی دەڵێ حەز دەكەم پارچە زەوییەكت بۆ تاپۆ بكەم، قانع بە گەرم بە دەم داخوازییەكەیەوە ناچێ. ڕۆژێكیان خاوەن ملكەكە پێی دەڵێ: پێم نالێی بۆچی من ئەمەندە حەز دەكەم پارچە زەوییەكەت پێببەخشم تۆ ناتەوێت؟ ئەویش پێی دەڵێ: من نامەوێ لە بەر خاتری پارچە زەوییەكە ببم بە (موستەعمەرە)ی قسەكانت.

- جارێكیان لای شێخە ئیرشادێك دادەنیشێ و لە دڵەوە بەینیان ناكۆك دەبێ. لەو كاتەدا كابرایەك بە هەڵەداوان خۆی دەكات بە ژوورەكەدا و دەستی شێخ ماچدەكات و دەڵێ: قوربان كوڕەكەم مار پێوەی داوە، پارووێكی دەمەجووی خۆتم

بدەیق بیخەینە سەر جێی گەستنی مارەکە، بەڵکوو لە بەرەکەتی جەنابتانەوە چاک بێتەوە ... بەر لەوەی شێخ قسە بکا قانع بە کابرا دەڵێ: نانت هێناوە شێخ بۆت بجوی؟! کابرا دەڵێ نەخەیر... ئەمیش دەڵێ: سەیرە، هەر یەکێك مار بیخوات و شێخ پاروویەك نانی خۆی بۆ بجوێ و بیداتێ چۆن دەریدێنێ ... ئەمە لە شێخەوە دوورە نانی خۆیت بۆ بجوێ بڕۆ نانی خۆت بێنە ... شێخەکە بەمە ئەمەندەیتر دڵگیر دەبێ و داوای ئاشتبوونەوە لە قانع دەکات.

ـ جارێکیان لە خانەقای شێخێك دادەنیشێ، کۆمەڵێك سۆفی و مورید دەورە لە شێخ دەدەن، شێخ روو دەکاتە یەکێك لە سۆفییەکان و دەڵێ: (دایکە هالیا مەنەن) واتە دایکە هالیا ماوە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ... خەڵکەکە بێدەنگدەبن و شێخ دەڵێ جنۆکەیەکمان هەیە مێردەکەی مردووە، لە هەوارگەی ئەم سۆفیەدا کەپرێکی غەیبی بۆ خۆی دروست کردووە... قانع ماوەیەك دەنگناکا، دوایی روو دەکاتە هەمان سۆفی و دەڵێ: (ئەجیل زارەبین مەنەن) واتە ئەجیل زارەبین ماوە؟ کابرا دەڵێ: بەڵێ. ئینجا قانع بە شێخ دەڵێ پێت بڵێم ئەجیل زارەبین چییە؟ شێخ دەڵێ: بەڵێ. قانع دەڵێ: جنۆکەیەکمان هەیە ژنەکەی مردووە لە ناو باخی ئەم سۆفییەدا، رۆژێك خانووی غەیبی بۆ

خـۆی کردۆتـەوە... ئینجـا منـیش بـۆ ئـەوە هـاتووم بـۆ خزمـەتتان بـەڵکوو ئیجـازە بفـەرمووی دایکـە هاڵیـای لای جـەنابتانی لـیٚ مـارە بکـەین و هـەر دوو لایـان رزگاریـانبیٚت ... شـێخ بـە شـەرمەوە سەری دادەخات ... دوای نەختێك دەچێتە دەرەوە ...

ـ لـە مـاڵی ئاغایـەك دەبـیٚ، ئاغەکـە تانجییـەکی ئـازای دەبـیٚ و دەڵـیٚ: قـانع ئـەم تانجیـە زۆر سـەیرە، لـە راکـردندا زۆر ئازایـە دەگاتـە کەروێشـك بـەڵام نـایگریٚ ... ئـەوە چـاری چییـە؟ ئـەمیش دەڵـیٚ چـاری ئاسـانە، داوا بکـە کەروێشـکێکی زینـدوو بگـرن و لـە بەر چـاو تانجییەکـە کولێرەیـەك ببەسـتن بـە ملیـەوە و بـەرەڵای کـەن ... ئینجـا هـەر کـات چـاوی بـە هـەر کەروێشـکێك کـەوت وادەزانـی کولێرەیـەکی بـە گەردنـەوە بەسـتراوە ... بـۆ کولێرەکـە هەر دەیگریٚ ... ئاغا دەرەنجیٚ بەڵام نایخاتە خۆ ...

ـ فەقیٚ دەبـیٚ لـە مـەریوان لـەو سـەردەمەدا پەیوەندییـەکی بـە تـین لـە نـێوان کۆمـەڵی مـەلا و فـەقیان و دەرەبەگـەکاندا دەبـیٚ ... دەرەبەگـەکان ئاموشـۆی حوجـرەی فـەقێکان دەکـەن و شـەواڵە بـە یـاریی گۆرەویـازی و دامـە و ریـزکێن و ئـەم جـۆرە شتانە شـەویان دەبـردە سـەر ... رۆژێکیـان لـە سـەر بـانێك لەگـەڵ یـەکێك لـە ئاغاکـاندا دادەنیشـیٚ و دامـە دەکـەن. لـە کـاتی یاریکردنەکـەدا

ئاغاکە وەکو بیەوێ گاڵتە بە قانع بکات پێی دەڵێ: (ئەو بەردە بخۆ) واتە ئەو داشە ڕێژنە بخۆ ... پێدەکەنێ... قانع تێدەگات، دوای یاریەکە تەختەی دامەکە لادەبات و پاش نەختێك دەڵێ: جەنابی (.....) خان با دامەکە بکەینەوە! ئەمجارە قانع لە جیاتی داشی چیلکە پشقلە بزن دادەنێ ... هەر چەن ئاغا دەڵێ، یان چیلکە، یان شقارتە دابنێ ... بە قسەی ناکا. کە دەستەکەن بە یاریکردن قانع پێی دەڵێ: جەنابی خان زەحمەت نەبێ ئەو پشقلە بخۆ ... ئاغاکە دەزانێ کە تۆڵەی خۆی لێ کردەوە یاریەکە تێکدەدات.

- لە دێیەك ئاشەوان دەبێ، دێکە دوو ئاغای دەبێ، ڕۆژێکیان لای ئاشەکەی دەبێ فەرمانبەرێکی گەورەی ئەو کاتە لەگەڵ کۆمەڵە سوارێکدا بەوێدا تێدەپەڕن، نایناسن ... فەرمانبەرەکە بانگیدەکا و دەڵێ: ئا وەرە ئاشەوان ... ئەمیش دەچێتە پێشەوە پێی دەڵێ: تۆ پیاوی کێی؟ ــ مەبەستی فەرمانبەرەکە ئەوە دەبێ بزانێ ڕەعیەتی کام ئاغایە ــ ئەمیش دەڵێ پیاوی کەس نیم ... دەڵێ چۆن پیاوی کەس نیت؟ دەڵێ باش! تەنیا پیاوی خۆمم ... فەرمانبەرەکە تووڕە دەبێ و دەڵێ چۆن پیاوی خۆتی؟ ئەویش دەڵێ بۆچی جەنابت پیاوی خۆت نیت؟ منیش وەکو تۆ پیاوی خۆمم ... دوای چەند جارێك لێی دووبارە دەکاتەوە کە هەر

بەم جۆرە وەڵامیدەداتەوە، ئینجا تێدەگات کە ئەمە قانعی ئاشەوانە ... داوای لێبوردنی لێدەکات.

ـ ئاشێکی دەبێ چەند تابلۆیەکی جۆربەجۆری نووسیبوون، لە شوێنە جیاجیاکانی ئاشەکەدا هەڵیواسیبوون، وەکو لە دارتوویەکی نووسیبوو (جێگای کەر بەستنەوە)... لە دارێکی تری نووسیبوو (جێگای دانیشتن)... لە بەر هەیوانی ئاشەکەی نووسیبوو (جێگای باراشخستن)... بەم جۆرە... رۆژێکیان کۆمەڵێك ئاغا و بەگزادە و وردە کوێخا و... لە راوە کەروێشکەوە دێنەوە، لا دەدەنە ئاشەکە و ماندوو دەبن، دەیانەوێ ئیسراحەتێك بکەن. هەموویان بە کۆمەڵ دەچن لە سێبەری ئەو دارەدا دادەنیشن کە لێی نووسراوە (جێگای کەر بەستنەوە)... قانع کە ئەمە دەبینێ دەستدەکا بە پێکەنین و دەڵێ: وەجاخزادەکان! تەشریف بێننە سێبەری ئەم دارە تر، ئەوە جێگای ئێوەمانان نییە... ئینجا ئەوانیش تابلۆکە دەخوێننەوەو بە شەرمەوە دەستدەکەن بە پێکەنین.

ـ لە سەرەتای سییەکاندا دەچێ بۆ بەغدا جل و بەرگێکی زۆر شڕۆڵانەی لە بەردا دەبێ، سەفەری ئەو کاتەش بە شەمەندەفەر دەکرا، لێی تێکدەچێ نازانێ بەیانی چەند شەممەیە... تەماشا دەکا

دوو سێ ئەفەندی سەریانکردووە بە یەکدا و ڕۆژنامەیەک دەخوێننەوە، لەمیش بۆ ئەوەی بزانێ چەن شەممەیە و چەندی مانگە، لێیان دەچێتە پێشەوە، سەربەسەر ڕۆژنامەکەدا شۆڕ دەکاتەوە بۆ ئەوەی بزانێ چ ڕۆژێکە... یەکێ لە ئەفەندیەکان دەیەوێ گاڵتەی پێکات دەیدوێنێ... کە دەکەونە گفتوگۆ، دەکەونە ناو کێشەی زمانشوناسیەوە... دەکەونە پرسیار کردن لە یەکتر... قانع پێیان دەڵێ: ئەگەر ئێوە زمانی خۆتان (عەرەبی) دەزانن مانای ئەم چوارینە شیعرە عەرەبیە چیە؟ لەوێدا بە دەستوبردی ئەم چوارینە شیعرە بە وشەی کوردیەوە لە قاڵبی عەرەبیدا دادەنێ:

و کویژات کویژلت بزورلت شارنا
مع ازمر و مکرون و دول هنارنا
و ئاو گاوی ساردی سر جنار بهاوینن
و داس و تور، و پاچ مشارنا ...

بەڵام پیتە کوردیەکانی وەکو (گ، چ، پ، ژ...) دەگۆڕێ بە پیتی عەرەبی ... ئەوانیش زۆر بیری لێدەکەنەوە ... تێناگەن، بەڵام داوای لێ دەکەن شیعرێکی تری بەم جۆرەیان بۆ بنووسێتەوە ئەویش زۆر تەڕدەستانە ئەم شیعرەی تریان بۆ دەنووسێتەوە:

**مضی زستان سرد اتیالله بهارا**

**فنفرح هوموان من دشت ام لشارا**

**منا بجوت جوتا بهیستر و کاجوت**

**منا یکیش دارا ، بکول ام حمارا**

پاش سەرێکی زۆر هەر تێناگەن، ئینجا داوای لێوردنی لێدەکەن.

ــ مەلای دێیەك دەبێ لە بناری شارەزوور... خەڵکی ئاوایی هەموو رۆژێ لە مزگەوت داوای لێدەکەن (حدیث) یان بۆ بخوێنێتەوە... ئەمیش بێزار دەبێ، رۆژێکیان دەڵێ: ئیمامی باوکی پشیلە بەم جۆرەی وتووە: (واتا ابا هريره ئەم حەدیسەی گێڕاوەتەوە)... گوورزالکی کوڕی رێوی، واتا (حنظله بن ثعلب) قوڕاوی کوڕی شووتی (سيل بن حب حب)... بەم جۆرە ئەوانیش دەڵێن مامۆستا ئەم ناوانە چین؟ ئەویش ناوەکانیان پێدەڵێ، خەڵکەکە دڵیان لێی سارد دەبێتەوە و دەچن مەلایەکیتر دێنن.

ــ لەگەڵ خزمەکانی لە دێی (کەولۆس) لە سەر چەند وردە بابەتێکی ئایینی دەبێتە ناخۆشیان و دێی کەولۆس بە جێدێڵێ... لە پاش ماوەیەك مەلایەکی برادەری دێت بۆماڵیان و داوای لێدەکات قاقەزێکی بداتێ بۆ شێخەکانی کەولۆس کە بیکەن بە مەلای خۆیان، ئەمیش قاقەزێکیان بۆ دەنووسێ، لە قاقەزەکەدا دەڵێ: بەو ناو و

نیشانەی خۆمتان دەرکرد، ئەمە بکەن بە مەلای خۆتـان... بـە حیـسابی ئەم مامۆستایە کەرەکەی جەجاڵ گوێچکەکانی لێرەوە تـا شـام درێـژن، ئەمە بۆ ئێوە زۆر بە کەڵکە.

ـ جارێکیان لەگەڵ برادەرێکیدا هەر یەکەیان باسـی رۆژێکـی رەشـی خۆیان دەکەن... برادەرەکەی دەڵێ من لە سووریا بووم، تەنیا (١٥٠) فلس پارەم پێبوو، ئەمیش دەڵێ منـیش لـە بـەغدا بـووم (١٤) فلسـم پێبوو.

ـ ساڵی (١٩٦٣) لە دێی (سێف) دەبێ لە ناوچەی مەریوان. بە فێتی ئاغایەك شەو دایەرەی سازمان دێن و لەگەڵ وریای کـوڕی دەیـانگرن. لەو کاتەدا دەیخەنە نـاو ئۆتۆمبێلەکـەوە پرسـیار دەکـات: بـۆ کوێمـان دەبەن؟ کابرای ئەفـسەر دەڵێ: تۆ نەخۆشی دەتبەین بۆ لای دوکـتۆر... لە ئۆتۆمبێلێکی سەر گیراودا دەیبەن بۆ تاران، ماوەیەك لـە بەندیخانـەی (قەجەر) بە حەپسـی دەیهێڵنەوە. کـاتێك بـەریدەدەن لـە بەندیخانەکـەوە سواری ئۆتۆمبێلێکیتری دەکەن بە ئەفسـەرەکە دەڵێ: زەحمەت دەبێ بۆ کوێمان دەبەن؟ ئەفسەرەکە پێی دەڵێ: بۆ میوانخانە واتا (ئوتێل) ئـەمیش دەڵێ: ئەمە حاڵی لای دکتۆرمان بوو، دەبێ حاڵی ئوتێلەکـەمان چـۆن بێ؟

ـ لە ساڵی (١٩٥٤)دا، لە دەورووبەری هەڵبژاردنەکەدا لە پێنجوێن دەبێ. مدیر ناحیەیەك لە پێنجوێن دەبێ، چەند جارێك دەیگرێ و بەرەڵڵای دەکات... ڕۆژێکیان دەیەوێ بە سەفەر بچێ بۆ ناوچەی بەرزنجە، دەچێتە لای مدیر و پێی دەڵێ: جەنابی مدیر بەگ، دەمەوێ بە سەفەر بچم، هەفتەیەکم پێدەچێ، ئەگەر لەم هەفتەیەدا گرتنومرتن هەیە ئەوا با نەڕۆم...

ـ لە ساڵی (١٩٥٩)دا بە فیق (...) ناوێك تێوە گلاو بە حەپسی بردیان بۆ عەمارە، ماوەیەك لەوێ دەمێنێتەوە. مێخەکەیەك لە پێی دەرهاتبوو کە چەند جار بە تایبەتی چوو بۆ لای دوکتۆر چارەی بکا، چارەی نەدەکرا. لە بەندیخانە مێخەکەکە هەڵدەوەرێ. کە هاتەوە نامەیەکی سوپاسنامەی بۆ (...) نارد، زۆر سوپاسی تیا کردبوو، نووسیبووی ئەگەر لوتفی جەنابت نەبوایە ئەو ئازار و مێخەکەیەم هەرگیز لە کۆڵ نەدەبوونەوە.

ـ لە پێنجوێن بە کاك عومەری حاجی عەبدوڵڵا، کە زۆر دۆستی دەبێ، وتبووی: فەردەیەك خەڵووزمان بۆ بکڕە. چەند ڕۆژێکی پێدەچێ، کاك عومەر بۆی ڕێناکەوێ بیکڕێ. ڕۆژێکیان پێی دەڵێ: بۆچی خەڵووزەکەی ئێمەت لە بیر چۆتەوە؟ ئەویش دەڵێ: مامۆستا خۆ ئێوە هەمیشە نان و ترێ و تەماتەی کاڵ دەخۆن ئەمانە خەڵووزیان بۆ چییە؟

ـ کە لە بەندیخانەی تاران لەگەڵ وریای کوڕی بەردەبن، بەڕێکەوت ئەو ڕۆژەشەکراوی کوڕی شا دەبێ... هەر یەك لە حەپسیەکان پاکەتێك شیرینیان دەدەنێ، ئەمیش وەریناگرێ. ئەفسەری بەندیخانەکە تووڕە دەبێ و دەڵێ: ئەمە دیاریی شایە لە هەموو شتێك شیرینترە... ئەویش دەڵێ: چەندە لای جەنابت شیرینە ئەوەندە لای من تاڵە.

ـ ساڵی (١٩٤٢) ڕێی دەکەوێتە دێیەك لە ناوچەی شلێر. بە لای ماڵێکدا دەڕوات، تەماشا دەکا کۆمەڵێك خەریکن گۆزە و دەرخۆنە دروستدەکەن ... ئەویش ئەم دێڕە شیعرە لە تەنیشتی گۆزەڵەیەك دەنووسێ:

ئـــاوی گـــۆزەڵەی خـــاکی کوردستـــــان

خـۆشترە لـــە ئـاو سەرچـــاوەی لوبنان

ـ مەلا عەلی شمشێرکوڵ گێڕایەوە، وتی: ساڵی (١٩٥٤) لەگەڵ قانع لە بەندیخانەی سلێمانیەوە ناردینیان بۆ هەڵەبجە. قانع بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە لە بەندیخانە ریشی تاشیبوو... لە ناو ئوتومبیلەکەدا دوو کابرای سۆڵی ئێرانیش، کە سنووریان شکاندبوو، بە حەپسی لەگەڵمان بوون و کەلەپچەیان لە دەستدا بوو... پۆلیسەکان کەلەبچەکانیان لە دەست سۆڵیەکان کردەوە، کردنیانە دەستی من و قانع... لەوێدا قانع دەڵێ: ریش تەنیا ئەمڕۆ بە کار هات کە من نیمە.

## تێبینی:

لە بەر چەند هۆیەکی تایبەت، کە باسمانکرد، کورتەیەك لە ژیان و بەسەرهات و قسە خۆشەکانی مامۆستا شێخ حەمە مارفی حەسەنی، بابە تایەری دۆڵاشی و مەلا رەسووڵی فەریقی دەنووسم. داوا کارم نەڵێن ئەمانە چ پەیوەندییەکیان بە قانعەوە هەیە.

بابە تایەر هاورێی خۆشەویست و خزمی بە ئەمەکی مامۆستا بووە و زۆر پێکەوە ژیاون، هەر وەها شێخ حەمە مارف کە شاگردی مامۆستا بووە.

مەلا رەسووڵ کە لە دەورانی لاویدا لەگەڵ مامۆستا قانع لە حوجرەدا زۆر پێکەوە ژیانیان بردۆتەسەر و خوێندوویانە و ئەم پایەبەرزە هێندێ لە شیعرەکانی مامۆستا قانعی نووسیوەتەوە و نەیهێشتووە بفەوتێن. بۆیە جێگای خۆیەتی باسی ئەم کەڵەپیاوانەش بکرێت، تا بەرهەم و ئاسەوارەکانی ئەوانیش کۆ بکرێنەوە و پێشکەش بە بارەگای کتێبخانەی کوردی بکرێن.

## شێخ محەممەد حەسەنی

## ‹شێخ حەمە مارف›

کاک مارف، لە بەر ئەوەی کە شاگردی مامۆستا بووە، لێرەدا کورتە ژیانێکی باسدەکرێت.

مامۆستا شێخ محەممەدی حەسەنی (بە ناو بانگ بە شێخ حەمە مارف) لە دێی بەرەمەرەشەی مەریوان لە دایکبووە، لە بنەماڵەی ئایینپەروەری مەردۆخییە. لە منداڵیدا لە خزمەتی باوکی بەرێزیدا شێخ فەتاحی بەرەمەرەشە، دەستیکردووە بە خوێندن و پاشان بۆ فەقێیەتی زۆربەی ناوچەی کوردستان گەڕاوە، تا بووەتە مەلایەکی زۆر چاك و مودەڕیسێکی لێهاتوو، بەڵام پێی خۆشبوو بە کاسبی و رەنجی شانی خۆی بژی و چووە شاری مەریوانو بوو بە خەیات و نووسەری دایرەش بوو. پاشان بوو بە مودەڕیسی زانستی ئایینی لە مەریوان، سەرئەنجام لە مەریواندا لە دنیا دەرچووە. ئەم پیاوە کەسێتییەکی ئازاد و نەفسبەرز و زۆر بە قەناعەتبوو، پێی خۆشنەبوو کەس یارمەتیی بدات و بە دەستگیریی خەڵك بژی. هەموو ژیانی پڕ بوو لە کوێرەوەری و ناسۆری. لە ژیاندا رەنجێکی زۆری کێشاوە. ئەم پیاوە زۆر قسەخۆشبوو. لە هەر کۆڕ و کۆمەڵێکدا بوایە کۆڕەکەی دەرازاندەوە و هەموو کەس پێی خۆشبوو لە خزمەتیدا بێت. زۆر خوێندەوار و شاعیرێکی چاکبووە. دیوانی شیعری هەیە کە هێشتا چاپنەکراوە. ئەمەش چەند نموونەیەك لە قسەخۆشەکانی.

حەمە عەلی بەگی کەڵەوێنجە گێڕایەوە و فەرمووی:

کاکە مارف مـنی زۆر خۆشدەویـست. لـە نەخۆشـیەکەی دوایـدا عەرزمکرد: کاکە مارف لـە مـەرگ دەترسـی؟ فـەرمووی لـە مـەرگ ناترسم، تەنیا لەوە دەترسم کە لێی نەدەترساین.

کـاك یوسـف گێڕایـەوە کـە مـەلا حسـەین «ولـەژێری» گێڕایـەوە و فەرمووی:

لە کانیسانان دەمخوێند و نیازمان پەیدا کرد بە کتێبی «خـەرپوورتی» ــ پێم وایە لە سەر قەسیدەی بوردیە دەنووسـێ و خـەرپووتیش دەڵـێن دێیەکە لە کوردستاندا، وتیان شێخ حەمە مارف لە مەریوان ئەم کتێبەی هەیە. منیان نارد بۆی چـووم لـە مـەریوان لـە دوکـانێکدا دۆزیمەوە و عەرزمکرد منیان ناردووە بۆ کتێبی خەرپووتی. وتی: خێرا پووتێك کـە لە دوکانەکەدا بوو هێنای و فەرمووی ئەمە پووتەکەی لە سەری دانیشە جا ئێوارە گاگملەکەش هاتەوە خەرەکەت بۆ دێنم.

کاك یوسف گێڕایەوە و فەرمووی:

کاکە مارف هەموو ژیانی دەستکورتی بـووە، وەکـو زۆربـەی پـیاوە گەورەکان بە نەداری ژیاوە. لەم ئـاخرەدا ناچـار بـوو دەرس بلێـتەوە. رۆژێك ئیمام جومعـەی پێشـووی مـەریوان، «مامۆسـتا مـەلا کـەریمی» رەحمەتی کـە پـیاوێکی چـاك و قـسەخۆشـبوو، جـار جـارە بـۆ خۆشـی قسەیدەکرد، بە نوشتە نووسێك، کە پێم خۆش نییە ناوی بـەرم، دەڵـێ: تۆ بۆ هەموو شت نوشتە دەنووسی؟ دەڵێ: بەڵێ. دەفەرمێ: بۆ پـیری و ئەو شتانەش دەنووسی؟ دەڵێ: بە زەمانەت، ئەگـەر وەك پـیاوێکی چـل

ساڵەت لێ نەهات پارەکەت دەدەمەوە. کاك مارف گوێی لـێدەبێ، بـۆ ئەوەی کابرای نوشتەنووس دەمکوت بکات دەڵێ: هەر بۆ ئیمام جومعە دەنووسی، یا بۆ خەڵکی‌تریش؟ دەڵێ: بۆ هەموو کـەس، بـەڵام گرانـە. کاك مارف کە دەزانێ ئەمە درۆیە و نابێ. دەڵێ: بە چەند؟ دەڵێ: پێنج هەزار تمەن. دەڵێ: دەی وەڵڵا من هەر ئێـستە پێنج هـەزار تمەنەکـەت دەدەمێ، نوشتەکەم بۆ بنووسە، بەڵام بـە شـەرتێ. دەڵـێ: شـەرتەکەت بڵێ. دەڵێ: ئێمە باتریەك، یا گڵۆپێ (لامپ) لە دوکانێ دەکڕین بۆمان تاقیدەکەنەوە. ئێمەیش بە باوەڕ پارەکەی دەدەین. من پارەکەت دەدەمێ نوشتەکەم بۆ تاقیکەرەوە، ئەگەر ڕاستبوو پارەکە نۆشی گیانتبێ. کابرای نوشتەنووس هیچ قسەیەکی بۆ نامێنێ و خێرا دەچێتە دەرەوە.

## بابەتاهیر

**(بە فەرموودەی سەی رەشیدی کوڕی)**

**بابەتایـەر یـەکجار هـاوڕێ و خـزمی نـزیك و خۆشەویـستی مامۆسـتا بووە، هەتا لە مەریواندا بووە هیچ کاتێ لـە یـەکتر جیـا نەبوونەتـەوە، لـە بەر ئەوە زۆر بە کورتی کورتەیەکی ژیان و قسەخۆشەکانی دەنووسم.**

**لـە نـاو هـەر شـار و دێیـەکدا، لـە هـەر ناوچـە و بنـارێکدا، لـە نـاو هـەر کۆمـەڵ و بنەماڵـە و خێـزانێکدا، کەسـانێك هەڵدەکـەون کـە لەگـەڵ دانیشـتوانی دیکـەی ئـەو ناوچـەدا جیاوازییـەکی تایبەتمەندیـان هەیـە. بابـە تـاهیر یەکێکـە لـەو کەسـێتییانە بـووە، کـە لـە نـاو خـەڵکی شـار و دێهاتـەکانی مـەریواندا ڕێـزێکی تایبـەتی هـەبووە. بابـەتاهیر کـوڕی شـێخ عـارف کـوڕی شـێخ عـەلی سـەرگەت**

و لە بنەماڵەی بابە ناوسی سەرگەتە. دایکی شێخ عارف خاتوون خەجیج کچی شێخ عوسمان سیراجوددینی تەوێڵەیە، دایکی بابەتاهیر خاتوون رەعنا کچی شێخ سەعیدی دۆلاش و لە بنەماڵەی کابلی مەریوانە. «کابل» یا «کاك ئیبراهیم» یەکێ بووە لە قوتابییە ئایینییەکانی مەلا ئەبووبەکری چۆڕی، کە لە مزگەوتە سوورەی ئیمام، خوێندوویەتی و دەگەڕێتەوە بۆ دەوری هەڵۆ خان بەگی ئەردەڵان. بابەتاهیر جگە لەوەش، لەگەڵ قانعی شاعیردا پوورزاربوون، واتە دایکی بابە تاهیر خوشکی باوکی قانع بووە. هەر لە منداڵییەوە پێکەوە ژیاون و پەیوەندییەکی زۆریان لە بەینیدا بووە. بابەتاهیر هەر چەند پێنجەمین کوڕ بووە لە بنەماڵەکەی خۆیاندا، بەڵام لە پاش مردنی شێخ عارف هەموو کاروباری بنەماڵەکەی خۆیانی دەکەوێتە دەست و لە زەمانی بابەتاهیردا دۆلاش دەبێ بە مەڵبەندی ئاشتیخوازی لە ناوچەی مەریواندا. عەشیرەکانی مەریوان لە ناو یەکتردا دەبوو بە شەڕیان و لە یەکتریان دەکوشت. دێهاتی یەکتریان تالاندەکرد. کاتێ دەهاتە وەختی ئاشتی، هەر دوو لایەن دەچوونە دۆلاش و لە دۆلاش ئاشتدەبوونەوە. تا ساڵی (١٣١٠) کە بەگزادەکانی مەریوان لە لایەن رەزاشا دەگیرێن، دەیانئێرن بۆ قەسری قاجار. بابەتاهیر و قانع را دەکەن بۆ عێراق. بابەتاهیر لەگەڵ هەموو تایفەکانی عێراقدا، بە تایبەت شێخەکانی کۆنەپۆشی، شێخەکانی بەرزنجە و بەگزادە جافەکانی هەڵەبجە پەیوەندیی باشی هەبووە. بابەتاهیرو قانع، هەر دووکیان ناودار

بوون بە قسە خۆشی. هەر دوو لە هەر کۆڕێکدا بوونایە دیار بوون. قانع هەر قسەی خۆشی بکردایە دەیوت وەکو بابەتاهیر وتی ئەویش هەر وەها دەیوت ... بۆ نموونە باسی چەند قسەیەك لە قسە خۆشەکانی بابەتاهیر دەکەین:

مەلا محەممەدی حافز لە زمانی حاجی مامۆستای «ولەژێر»ەوە گێڕایەوە و فەرمووی:

بابەتایەر نەخۆشبوو، چووین بۆ هەواڵپرسی. دەستکرا بە قسە و مامۆستا سەی عەلی «نێ» فەرمووی: بابەتایەر، یاخوا قەزاتکەوێ لە کوڕەکانم. بابە تایەریش سەری بەرزکردەوە، بە دەنگێکی نزمەوە وتی: خوا قەزام نەخا لە کوڕەکانت. قەزام بخا لە فڕووجێکان کە بۆم سەر بڕن.

مامۆستا یوسف دیسان لە بابە تایەر گێڕایەوە فەرمووی:

لە لێقەوماێکدا کە چووبووینە «هەوارەسووتە» بۆ زانینی دەنگوباسی مەریوان، رەشەی کوڕی ناردبوو بۆ مەریوان بۆ زانینی دەنگ و باس (سەی رەشید بابا تایەر کە ئێستا لە مەریوان دادەنیشێ و خەریکی کاسبییە) دایکی چووە دەرەوە، کە دی بۆراندەکا و زۆر ساردە وتی: رۆڵەڕۆ، بەخوا ئێستا رەشە رەقبووەتەوە و لێی قەوماوە، من چی بکەم؟ کە دەهاتە ژوورەوە دەهاتە بەر سۆپاکە و دۆڵمە لە سەر سۆپاکە دانرا بوو، دانەیەکی دەر دەهێنا و دەیخستە دەمیەوە، دەیوت شوکور هەواکەی شکاند.

**مەلا محەممەدی حافز گێڕایەوە و فەرمووی:**

«مامۆستا مەلا موحەممەد ئەمینی کانی‌ساان» لە بەر ئەوەی تەنیا هۆدەیەکیان گەرمدەبێ، جارێکیان «ڕەعناخازێ» دەتۆرێ و دەچێتە ماڵیان، لە بەر ئەوە مامۆستا دێتە حوجرە دەخەوێ.

ڕەمەزان دەبێ مامۆستا دەڵێ بابە تایەر بۆچی نایەن بۆ تەراویح؟

بابەتایەریش دەڵێ: بێقەزابی، تۆ ڕەزا حۆجێم بۆ دینی بۆ تەراویح، بۆی نارەقی ڕۆژە ڕێمك دەڕوا. تۆ ڕەعنا خازێ بێنە بۆ تەراویح، من لە جیاتی ٢٣ ڕکات ٣٣ ڕکاتت بۆ دەکەم.

**کاکە ڕەشە، کوڕی بابەتایەر گێڕایەوە و فەرمووی:**

کاتێك ماڵی لە «بناوەسووتە» دەبێ، دەچێت بۆ بیارە. بۆ خزمەتی شێخ عەلادین، چەند ڕۆژێ لەوێ دەبێت، پاشان دەچێتە خزمەتی شێخ، خواحافیزی بکات و بگەڕێتەوە. شێخ دەفەرمێ بابەتاهیر حەواڵەیەکم بۆ نووسیوی برۆ لە ئەحمەوئاوا سێ تەنەکە گەنم وەر بگرە و دوعای خێریشت بۆ دەکەم. بابەتاهیر دەڵێ: قوربان حەواڵەکە بکە بە چڵ تەنەکە و کاتێ قونووت دەخوێنی دوعای شەڕم لێبکە!

**دیسان کاکە ڕەشە، کوڕی بابەتایەر گێڕایەوە و فەرمووی:**

حکوومەتی عێراق بابەتاهیر دوور دەخاتەوە بۆ کەرکووك. لەوێ مەنزڵی دەبێتە ماڵ «سەید ئەحمەدی خانەقا» کە پیاوێکی زۆر ناوداری خاوەنی تەریقەت بووە، جارێکیان نان دەبەن بۆ بابەتاهیر، بۆ نان خواردن پیاوێکی عەرەب دەبێتە ڕەفیقی. عادەتی پیاوە عەرەبەکە وابووە

خۆرشتەکە بکا بە سەر برنجەکـەدا و تێکـەڵی بکـا بـە یـەکدا، ئـەویش دەستی دەگرێت و دەڵێ: نەکەی. دەڵێ: من و تۆ شـەریکین یـەکێکیان هەڵگرە. سەید ئەحمەدو کە ئەم باسە دەبیستێ و دەڵێ نانی تایـەتی بـۆ بهێن.

کاکە رەشە کوڕی بابەتایەر گێڕایەوە و فەرمووی:

بابە تاهیر دەچێ بۆ بەغا بۆ خزمەتی شێخ مـەحموودی نـەمر، لەگـەڵ شێخ لەتیف و شێخ جەلال دەچن بۆ بازاڕ کاتێ دێنـەوە بـۆ مـاڵ شـێخ مەحموو دەفەرمێ بابەتاهیر دەتوانی عەرەبی قسە بکەی؟ ئـەویش دەڵـێ: قوربان عەرەبی زۆر ئاسانە، هەر وەك قسـەی خۆمانە تەنیا بە زیاد کردنی الف و لام دروستدەبێ.

کاکە رەشە کوڕی بابەتایەر گێڕایەوە و فەرمووی:

بابە تاهیر لە پێنجوێن باشچاوەشی پۆلیسـدەبێ، لەگـەڵ کۆمـەڵێکی سـەدکەسیدا. ئەفسـەرێکی گەورە بەرپرسی ئامووزشی نیزامییان دەبێ. لە کاتێکدا کە ئەفسـەرەکە دەڵێ: استعد (خەبەردار)، کە لـە خەبـەرداری ئامووزشی سەربازیدا نابێ هیچکەس جموجووڵ بکات. بـەڵام لـە عـەینی خەبـەرداردا بابـەتاهیر قوتـووی سـیگارەکەی دەردێنێـت و جگەرەیـەك دادەگرسێنێت. ئەفسەرەکە دەڵێت: بابە تاهیر ئەوە چی دەکەی؟ ئەویش دەڵێ: بەگم، ئەگەر من لەم گۆشەوە نەفەسێ لـەم جگەرەیـە بـدەم، چ زەرەرێ لە سیاسەتی حکوومەت دەکەوێت؟!

## مەلا رەسووڵی فەریقی

«مەلا رەسووڵی»ی فەریقی ساڵی (١٣٢٢) هەزار و سێ سەد و بیست و دووی کۆچی لە دایك بووە، لە دێی «کۆخەمامۆی» پشت ئەربەبا، کە دەکەوێتە سەر سنووری نێوان عیراق و ئێران لە دایکبووە. لە تەمەنی دە ساڵیدا نێردراوە بۆ قوتابخانە. لەو زەمانەدا کە دەستی بە خوێندن کردووە سنووربەری رووس و تورك هاتۆتە پێشەوە. باوکی لەو سەفەربەرەدا بۆ خاکی عیراق، لە پاش چوونە دواوەی رووس و تورك چووەتە دەرخوێندن، لە حوجرەکاندا دەرسی ئاینی خوێندووە. چواردە ساڵ لە فەقێیەتی بووە، زانستە ئاینییەکانی تەواو کردوون و زۆرتر خوێندنی لە مەریوان بووە، لە هەورامان، کوردستان (سنە)، قەرەداغ، سەقز، بانە و سلێمانیش خوێندوویەتی. لە زانستی فارسیدا خۆی ماندوو کردووە، هاورێی کاکە حەمەی بێلوو بووە و زۆر لەگەڵ مامۆستا قانعدا بووە، زیاتر لە ساڵێك لە یەك حوجرەدا پێکەوە بوون.

خوالێخۆشبوو مەلارەسووڵ (فەریقی) یەکێکبووە لە هاورێ خۆشەویستەکانی مامۆستا قانعو زۆر پێکەوە بوون، شیعری زۆریان وتووە، ئەو شیعرانەی مامۆستا، واتە بەیاز، کاك نوەندی کچەزای دای بە من تا شیعرەکانی مامۆستا قانع جیا کەمەوە و بڵاونەکراوەکانیان بڵاو بکەمەوە، هەر وەها ئەم مەلا رەسووڵە بەیاز و کتێبی زۆری مامۆستا قانعی نووسیونەتەوە، یەکێ لە کورەکانی بردوویەتی بۆ

(مووزەخانەی) مووسڵ لەگەڵ چەند کتێب و نووسراوە و شیعری مەلارەسووڵدا، بەخشیویە بە مووزە و مووزەیش (٧٥) دیناری بەخشیوە بەو، گوایا بۆ ئەوەی نەفەوتێن!! من داوام لە کچەزاکانی کرد، کە کاك هیوا و کاك ئومێدن و ئامۆزای خۆمن، کەسێك بنێرن بۆ مووسڵ بەڵکو هەر جۆرێ بووە، بیانهێننەوە تاکو بەرهەمەکانی مامۆستا قانع نەفەوتێن. بەڵام لەبەر سەرقاڵی نەیانپەرژا وەڵامم بدەنەوە. زۆر هاوارمکرد ئەم شاعیرە دڵسۆزە کتێبی زۆری هەیە، بە تایبەت لە مێژوودا نووسراوی زۆرە، هەر لە منداڵییەوە تا ماوەیەك پێش مردنی باسی جۆری ژیانی ئەو سەردەمە و ساڵی گرانی، هاتنی رووس، باسی ئینگلیس، شێخ مەحموودی نەمر، سەرۆك عەشیرەتەکان، مەحموودخانی دزڵی و مەریوان و شەڕی عەشایری دەکا و زۆر نوکتە و قسەی سەیری تیایە. بە یارمەتی خوا، پاش کۆکردنەوە و ئامادە کردنی چاپیدەکەم.

هەر وەها کتێبە شیعرێکی مێژوویی جوان و زۆر رێکوپێکی هەیە. شیعری زۆری لەگەڵ مامۆستادا هەبوون. برێکیان ماون و زۆریشیان لە ناو چوون، نموونەیەك لەو دیرۆکەی کە بە شیعر نووسیویە ئەمەیە:

لە پاش گرانی و رووس هەتا ئەمڕۆ

نیتر کوشتنە و گرتنە و بڕۆ

لە دوای تەواو بوون رووس و گرانی

ئینگلیس قدوومی بۆ عراق هانی

تورکـــــی ئەستەموول لەگەڵ عەنەدۆڵ

هەرچی دەرچووبوون ڕۆیین کۆڵ بە کۆڵ

کـــــە ئینــــگلیس هات بۆ خاکی عیراق

هێنـــای بۆ میللەت کووتاڵ و ئـــەرزاق

هەم شەکر و چـــای هێنا بە تەلیس

دای بە مەخلووقات بـــە مەکر و تەلبیس

کەم کەم مەخلووقی زینــــدوو کردەوە

ئـــەوی بڵاو بوون گردیکـــــــــــردەوە

وڵات کە چۆڵبوو تـــەعمیر کــــــراوە

چـــوار ماڵ و پێنج ماڵ لە هەمـــوو لاوە

ماڵیـــــان کردەوە قۆخ قۆخ و ماڵ ماڵ

دێی سەد ماڵی گەیشت بووە بە دە ماڵ

بەعزێ دێهاتیش هـــەر چۆڵبوون وێران

کـــەســــــی تیا نـــەما بیکا ئاوەدان

پێم بـــاوەڕ بکـــەن ئەمە یەقینە

..............................................

ئـــەمجار کە عیراق پڕ بوو لە ئینگلیس

کەوتـــــە عەدالەت بە فێڵ و تەلبیس

لەگەڵ شێخ مـــەحموود کەوتە گفتوگۆ

وتـــی وڵاتـــی کـــوردم دا بـــە تۆ

تـــۆم کرد بە مەلیك لە بۆ کوردستان
کوردی عیــراق و هەم کوردی ئێران
کە بـووی بە مەلیــك بۆ ئەو کوردانە
ئـــەفسی مـــەملەکەت لە من بزانە
لە جادە و مـەکتەب لە خەستەخانە
هەمـــووی ساز ئەکەم بۆ ئەم کوردانە
هەرچـــی تەڵەبکـەی من پەکت ناخەم
تـــفەنگ و ســـلاح لـــە زۆر و لە کەم
لە گاجووتی جووت لە تۆو لـــە پـــارە
لـــە بـــۆ میـللەتـی رووت و هــەژارە
فەیسەڵی ئەوەڵ بە خــۆشی و تەرەب
ئەیــکــەم بـــە مەلیك (سیدالعرب)
ئەبێ مـــەلیکبێ بــــۆ عەرەبـــستان
ئـــەتـــۆش مەلێکبە لە بۆ کوردستان
لــە هـەموو دنیـا بە ئەمری مەعبوود
ناوی مەشهوور بوو بە مەلیك مەحموود
سلێمـــــانی بووە پایـتەختی کوردان
حوکمڕانی کورد مەلیك مـەحموود گیان
▯

لێرەدا باسەکە درێژە و بوار نییە بڵاوکرێتەوە، تا دەگاتە ئێرە:

ئـــــەمجارە ئینگلیس کەوتە فڕ و فێڵ
بە حــــوقەبازی و هەزار مەکر و فێڵ

کە زانی کـــــوردی عێراق و ئێران
لـــەو کـــۆ بوونەوە بە دڵ و بە گیان
فریـــای خۆی کەوت و کەوتە سیاسەت
لە بـــۆ کەوتنی لـــە سـەر ریاسەت
چەند مەکر و حیلەی بۆ بە کـــار هێنا
ئاخری کردی بــــە شەڕ و دەعـــەوا
چەند شەڕ و هەرای مەلیك لەگەڵ کرد
بە هیــــــــــچ بابەتێ زەفەری نەبرد
شەڕی ئاوباریـــك، هەم شەڕی دەربەند
لەگەڵ ئینگلیسی شــــوومی ناپەسەند
چەند شەڕیشی کرد لە پیرەمـــەگروون
چـــەندکەس لەئینگلیس کوژران لە ناو چوون
لە هۆردووی مەلیك چەند شەهید کرا
بـــەعزێ لە دەربەند بە ئەسیر برا
بە ئەسیر گیرا ئەوەی شێخ مەحموود
بـــردیان بەرەو خواربەئەمری مەعبوود
ئیـــتر نـــازانم لە کـــوێ دانرا
لە چ شارێکا دەست بە سەر کرا
هەردوو مەحموودخان دزلی و مـــەریوان
زۆری پـــــێنەچوو ئەوانیش گیران
لەگەڵ شێخ مـــەحموود دەرچوون لـــەسەرحەد
ئاگـاداریـانبوو حاجی کاك ئەحمەد

لێرەدا باسەکە درێژە و پاشان زۆرتر باسی شێخ هاتووە کە لە خەباتدا تەسرەوتووە و شەڕی زۆری کردووە، لە ناڵپاریز و لە ... پاشان نێوانی لەگەڵ مەحوورخانەکان و چوومتە پیران و زۆر بە درێژی باسیدەکا و پاشان بە تەنیا مایەوە و مەلیک فەیسەڵی ئەوەڵ گرتی و تا کۆتایی زۆر باسی شێ‌تر دەکا، دیارە کوردێکی بە داخە و ئەم کتێبە مێژوویی‌یە بایەخدارە حەیفە بفەوتێ. مەلارەسووڵ ژیانێکی مەلایانەی بووە. دێ و شار زۆر گەڕاوە. رەنجی زۆری دیوە، سەرئەنجام لە مانگی شەشی ساڵی (١٩٦٩)ی عیسایی ماڵاوای لە گەل و نیشتمانەکەی کردو لە دێی (گۆڵێ) بە خاك سپێردرا.

ئەمەش نموونەیەك کتێبە مێژووییەکەی

لە ئەوەڵی گرانی کە رووس گەڕاوە، ماڵمان لە تازەوێنەی شلێر بوو، رۆژێك باوکم دوو شەقازلەی لێدام، بازێ گریام، ئەمجار کتێبێکی گولستانم هەبوو هەڵمگرت و رۆیشتم روو بە پێنجوێن ــ مەریوان. دوو گەز کەتانم هەبوو بۆ کەوا، سێ قەران پارەم پێبوو لەگەڵ قوتووە جگەرەیەك، گەیشتمە دەشتی وریاوا، ئیتر نازانم بۆ کوێ ئەچم و نازانم ئەو دەشتە کوێیە، کتوپڕ دوچاری دوو عەسکەر بووم، یەکێکیان تورک بوو، ئەویتریان کورد بوو. رووتیانکردمەوە و کەتانەکە و پارەکە و قوتووە جگەرەکەیان لێسەندم و رۆیشتن. منیش دانیشتم و دەستمکرد

بە گریان، پیاوێك هاتە لام و تەماشایکرد کتێبم پێیە. وتی: کوڕەکە لە بەرچی دەگری؟ وتم: دوو نیزام ڕووتیانکردوومەوە، بۆ مەریوان دەچم، نازانم بۆ کوێ بچم و لە کوێوە بڕۆم. وتی: بچۆ بۆ لای ئەو قەڵایە، ئەوە قزڵجەیە، گەورەی نیزامەکان لەوێیە شکایەتیان لێ بکە ئەسپابەکانت بۆ ئەسێنەوە، ئیتر لەوێوە بچۆ بۆ پێنجوێن، هەر لەوێوە پێنجوێنی نیشاندام. چوومە لای قوماندار لە قزڵجە. تورکبوو، پێش خزمەتێك بە تفەنگەوە لە دەرگای خێوەتەکەیدا وەستابوو، دەریکردم، گریام، چووە ژوورێ و دوو سێ قسەی لەگەڵ قوماندار کرد، هاتە دەرەوە و نیزامیەکی کوردی بانگکرد، نیزامەکە هات و وتی: بۆچی ئەگریت؟ وتم: فەقێم، دوو نیزام ڕووتیانکردووم. چوو بە قوماندراری وت و هاتەوە دەر و وتی: ئەگەر چاوت پێیان بکەوێتەوە ئەیانناسیتەوە؟ وتم: بەڵێ. چووەوە ژوورەوە و هاتەوە دەرێ، وتی: دانیشە تا دێنەوە. بە قەدەر سەعاتێکی پێچوو ... تەماشامکرد نیزامیەکانن، جا دوای سەندنەوەی شتەکان و چەند باسێ تر، تا دەگاتە ڕێگا نیشاندان. مام ئەحمەدی ناو بوو، ناشتایە ڕێگەیان پێ نیشاندام چوومە ئاسناوا، چۆڵبوو، یەك دوو ماڵێك بوون، ئەوانیش کلاودزلی بوون، (مام قایەر و مام پیرە)، شەو لە ماڵی مام قایەر بووم ناشتایە ڕێی سەردۆشیان نیشاندام،

چوومە سەردوێش و لەوێوە چوومە مزگەوت. تەسادوف مامۆستا و سێ چوار پیاوی گەورەی لێبوون قسەیان نەکرد. چووم دەستی مامۆستام ماچکرد، بە فەقیری لە خزمەتیا دانیشتم. مامۆستا مەلا سلێمان فەرمووی: رۆڵەکەم لە چی ئەگەڕێت؟ عەرزمکرد: قوربان لە خوێندن ئەگەڕێم، کەسێ بە خێری خۆی دەرسم پێ بڵێ. فەرمووی: رۆڵە گیان لێرە جێگە نیە چونکە هێشتا دێەکەمان ئاوەدان نەبۆتەوە و نان دەستناکەوێت. لەو پیاوانەی کە دانیشتبوون، فەرەج بەگ بوو، یەکێ تریان بارامبەگ بوو، حاجی کاکە حەمەی بانەیی و ئەوی تریان سۆڵ فەرەج ناوێك بوو رەحمەت لە جەماعەتیان و خوای تەعالا هەموویان عەفوو کات لە بەر خاتری پێغەمبەر(ص). ئاغا وتی: رۆڵە یاسینت لە بەرە؟ وتم: بەڵێ کە بە دەرس خوێندوومە هاتۆتە بەرم لە فکرم نەچۆتەوە. فەرمووی: مامۆستا ئەم کوڕە راگرە لە بەر دەستدا بێت، گرانیە مردن زۆر ئەبێت، مەعلووم شەوی وا ئەبێت لە چوار، پێنج ماڵ بانگتەکەن بۆ یاسین. تۆش بێتاقەت ئەبی و ناتوانی، بەلام ئەم کوڕە سووکە نەیەتوانێ. مامۆستا فەرمووی: نان نیە، فەرمووی من سێ نانی پاکی ئەدەمێ، بارام بەگ وتی: منیش نانێك. حاجی کاکە حەمەیش وتی: منیش نانێك. ئەمجا مامۆستا فەرمووی: منیش دەرسی پێ

ئەڵێم. دووبارە فەرەج بەگ فەرمووی: هەموو ئێوارە و بەیانییەك بێ بۆ ماڵی ئێمە، چێشت وەر بگرە، بە خەمی تۆیشت دەکەم. حاجی فەرمووی: خەڵکی کوێی؟ عەرزمکرد: کۆخە مامۆیی بانەییم. فەرمووی: دانیشە ئینشائەڵڵا بەکتاکەوێ، دانیشتم. قورئانم باش ئەزانی و زۆرم ئەخوێند ئەمجار زستان هاتە پێشەوە. شەو هەبوو چوار ماڵ تا شەش ماڵ ئەهاتن بە شوێنمدا بۆ یاسینخوێندن، ئەچووم یاسینم ئەخوێند، تا بەهار زۆر بە خۆشی رامبوارد. چونکە برسیم نەدەبوو و سەردۆشی زۆریان خۆشئەویستم، فەرەج بەگ خوا لە گوناهی خۆشبێت هەموو رۆژێ قەرانێکی سپی دەدامێ، منیش ئەمدا بە یەك کەباب و یەك چا، چونکە کەبابخانە و چاێخانە لە هەیوانی مزگەوتەکەدا هەبوون. مەرحوومی کاکە حەمە و میرزا عەبدوڵڵاش، خوا عەفوویانکات خزمەتیان ئەکردم، هەتا بەهار بەم نەوعە رامبوارد. زۆرتر عومری خۆم لە قورئان خوێندندا سەرفکرد، بەرەکەتی قورئان وەها تێریکردبووم ئەگەر سێ رۆژ هیچم نەخواردایە برسیم نەدەبوو. رۆژێك مامۆستا، رەحمەتی خوای لێبێ، ناردمی بۆ (موسك)، دێیەکە لە پشت قەڵای مەریوان، بۆ لای مەحموودئاغا ناوێك، بزنێکی دابوویە کە دزی بخوات، بەشکو بۆی بنێرێتەوە. منیشی نارد کە بۆی بێنمەوە، تەسادوف کە

چـووم لــە مـاڵ نـەبوو لــە بــەر ئــەوەی کــە مامۆســتام ئــەمری پێکــردبووم کــە تــا نەیهێنمــەوە نەیمــەوە، ســێ شــەو و ســێ ڕۆژ لـەوێ دانیشـتم نەهاتـەوە. ئـەو سـێ شـەو و ڕۆژە هیچـم نـەخوارد. وەختی نیوەڕۆ هاتـەوە پێم وت بـۆ بزنەکـە. وتـی: هـەتیو مامۆسـتات بـزنی لـە مـن ئـەوێ، برسـیمبووە بزنەکـەم خـواردووە، مامۆسـتات چیمان لێدەکـات، هەڵسـە بـڕۆرەوە. ئـیرادەی خـوا وەهـا بـوو ئـەو سـێ شـەو و سـێ ڕۆژە کـە هـیچ نـەبوو بـیخۆم برسـیم نـەبوو لـە بەرەکـەت قورئانـەوە. ئـەمجا هەڵسـام هاتمـەوە ڕوو بـە سـەردۆش، گەیشتمە خوار قـەڵاوە تەماشـامکرد کاکـە عـەزیزم پـەیدا بـوو، خـوا لـێیخۆشـبێت دەسـتیکردە مـلم، دەسـتیکرد بـە گریـان، منـیش دەسـتمکرد بـە گریـان، وتـی: بـاوکم و حەمەرەشـیدی برامـان و حسـێن و ڕەحمـانی برامـان هیچیـان نـەماون. هـەر دوو بـە گریـان بەرێدا ڕۆیشـتین. شـەو چـووینە کـانیسـانان، چـووینە مزگـەوت دوو کـەرەت چـوومە مـاڵی مـەحموودخانی خوالێخۆشـبوو بـۆ نـان. یـەك نانیـان پـێدام ئەویشـمدا بـە کاکـەم، ئـیتر ئـەو شـەوەش هیچـم نـەخوارد، ئەمـە چـوار شـەو. بـەیانی چـووینەوە سـەردۆش، دوو سـێ ڕۆژ کاکـەم لـەوێ مایـەوە و هیچـی نـەوت، پـاش دوو سـێ ڕۆژ وتی: مـن بۆیـە هـاتووم کـە تـۆ بەرمـەوە بـۆ کۆخـەمامۆ. وتم: بۆچـی بێمـەوە؟ وتـی: خـەڵك چـوونەوە بـۆ سـەر موڵکـەکانیان، ئێمـەش

بڕۆینەوە با مولکەکەمان خەڵك نەیانخوات. وتم: کاکە من نایەمەوە، ئەگەر بێمەوە لە برسان دەمرم، لێرە ئەخوێنم و نانم دەستدەکەوێت، لەوێ نان نییە. وتی: نان نییە گیا زۆرە، برسیمان نابێ، نەمزانی بە گیای هەردی ئەڵێت. وتم: مامۆستا مەرەخەسم ناکات. وتی: ئەبێ هەر بێیتەوە. وتم: من ئەخوێنم نایەمەوە. دەستیکرد بە گریان منیش لەگەڵ ئەودا ئەگریام، من لە بەر ئەمە کە هۆکی لێگرتبووم کە بچمەوە، ئەویش بۆ ئەوە ئەگریام، لەگەڵیدا ناچمەوە ئاخری زۆر گریا و پاڕایەوە، منیش بە دڵگەرمی چوومە خزمەت مامۆستا، ئەم حکایەتەم عەرز کرد، فەرمووی: رۆڵە لە بانە نان دەستاکەوێت، مەچۆرەوە، چوومە لای کاکەم. وتم: کاکەم خوا حافیزت بێت نایەمەوە، دیسان دەستیکرد بە گریان. چوومە خزمەت مامۆستام ئیزنم لێ تەڵەبکرد، ئیزنی دام، فەرمووی: رۆڵە ئەڕۆیت، بەڵام ئەمریت، ئێمە زۆرمان خۆشئەویست حەیفی ئەمریت، بۆ ئێمە سووکەڵە بووی، لێستەش ئەگەر هاتیتەوە جێگای خۆتە. مامۆستا ئەملاوئەولای ماچکردم، خواحافیزیم لێکرد، شوێن کاکەم کەوتم، چووین بۆ خان. هەمینەی خوشکم، کاکەم، لەوێ بەجێیهێشتبوو. ئەویشی لەگەڵ خۆی هێنا، ڕۆیشتین بۆ رەشەدێ، هیچمان پێ نەبوو بیخۆین. شەو چووە ماڵێك، تەقریبەن مستێك

بەرووی هێنا. بەیانی زوو لە ترسان رۆیشتین بۆ باوەمیر، لە پشتی گۆخلان لە ساوجی، بە دیوی شلێردا، شوێنێکی قوولێ بەڵام مالی کوێخا فەتاحی باوکی مەلاعەبدولکەریمی کۆخەمامۆیی لەگەڵ یەك دوو ماڵیتری لیبوو، شەو لەوێ بووین، رۆیشتین بە دوو شەویتر، هاتین بۆ کانیشێخی پشتی ولیاوا، شەو لە ژێر بانیژەیەکی رووخاودا تا بەیانی رامانبووارد. پیرەژنێکی پیر، باران لەباریێ، من لە سەر ئەو هەموو داماوی خۆمانە بەزەییم بەو پیرەژنە فەقیرەدا ئەهات، ناشتایە وەکو حەیوان چووین بۆ گیاخواردن تا تێرمان خوارد. کاکەم خوا عەفوویکات، وتی: رەسوڵ نەخۆشم. پێشمان کەوت، هاتینە سەر.

بەم جورە ئەم بیرەوەرییە تۆمار دەکا و شتی زۆر باسدەکا، جا دێتە سەر باسی کۆمەلایەتی و ئابووری و شەڕی نێوان عەشایر و دەوڵەتەکان و زۆر شتیتر کە بە درێژی باسیاندەکا. ئینشەڵلا ئەم کتێبە بە تەواوی لە چاپدەدرێت.

## ئاگاداری و بانگەواز:

١- بەشی دووەمی ئەم بەرهەمە کە زیاتر لە ١٠٠ لاپەڕەیە، بە یارمەتی خوا دەردەچێ و داوا لەو بەڕێزانە دەکەم کە هەر شتێک لە مامۆستا قانع دەزانن بینێرن بۆ نووسەر، تا بەناوی خۆیانەوە بڵاو بکرێتەوە. ئەگەر کرا وێنەیەکی خۆشیان لەگەڵ بابەتەکەدا بنێرن، یا پەیوەندی بە نووسەرەوە بکەن تا بچێتە خزمەتیان و تۆماری بکا.

٢- سپاس بۆ ئەو کەسانەی کە هاوکاریمان دەکەن بە ناردنی رەخنە و تێبینی و پێشنیارەکانی خۆیان و ئامادەین بۆ وەڵام دانەوە.

٣- هەر ناوێک و... و باسێکی ناتەواو یا ئەو نهێنیانەی بە هۆکارێکی تایبەتەوە بڵاو نەکراونەتەوە، هەر جۆرە زانیارییەک سەبارەت بە مامۆستا قانع پێویست بێ، بۆ ئەوانەی کە خەریکی کۆڵینەوە و لێکۆڵینەوەی ژیانی گەورەپیاوانی کوردن، ئامادەی رووتکردنەوەی بابەتەکانین تا جێگایەک کە پێویست بێ.

٤- بەرهەمە بڵاونەکراوەکانی مامۆستا قانع و جۆلیەلی ژیانی، خەریکە ئامادە دەکرێت بۆ فیلمێکی درێژ لە ژێر ناوی «مێژووی ژیانی قانع»دا، کە پاش تەواو بوون و پەسەند کردنی لە لایەن بنەماڵەی بەڕێزیەوە، داوا دەکەین لەو بەڕێزانە کە توانایی دروستکردنی فیلمێکی درێژیان هەیە، پەیوەندیمان لەگەڵ بکەن.

٥- «هەورامانناسی» لە هەشت بەرگدا بە دەستەوەیە، کە شاعیر و مێژوونووس و نووسەر و ئەدیبەکانی هەورامانیش دەگرێتە خۆ، لەوانە دیوانی شیعر و نووسراوەکانی [«ئەلازی عەبدوڵڵای شەیدا»، «دیوانی شیعری موحرق»، «مەلا سالحی ئەسپەرێزی»، «بەرهەمە بڵاونەکراوەکانی مەلا خزری رواری»، «دیوانی شیعری فەریقی مەلا رەسووڵ»]ە. داوا دەکەین لەو ئازیزانەی کە بەرهەمی هەرکام لەو بەڕێزانەیان لایە، یان لە کۆنینەی هەورامان دەزانن، بۆ ئەوەی کە ئەم بەرهەمانە نەفەوتێن و بخرێنە ناو کتێبخانەی کوردییەوە، بۆمانی بنێرن تا بە ناوی خۆیانەوە بڵاو بکرێتەوە.

### سەرچاوە:

١ـ فەرهەنگستانی سینە بە سینە.
٢ـ بەیازە دەستنووسەکانی مەلا عەبدوڵڵای خالوو ئەسما و چەند بەیازیتر.
٣ـ فەرهەنگە بە پیت و بەرەکەتەکەی ئەحمەدا.
٤ـ مێژووی والدی.
٥ـ یادداشت و دەستنووسە جۆراوجۆرەکان.
٦ـ دیوانی قانع.
٧ـ سروەی بەربەیان.

# ZAYELLAY ZEREBAR

## Section One

That contains poetries, contentions, nice stories, a section of his life and his finality.

Compilation, investigation, estimation and preparation by:

Mr. Ahmad Naziry

Summer 2703 - 1382-2003 (A.D)

ISBN: 964-06-2625-2